# دەرگای چوونە ژوورەوە

**بەخێربێن**

**یوجەد لەدەینا جەناح خاص لیلعەوائیل**

**ئەلحەسوود و لا یەسوود**

## تەوالێتی پیاوان تەوالێتی ژنان

فەرموو مامۆستا. سەلاموعەلەیکوم.. بیست و شەش دینار.. چەند نەفەر؟ عەلەیکەسەلا.. دوو برنج و فاسۆلیا.. گەس و هەمبەرگەر..، نەماوە. سەروپێ. نەفەری تەواو کفتە و کوببە. قۆزی. دوو نەفەر کەباب. سادەیەك، شلەکەی باینجان بێ. پەراسوو، نەماوە. ماستا و مەمنووعە. چی دەخۆن برام؟. سەلکێ پیاز بۆ مێزەکەی پێشەوە.. کەوچکێ بۆ ئەولا، مەرەگەیەکی کودی بینە برام. دەی خێرا خوشکم.. تکایە پێی بڵێ بە هێواشی، بۆ سەرما دەنەڕێنێ؟ برام ئەو ژنەی من کەرە، کوردییەکەشی خراپە و زۆریش لە تۆ دەترسێ.. ناوی خواردنەکانی بۆدووبارەکەوە.. بەهێواشی. مامۆستا برنج و شلە، تکەی گۆشت، تکەی مریشك، پەراسوو، قۆزی، قۆزی شام، کەباب. نیو نەفەر... شام.. نیونەفەر نییە. تکەی گۆشت، تکەی مریشك. تککەی.. ئاو. قۆزی شام. بریانیی گۆشت. قۆزیی شام چییە؟؟ بابە، کەباب. کەباب، بابە.. با..ب،،ـــە کە..با...باب. مەگری کوڕم، ئێستا ئەچین کەبا...بابە کەبا....با...ب ب..کە..با.. ئیی ییییی.. کەباب بابە.. کەباب خوادم.. بەقوربانت بم مەگری، هەر ئێستا کەباب بۆ کوڕە هەولێرییەکەی خۆم دەکرم.. کاکەگیان تکایە یەك کەباب فریای ئەم سەگبابە خەن، بەچاوان مامۆستا.. بابە کەباب.. چیتان بوو.. کچ، ها..ها.. کەرە گیان مەبەستی ئەوەیە چیتان خوارد؟.. بابە، کەباب.. کەبابە خوالد، زەلیاب، خۆشە بەتامە.. کەباب، بابە..

# پێڕستی بابەتەکان

# فەنتازیای خواردن

یەکێ لەو بیرۆکانەی ساڵانێکە لە خەیاڵمدا تاووتوێی دەکەم نوسینی کتێبێکە لەبارەی خواردنەوە. لە کتێبی (*دیاردەگەرایی تاراوگە* 1995)دا، بۆ یەکەمجار لەوبارەیەوە وتارێکم نووسی و تیایدا ئەو پرسیارەم خستەڕوو کە ئایا ئێمە خواردن بۆ تێربوون دەخۆین، یان بۆ چێژ وەرگرتن؟ بەمانایەکی دیکە: ئایا خواردن کەلتوورێکە و پێویستە کاری بۆ بکەین، یان خووێکە و لەکاتی برسێتیدا دەبێ تێری بکەین؟ ئەم پرسیارە لەدوای ڕووخانی بەعسییەکانەوە، لەلای من زیندوو بۆوەو لە گفتوگۆیەکدا کە لە کتێبی (*مرۆڤ وەك بەخشندە*)دا بڵاوبۆتەوە، گوتومە: لەدوای بەعسییەکان، نەبوونی کەلتوورێك بۆ خواردن لەم وڵاتەدا گەورەترین دووژمنی ئێمەیە. لەڕاستیدا کەلتووری خواردن لەم کۆمەڵگایەدا لە هەموو لایەنێکەوە لە قەیراندایە و هەڕەشەیەکی مەترسیداریشە بۆسەر چەشە و سەلیقەی ئێمە و نەوەکانی دوارۆژ.. بۆیە دەکرێ ئەو پرسیارە بەجۆرێکی تریش بکەین و بڵێین: ئایا ئێمە بۆ خواردن دەژین، یاخود خواردنەکان بەشێکن لە ژیانی ئێمە؟

دەمەوێ هەر لەسەرەتاوە شتێك هەیە لە کەسی نەشارمەوە: بۆ ئەوانەی بڕوایان وایە کە ئێمە بۆ خواردن دەژین و لەمەشدا بەڵگەی خۆیانیان هەیە، خواردن لە چەقی ژیاندایە. کۆی بەڵگە مێژوویی و مرۆڤناسیی و هەڵکۆڵراوی شوێنەوارناسەکان ئەوە دەسەلمێنن، مرۆڤ بەرلەوەی بوونەوەرێکی (عاقڵ) و (کۆمەڵایەتی) ئەرستۆیی و (بیرکەرەوە)ی دیکارتیانە و (ئیشکەر)ی مارکسیانە بێت، بوونەوەرێکی (بخۆر) و

(هەرسکەر) بووە و ئەندامی هەرسکردن لەپێش دەماخ و عەقڵەوە، دەستبەکاربووە. مرۆڤ بەرلەوەی قسانبکات، بەر لەوەی بیر بکاتەوە و کار بکات، خواردویّتی و خۆی پیسکردووە! تۆ گوێمەدەرە ئەوەی کە مێژووی ئاودەست و تەوالێت لە هونەری بیناسازیی جیهاندا زۆر دوور نییە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە مرۆڤ بوونەوەرێکی گووکەر نەبووە و ئەوەش ناسەلمێنێ کە مەتبەخ و ناندێن و خواردنگە زۆر پێشتر بیریان لێنەکراوەتەوە. تەنانەت ئەگەر وەك (فرانسوا شوای) ئاماژەی پێدەکات، شوێنی پیساییکردن لە تەلارسازیدا، پەیوەستەگی ڕاستەوخۆی هەبێ بە بیرۆکەی نیشتەجێبوون و حەوانەوەی مرۆڤەوە لە شوێنێکی تایبەت، ئەوە بیرۆکەی ناندێن و خواردنگە پەیوەستە بە جێگۆڕکێ و هەوارگۆڕینی بەردەوامی مرۆڤەوە. بێگومان هۆی هەرەسەرەکیش بۆ جێگۆڕکێ و کۆچی مرۆڤەکان گەڕان بووە بەدوای خواردندا و شەڕکردن بووە لە پێناوی خواردندا. بەمجۆرەش خواردن یەکێکە لە هاندەرە سەرەکییەکانی دروستبوونی شەڕ و شەڕیش وەکو بیرمەندی بە ڕەگەز ئیتالی (پۆڵ ڤیریلیۆ) گوتویەتی: هۆکاری هەرە سەرەکی دروستبوونی ئەو شارستانیەتەیە کە ئەمڕۆ تەکنەلۆژیا جڵەوی دەکات و بڕگەیەکی سەرەکیی پێکهێنانیەتی. بەم پێیەش بێت ئێمە دەتوانین کتێبێ بنووسین بەم ناونیشانە: (مێژووی مرۆڤایەتی: لە مەتبەخەوە بۆ تەکنەلۆژیا). تەنانەت ئەسکەندەری مەکدۆنی، کاتێ پلانی داگیرکردنی جیهانی ئەوسای کەوتە سەرەوە، وێڕای ئەو فەیلەسووف و تەلارساز و ئەستێرەناسانەی لەگەڵ ئۆردووی لەشکرەکەیدا دەیبردن، دەستەی چێشتلێنەرەکانیشی بیرنەچوو. (بەپێی ڕیوایەتێکیش ئەم یاپراخ و دۆڵمەیەی ئێمە ئێستا بە خواردنێکی میللی خۆمانی دەزانین، هیچ نییە جگە لەو خواردنەی کە بۆ لەشکرەکەی ئەسکەندەر لەگەڵای درەختەکاندا دەپێچرایەوە و لەسەر دەستەبەرەی تایبەت دەیانگوێزرایەوە بۆ سەربازگە و ئۆردووی جەنگ!). هەموو نەتەوە و میللەتانی جیهان ڕۆژگارێ بە خەنجەر، ڕۆژگارێکی دیکە بە تیروکەوان و لەم ڕۆژگارەشدا بەهۆی میکانیزمەکانی بازاڕ و پارەوە، لەسەر خواردن شەڕیانکردووە. خەبات و تێکۆشانی هیچ میللەتێکی ئەم سەر

زەوییە نییە کە خواردن هۆکارێکی سەرەکیی و ئاشکرای، یان شاراوەی نەبوویێت.
کەواتە بۆ ئەوانەی کە پێیانوایە خواردن لە سەنتەری ژیاندایە، تا خۆبەکوشتدانیش لەسەر خواردن ڕۆیشتوون و لە پێناوی ناندا مافی ژیانیان لەخۆیان سەندۆتەوە.

بۆ ئەوانەش کە پێیانوایە خواردن تەنیا بەشێکە لە ژیانی ئێمەی مرۆڤ، نەك هەمووی، دیسانەوە قوربانییەکی زۆریان داوە و ڕۆژگارێکی زۆر ورگی بەتاڵی خۆیان هەڵگلۆفیوە تاکو ئەو لێکدانەوە زەینییەی خۆیان جێگەی بەتاڵایی سکیان بۆ پڕ بکاتەوە. بەلای ئەوانەوە، کە دیسانەوە بەڵگەی خۆیانیان هەیە، ژیانی مرۆیی زۆر لەوە بەرفراوانتر و پڕبەها ترە، کە مرۆڤ هەموو خەونی مرۆڤانەی خۆی لەپێناوی بەدەستهێنانی خواردندا قەتیس بکات. بەڵام ئەوەش ڕەتناکەنەوە کە بەهەرحاڵ: مرۆڤ دەبێ شتێ هەر بخوات!

بیرۆکەی سەرەکیی من لەم زنجیرەیەدا لەسەر خواردن، (کە نازانم تاکەی بەردەوام دەبێ و ڕۆژنامەکە بوارم دەداتێ و کەی لەگەڵمدا تێکی دەدەن!)، زۆر ئاسان و سادەیە: مرۆڤ ناتوانێ بەبێ خواردن بژی (کەواتە بەرەی یەکەم ڕاستەدەکەن: ژیانێکی بێخواردن نییە)، بەڵام بۆ ئەوەی خواردن هەموو ژیانمان نەبێت و تەنیا بەشێ بێت لە ژیان (چونکە وەك بەرەی دووەم دەڵێن: لە ژیاندا زۆر شتی دیکەش هەن کە بەهادارن)، پێویستە (فەنتازیا)مان هەبێ..

من تەنیا هەوڵدەدەم بەهۆی بایەخدان بە فەنتازیا لە خواردندا، ئەوە ڕوونبکەمەوە، کە بۆچی ئەگەر لە خواردندا فەنتازیامان نەبوو، دوای تێربوون خواردنەکەمان بیر دەچێتەوە و ئیتر بەهای نامێنێ و بەمەش بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن: خواردن لە چەقی ژیاندایە، پووچەڵ دەبێتەوە. چونکە مرۆڤ ئەو شتەی بە چەقی ژیانی خۆی دەزانێ و ئەو هەموو شەڕ و کۆژانەی لەپێناودا دیتووە، ناخاتە ناو ئاودەستەکانەوە! لەبیرمان نەچێت: کورتترین سەفەری ئەوانەی خواردن یەکسان دەکەن بە ژیان، لەپاش تێربوون، ڕاکردنە بەرە و تەوالێت.. مێژوو هەندێ ڕووداوی دڵتەزێنی لە کەلتووری گەلاندا بۆ تۆمار کردووین کە دەیسەلمێنن: مرۆڤ لە پێناوی خواردندا خۆی

به کوشتداوه و لـه ڕاکردنیدا لـەسەر ناندێنەوه بەره و قولـەیتێن و تەوالـێت، چ بەهۆی گرێکوێرەی بەندوخێنەکەیەوه و چ لـه ئەنجامی عاسیی بوونی زنجیری پانتۆڵـەکەیەوه، شەهید بووه!.

بەودیوی تردا، ئەگەر خواردن هەموو ژیانیش نەبێت وەك بەرەی دووەم دەڵێن، چونکه لـه ژیاندا شتی دیکەش هەن که بەهایان هەیه، ئەوه بەپێی قسەی ئەوان بێت پێویسته *بتوانین* خواردن لـه ژیان بکەینه دەرەوه و به شتێکی پڕبەهاتر شوێنەکەی پڕبکەینەوه، که بێگومان ئەمەش مەحاڵـه. لـه هیچ شوێنێکدا هیچ شتێ جێگەی خواردن بۆ مرۆڤ ناگرێتەوه. یاساکه ئەوه نییه: کاتێ مرۆڤ پێویستیی بەخواردن بوو، شتێکی دیکەی بدەرێ، بەڵکو وەك نیتشەی فەیلـەسووف گوتویەتی، تەنیا خواردن بده بەو کەسەی که برسیی ڕاستەقینەیه. خاڵی سەرەکیی ئەم زنجیرەیه ئەوەیه که بۆمان ڕوونبکاتەوه، چ ژیان لـەپێناوی خواردندا و چ خواردن لـەپێناوی ژیاندا، بەبێ فەنتازیا، نه خواردنەکەی چێژبەخشه و نه ژیانەکەیشی بەهای هەیه.

کەواته دەمەوێ لـه ڕێگەی ئەم زنجیرەیەوه هەم بیروڕات لـەسەر خواردن و هەم تێڕوانینت بۆ ژیان بگۆڕم و لـەمەشدا پەنا بۆ هەر خەیاڵ و فەنتازیا و دەربڕینێ دەبەم که تۆ دەخاته بەردەم پرسیارکردن لـه ژیان و لـه خواردنەکانت. وەهات لـێدەکەم شەو نەتوانیت بخەویت و بەیانی که هەستایت ئەو خەونانه بگێڕیتەوه که بۆنی خواردنیان لـێدێت و که برسیشت بوو ئەو خواردنانه دروستبکەیت که لـه فەنتازیای خۆتدا وێنات کردوون. وانەزانیت ناتوانم کارت تێبکەم، چونکه باش دەتناسم و دەزانم که تۆ ئەندامی یەکێکی لـەو کۆمەڵگایانەی که هەتا ئێستا خواردنت لـه پێناوی تێربووندا و به حازری خواردووه و من دەمەوێ خواردن بۆ چێژوەرگرتن، تامکەیت، بۆنی بکەیت و وەك سرووتێ بیخۆیت، که بۆخۆت دروستتکردبێ و خواردن هەر تەنیا مادەیەك نەبێ که دەیکەیته سکتەوه تا تێرت بکات، بەڵکو شێوازێك بێت لـه ژیانی تایبەتیتدا که بەها و گرنگیی دروستکردنی ژەمێك کەمتر نەبێ لـه نووسین و خوێندنەوەی شاکارێك! ئەرێ بەڕاست باوەڕت بەوه نییه که مرۆڤ بەهەمان ئاستی فەنتازیای

جوانیناسانە کە داهێنەرە گەورەکان لەبواری شێوەکاری، ڕۆمان، شیعر و سینەمادا هەوڵدەدەن لە ڕێگەیەوە جیهانێکی نوێی بۆ بخوڵقێنن، شایانی ئەوەیش بێت لەڕێگەی دروستکردنی خواردنێکی فەنتازیانەوە، بارودۆخێکی چێژبەخشانەی کۆمەڵایەتی بۆ بسازێنین؟

من لەم وتارانەدا، کە هەوڵدەدەم بۆنی خواردنەکان بگاتە لوتی هەرکەسێ کە دەیانخوێنێتەوە و ئاو بزێتە دەمی و فەنتازیای بجوولێ و یەکسەر هەستێ بە دروستکردنیان و بەو پەڕی چێژەوە بیانجوێ و قووتیان بدا، بەمجۆرانەی خوارەوە لە بەکارهێنانی وشەی *فەنتازیا* دەگەم و بەکاریدەهێنم:

**یەکەم**: بیرکردنەوەیەکی ئازاد لە هەموو شتێ کە پەیوەستە بە خواردنەوە و بۆخۆمان دامانهێناوە، نەك دووبارە بیرکردنەوە لەو خواردنانەی پێشتر خواردوومانن و دروستمان کردوون. ئەمەش بەمانای ئەوەیە کە فەنتازیای خواردن، فەنتازییای خواردنگەلێك و سرووت و بۆنە و موناسەباتێکە کە دەمانەوێت لە ژیانماندا ڕوو بدەن، نەك پێشتر ئەزموونمان کردبن.. من دەزانم دایکمان و پوور و هەندێجار خۆشەویستەکەمان و دایکی هاوڕێ ئازیزەکانمان ڕەنجێکی زۆریان کێشاوەو دەکێشن تاکو خواردنی خۆشمان بۆ لێبنێن، بەڵام ئامانجی ئەو خواردنانە بریتیبووە لەوەی کە تێرمان بکەن و چێژمان بدەنێ، (بەبێئەوەی زۆرجاریش بەخۆمان بزانین)، نەك فەنتازیامان گەشەپێدەن. هەربۆیەشە زۆربەی هەرەزۆرمان و دوای خواردنی ئەو هەموو ژەمەخواردنانەی دایك و پوور و خۆشەویستەکانمان بۆیان لێناوین، فێری دروستکردنی هێلکەوڕۆنێکیش نەبووین. هەر ئەم کەمتەرخەمییە بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەبەردەم ڕەنجی کابانی ماڵدا، شەرمەزار و ڕیسوابێت و خۆی فێری خواردن دروستکردن بکات.. لێرەشەوە دەمەوێ بڵێم: مەبەستم نییە شارەزایی کابانیی کە تا ئێستا لە کۆمەڵگا نێرسالار و باوکسالارەکاندا وەك (پیشەی) مێیینە تەماشای دەکرێ، لە خانمەکان بستێنینەوە و بێوەفابین لەئاست زەحمەتەکانیاندا. وەلێ ئەگەر

کۆمەڵگایەك بیەوێ باوکسالاری و نێرسەروەری وەلاخات، پێویستە مەتبەخ و نادێن، کەوەك شوێنێکی سرووشتی مێیینە تەماشایان دەکرێ، لە خانمەکان بستێنێتەوە..

**دووەم**: وشەی فەنتازیا بەمانای (*خەیاڵ*) بەکارناهێنم، لە نەرێتی هزری مرۆڤایەتیدا، بەتایبەتی لە ئەرستۆوە بۆ فەیلەسووفە مسوڵمانەکانی وەك (فارابی و ئیبن سینا) وشەی (بەنتاسیا)یان بەمانای خەیاڵکردنەوە(تخیل) بەکارهێناوە و لە هزری ئەورووپیشدا ئەم وشەیە پەیوەستە بە توانایی مرۆڤەوە بۆ داهێنان، کە لە (خەیاڵ)ی سادە جیاوازە. خەیاڵ وەکئەوەی (کۆلریج) پێناسەی کردووە، تەنیا چالاکییەکی زەینیی و دەماخیی ئێمەیە کە شت و وێنە هەستپێکراوەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆمانمان بەشێوەیەکی سادە بەبیردەهێنێتەوە. لەکاتێکدا فەنتازیا چالاکییەکی زەیینیە کە تیایدا شت و وێنە و ئەزموونەکانمان بەشێوەیەکی کارلەسەرکراو دووبارە بەرهەمدەهێنرێنەوە و داهێنانیان تێدا دەکرێ. خەیاڵ هێزێکی جەستەیی و بایۆلۆژییە، بەڵام فەنتازیا وزەیەکی داهێنەرانە و خوڵقێنەرە. پێویستە لەوکاتەوە کە خۆراکە خاوەکان لە فرۆشیارەکان دەکڕین، لەبیری داهێنانێکدا بین بەو خۆراکانە تاکو بیانکەین بەخواردن و بە موناسەبەت و سرووتی کەلتووری و کۆمەڵایەتی و شەخسی. یۆنانەکۆنەکان جیاوازییان دەکرد لەنێوان سێ زاراوەدا: (*پۆیسیس*)، بەواتای داهێنان و خەڵقکردن، (*تەخنە*) بەمانای بەکارهێنانی شارەزایی و لێزانی لە دروستکردنی بەرهەمێکدا و (*میمیسیس*) بەواتای گێڕانەوە و لاساییکردنەوەی ئەوەی کە ڕوویداوە. کەلتووری خواردن لە وڵاتی ئێمەدا شتێکە لەنێوان وەرگرتن و لاساییکردنەوە و مشەخۆریدا، بەبێ هیچ سەلیقەیەکی پیشەیی، لەکاتێکدا ئێمە پێویستیمان بەوەیە ڕەهەندی پۆییسیس، واتە داهێنان و ئەفراندن و شیعرییەت لە خواردنەکانماندا بەرجەستە بکەین و خواردن دروستکردن وەك هەر بەرهەمێکی داهێنەرانە تەماشا بکەین.

**سێیەم**: مەبەستێکی دیکەم لە بەکارهێنانی فەنتازیا لە پەیوەندییەوە بە خواردن، ئەوەیە کە ئەو فەنتازیایە بتوانێ یاریدەمان بدات بۆ پەیوەستکردنەوەی خواردن بە هەر شتێکەوە کە لە ژیاندا چێژمان پێدەبەخشێ. داهێنان لە بواری خواردندا و ئازادبوون

لە شێوازی خواردنە خووپێوەگیراوەکان، چێژێکی زۆری تێدایە بۆ مرۆڤ. مرۆڤ لەو ئازادیدانەیدایە بەخۆی و لەو ئازادکردنەی خۆیەتی لە خووەکان، کە خودیخۆی دروستدەکات. جیاوازە برنج و فاسۆلیایەك بە حازریی بێتە بەردەمت و بەشێوەیەکی میکانیکیانە لە پێنج خولەکدا قووتی بدەیت، لەگەڵ ئەوەی بۆخۆت لە برنج و فاسۆلیا خواردنێ دروستبکەیت و بیخۆیت. (ئەوانەی کە بڕوایان وایە فاسۆلیا و برنج، هەر *برنجوفاسۆلیای* لێدروستدەکرێ، فەنتازیای خواردنیان لاوازە، هەرچەندە سەلکێ پیازیشی لەگەڵدا بخۆن!). فەنتازیای خواردن واتە ئازادیدان بەخۆمان تا بتوانین چێژ وەربگرین و مەرجیش نییە ئەو چێژە تەنیا چێژێکی جەستەیی بێت، هێندەی ئەوەی کە چێژێکی ڕۆحی و مەعنەوییە. بەداخەوە ئێمە لەکاتی نانخواردندا ڕۆحی خۆمان لەبیردەچێتەوە و دەبینە کۆیلەی ورگمان. ئەفلاتوون لەو بڕوایەدایە ئەوانەی تەسلیمی ورگی خۆیان دەبن، وەك ئەو گالیسکەیە وان کە ئەسپێکی خراپ ڕایدەکێشێ و بەهۆی قەمچیلێدانیشەوە جڵەو ناکرێت و بۆی هەیە لە دواجاردا گارییەکە هەڵدێرێ.. بۆیە من هەر تەنیا مەبەستم نییە چەند ڕێنماییەك بۆ دروستکردنی جۆرە تایبەتەکانی خواردن بخەمە پێشچاوت، تۆ دەتوانیت بۆخۆت ئەو زانیاریانە لە کتێبەکانی خواردندا بدۆزیتەوە. بەڵکو مەبەستمە دوور بکەویتەوە لەخواردنی ئەو خۆراکانەی هەستەکانت نابزوێنن و بەخواردنیان خەو دەتباتەوە. کێ هەیە لە وڵاتی ئێمەدا دوای خواردنی قبوولێیەکی سوور، چینێ خەوی بۆ نەکات!، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە خەو و خواردن چی پێکەوەیان دەبەستێتەوە؟

**چوارەمین** هۆی بەکارهێنانی وشەی فەنتازیا لەم زنجیرەیەدا ئەوەیە کە بتوانین بە کەمترین خەرجی، کەمترین بەکارهێنانی ڕۆن و چەوری، کەمترین کات، کەمترین بەرماوە و فڕێدان، لەو خۆراکانەی لەهەر وەرزێکدا دەستدەکەون، هەندێ لە ژەمە خواردنەکانی خۆمان، دروستبکەین. بەتایبەتی نەوەی نوێ، کە نەپارەی هەیە بچێتە چێشتخانەکان، نە داشکاندنی بۆ دەکرێ و نە زۆرینەی خواردنەکانیشی بەدڵە.. وڵاتی ئێمە لەڕووی کەلتووری خواردنەوە، نەك هەژار نییە، بەڵکو لەسایەی برەوی

خواردنی بازرگانی و فراوانبوونی تۆڕی چێشتخانەکان لەڕووی چەندایەتییەوە، (کە بەهیچ شێوەیەك هاوشان نییە بە گۆڕانی نەوعی لە خواردنەکان، خزمەتگوزاری، ئەتەکییەتی ڕازاندنەوەی سفرە و لایەنی تەندروستی)، خەریکە حەزی دروستکردنی خواردن و مەهارەت و چێژی خواردندروستکردنمان تێدا دەکوژرێ. بەتایبەتی نەوەی نوێ خەریکە دەستکەوتێکی گەورەی خۆی لەدەستدەدات، خەریکە تواناییەکی فێربوونی خۆی بیردەچێتەوە، کە بەبڕوای من هیچی کەمتر نییە لە فێربوونی فەلسەفە، بەتایبەتی کاتێ لە نەریتی فەلسەفیدا یەك دێڕیش نادۆزینەوە لە دژی خواردندروستکردن و بگرە ئەبیکۆری و ڕەواقی و کیونیکەکانیش ستایشێکی زۆری ژیانێکی پڕچێژیان کردووە کە شایانی مرۆڤ بێت. ئەو نەوەیەی نەتوانێ خواردن دروستبکات، لە ماڵی خۆیدا وەکئەو مرۆڤە سەرەتاییەی لێدێت کە ناچاربوو لە سارای سرووشتدا، دابێتەوە بۆ زەوی و لەسەر دەستووری باووباپیرە مەیموونەکانی، بکەوێتەوە گیاڕنینەوە.

لەزنجیرەی داهاتوودا باسی خواردنێکت بۆ دەکەم کە هێشتا بۆخۆم نازانم چییە! ڕەنگە ئەوەیان بێت کە من کاتێ بۆ یەکەمجار خەریکی دروستکردنی بووم، بەهۆی هەڵەیەکی تەکنکیی و خووێکەوە کە ئێمە هەمانە، هەموو ناودەم و زمانی خۆمم سووتاند! ئەوەیان گرنگ نییە و لە زنجیرەی داهاتوودا بۆت باس دەکەم.. گرنگ ئەوەیە ئێمە لە مێژووی کەلتووری خواردنەوە فێربووین، کە چ بۆ بەدەستهێنانی خواردن، چ بۆ دروستکردنی و چ لەخواردنیشیدا، قوربانیدانی دەوێ! هێندە هەیە تۆ پێویستە لە ئێستاوە مشووری تاوەیەکی سەرقاپدار و چەقۆیەکی دەمزبر بخۆیت و کەمێ ڕۆن و چەند دەنکێ تەماتەی گەورەی زۆر نەگەیو پەیداکەیت، نەختێ سەوزە هەڵبژێری کە خۆت حەزی لێدەکەیت بەمەرجێ پونگە، یان نەعنای تێدابێ. ئەمجا سەلکێ پیازی گەورە، مشتێ وردەنان و چەند پارچەپەنیرێکی چوارگۆشەی زەردت لەبەر دەستدا بێ، لەگەڵ دوو قۆخی پاککراو! تازە ناچارم ناوی خواردنەکەشت پێبڵێم: *خواردنی عاشقان*. خواردنی ئەوانەی دەیانەوێ بەزمانی سووری تەماتە و بەبۆنی نەعنا و

بەپیرۆزیی نان و بە توانەوەی پەنیر و بە بێگەردیی تەڕیی شەرمنانەی قۆخ، سوێندبخۆن بۆ ئەویتر و پێی بڵێن: خۆشمدەوێی. چاوەڕێ بەو تا ئەوکاتەش پێشنیار دەکەم کەمێ گوێ لە مۆسیقا بگریت، سەرلەنوێ چەند لاپەڕەیەك لە (دواهەمین هەناری دنیا) بخوێنیتەوە و بیرکەرەوە لەوەی بۆچی (نالی)ی مەزن گوتویەتی:

***ئاوی کەوسەر نۆشی سۆفی بێ کە من***

***ئاوی ئینسان، یەعنی ماچی دەم دەخۆم.***

# خواردنی عاشقانه

## نالی و خواردنی عاشقانە:

لە دوایین دێڕی زنجیرەی ڕابردوودا، داوام لێکردبوویت بیر لەم دێڕە شیعرەی نالی بکەیتەوە. ئێستاش تاکو بەوردی لەمانای ئەم بەیتە تێنەگەین، ناتوانین باسی خواردنی عاشقان بکەین و بچینە ناو مەتبەخەکەمانەوە. سەرەتا پێویستە لە زمان شاعیرەوە فێری چێژی ژیان بین، ئەوجا فێری چێژی خواردن:

**ئاوی کەوسەر نۆشی سۆفی بێ کە من**
**ئاوی ئینسان، یەعنی ماچی دەم دەخۆم.**

لە لای یەکەمین فەیلەسووف کە (تالیس)ی مالّتایی بووە، ئاو سەرچاوەی بوونە. ئەوە بۆخۆی یەکێکە لە جوانییەکان و حیکمەتەکانی فەلسەفە، کە لەلای یەکەمین فەیلەسووف، یەکەم بابەت لە جیهاندا قسەی لەسەر کرابێ، ئاوە. ئاو دەبێتە یەکەمین بیرلێکراوەی فەلسەفە و لە تالیسەوە فەلسەفەیەکی ئاویی لەدایك دەبێ، ئەم باسەش هەڵدەگرم بۆ کاتێکی دیکە.. بەڵام نالی باسی ئاو بەشێوەیەکی گشتی ناکات، ئەو گوتویەتی ئاوی کەوسەر. ئاوی کەوسەر ئەو جۆرەیە لە ئاو کە نالی دەتوانێ دەستی لێبەردا و نەیخواتەوە، ئاوی کەوسەر بەمانایەك ئاوی پیرۆز و ئاوی بەهەشتە، بۆیە نالی لەسەرەتای بەیتەکەیەوە ڕایگەیاندووە کە ئەو ئاوە: نۆشی سۆفی بێ. بەمکارەشی

لەنێوان (خۆی) و (سۆفی) و لە نێوان (سۆفی) و (بوون) و لەنێوان (ئەمێستا) و (داهاتوو)دا مەودا و سنوورێ دروستدەکات. ئەو هەر لەسەرەتاوە ناڕاستەوخۆ گوتویەتی: من سۆفی نیم و ئاوێ کە سۆفی دەیخواتەوە هەمان ئاو نییە کە تینوێتی من دەشکێنێ.. ئاوی کەوسەر، واتە ئاوی پیرۆزی (ئەوێ)، ئەو ئاوەی نۆشی سۆفی بێت کە ئەویش ئەوکەسەیە بە وادەی ئەو دنیا، خۆی لەم دنیا وەك پانتاییەکی بوون، بەدوور دەگرێ و چاوەڕوانی گەیشتنە بە ئەوێ کە بەهەشت و جێی ژوان و لیقایە. سۆفی بەو دوورەپەرێزییەی لە جیهانی بوون، لە خودی خۆیشی دوور کەوتۆتەوە. سۆفی لە (من)ی خۆی ڕادەکا بۆ ئەوەی لە (ئەو)ی گەورەدا بتوێتەوە و خۆی نەفی بکات. سۆفی بە ئاوی ئەم دنیا تینوێتی ناشکێ و تینووی ئاوێکی ترە. بەڵام نالی خاوەن (من)ێکی ترە و لەبەرئەوەش لەبەرامبەر ئاوی کەوسەردا، تینووی (ئاوی ئینسانە). نالی و سۆفی هەردووکیان عاشقن، بەڵام یەکەمیان مەعشوقەکەی لە شوێنێکی ترە و ئەوەی نالیش لێرەیە، لەم جیهانەدا و لەم زەمەنەدا. بۆیە ئاوی کەوسەر نۆشی ئەو کەسە بێ کە نیگای لەشوێنێکی ترە جگە لەوشوێنەی کە شوێنی بوونە، بەڵام لە بووندا ئاوێکی دیکە هەیە کە ئاوی ئینسانە و نالی (دەیخوات)، نەك دەیخواتەوە!. نالی بۆخۆی ڕاڤەی دەستەواژە بەکارهێنراوەکەی خۆی کردووە: ئاوی ئینسان، واتە ماچی دەم. واتە تەڕاییەك کە لەئەنجامی ماچکردنی دەمەوە دەخورێ، واتە ئاوێ کە لە ماچکردنی هەنووکەوە، لەم دەمەدا و لێرە، نەك لەکاتێکی دیکە و لە شوێنێکی تردا، پەیدا دەبێ. ماچی دەم بۆیە لەلای نالی ئاوی ئینسانە، چونکە ئینسان لێرەیە و قابیلی ماچکردنە لەم دەمەدا و ئەو ماچەش ئاوی ژیانە. لێرەوە مانای ئاوی ئینسان لەڕێگەی ماچی دەمەوە، ئەو ئاوە لەمانای ئاوی شەهوەت جیادەکاتەوە کە لە ئەنجامی جووتبوون و ئۆرگازمەوە دەڕژێ و کەمخایەنە. بۆیە نالی مەبەستی نییە مانای ئاوی ئینسان لەو چوارچێوەیەدا قەتیس بکات و مانایەکی بەرینتری پێدەدا بەوەی کە بڵێ: مەبەستم ماچی دەمە و لێرەشەوە ئاوی ماچی دەم یەکسان دەکات بە ئاو وەك سەرچاوەی بوون. ئاو وەك سەرچاوەی بوون بەمانا تالیسییەکەی، واتە ئاو وەك ئەو

ڕەگەزەی کە هەموو بوونی جیهان و بوونی فیزیکیانە و مەتەریاڵیانە لەوێوە سەرچاوەی گرتووە. ئاو وەك سەرچاوەی بوون، بەمانای ئاوی پیرۆز و ئاوی کەوسەر نا، بەڵکو بەمانای ئەو ئاوەی کە چواردەورەمانی داپۆشیوە و لەناو دەریاکاندا شەپۆلدەدا و بە ڕووبارەکاندا هاژە دەکا و لە جۆگەلەکاندا خووڕەی دێ. ئاوی ئینسان واتە ئەو ئاوەی لەم دەمەدا و لێرە و لەم ژیانەدا لە ئەنجامی ماچکردنی دەمی ئینسانەوە، وەك سەرچاوەیەك بۆ ماچکردن و گەیشتن بە دەمی ژیان، پەیدا دەبێ. نالی بەوەی ئاوی ئینسان (دەخوات) و (نایخواتەوە)، بەوەی ئاوی ئینسان لەڕێگەی ماچکردنی دەمی مرۆڤێکی زیندووەوە دەخوات کە دەستنیشانکردنی شوێنێکە، دەستنیشانی کاتێکیشی کردووە کە ئەم دەمە و ئەمێستایە، نەك دەمی بوونەوەرێکی دیکە، بۆ نمونە نەك دەمی فریشتەکان و نەك لە دەمێکی تردا، بۆنمونە لە بەهەشتدا. بەم پێیەش نالی، ماچی دەمی ئینسان وەك خواردنێکی تەڕ دەخاتە ڕوو و دەیخوات و لەو ڕێگەیەشەوە بە پێچەوانەی سۆفییەوە، باوەش بە ژیان و بوون و خودی خۆیدا وەك بووەنەوەرێکی چێژوەرگر، دەکات.

بەڵام بۆچی ئەم هەموو گرنگیدانە بە (دەم) کە سەرچاوەی ماچ و ماچیش ئەو خۆراکەبێ کە شایانی ئەوەیە ئاوی کەوسەری بۆ بکەینە قوربانیی؟ وەك ئەدگار مۆرن دەڵێ: (دەم هەر تەنیا ئامرازی خواردن و وەرگرتن و دانەوە نیە، بەڵکو ڕاڕەوی هەناسەیشە) و بەم قسەیەش بێت، (دەم) وەکو گوزەرگای هەناسە، دەمانباتەوە سەر مەنزڵی ڕۆح وەکئەوەی کە ڕۆح نیشانەی زیندوویی نەفسە.. ئێمە بەچیدا بزانین بوونەوەرێ ڕۆح لەبەرە و ڕۆحی تیاماوە؟ بێگومان بە هەناسەیدا. کەواتە دەم لە ڕێگەی هەناسەدانەوە دەمانبەستێ بە یەکێ لە نیشانەکانی بوونەوە کە ڕۆحە. هەناسەدان زیندوێتیە، بەڵام زیندوێتی و ژیانێك نا بەهۆی خواردنەوە، بەڵکو بەهۆی ماچی دەمەوە کە پڕە لە ئاوی ئینسان. (ماچ، لەلایەکەوە نمونەی یەکبوونی جەستەیی و لەلایەکیتریشەوە، ڕەمزە بۆ باوەش بەیەکداکردنی دوو نەفس کە ئەمەش ئاویزانبوونی دوو ڕۆح دەگەیەنێ). هەر ئەدگار مۆرن لە شوێنێکی دیکەدا نوسیویە: (هەرشتێ لە

دەمەوە پەیدابێ، شتێکە تەنانەت لەپێش پەیدابوونی زمانەکانیشەوە، باس لە عەشق دەکات. ئاوایە کە دایکێ منداڵەکەی و سەگێ دەستێك دەلێسێتەوە. ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە لە جیهانی مرۆیەکاندا سەرهەڵدەدات و دەپشکوێ، لە شێوەی ماچدا).

لە نالییەوە مۆڵەتمان پێدراوە بڵێین: ماچ دەخورێ و لێرەشەوە (دەم) چ بەمانای دەمولێو و چ بەمانای زەمەن، خواردن و ماچکردن پێکەوە کۆدەکاتەوە، بە ڕادەیەك بڕوا بکەین هەموو ماچکردنێ خواردنێکە و هەموو خواردنێکیش ماچکردنێکە. لەنێوان ئەم دوانەشدا خاڵی لێکچوون زۆرن: بۆ بەدەستهێنانیان هەردووکیان زەحمەتن، عارەقڕشتن و ماندوویی و درۆودەلەسەی دنیایان دەوێ. کە بەدەستیش هاتن، هەردووکیان چێژبەخشن، هەردووکیان تەڕ و لیکرێژن، هەردووکیان وەڵامدەرەوە و تێرکەری تامەزرۆیی و خواست و پێویستین، هەردووکیشیان دەنگیان لێوەدێ، ئەویان مڵچە و ئەویان چرپە و وریتە و (لاچۆ مەکە) و (نابێ و لاکەوە هەتیوە) و (بڕۆ لای هەتیم) و (بێ تەربییەت) و (توخوا مەکە..)، هەموویان دەنگی ماچ و تەمەننای ماچ و تامەزرۆیی ماچن!.

جارێك مامۆستا بورهان قانع پێیگوتم: نانخواردن مڵچەمڵچەکەی خۆشە.. من زۆرجار لەوەدوا بەیادی ئەوەوە، چ لە ئەوروپا و چ لە وڵات، پارووم دروستدەکردن و بۆ مڵچەکەی دەمخواردن!. بەڵام خواردن و ماچ جیاوازییەکی هەرە بنەماییان لەنێواندایە کە ئەوەش وادەکات ئەویان بکاتە خواردن و ئەویان ماچکردن: مرۆڤ لە خواردن تێر دەبێ و لە ماچکردن، نەء ، خواردن بۆ ژەمێ خۆشە و ماچ بۆ هەموو کاتێ.. مرۆڤ لەسەر نان خۆی دەدا بەکوشت و شانازیی بەردەکەوێ، کەچی لەسەر ماچ خۆی دەداتە بەر تاکە نەعل و پڕشەقیش دەکرێ و ڕیسوایی بۆ دەمێنێتەوە. وەلێ با ڕاستگۆبین و بپرسین: کامیان خۆشترن؟ ئەو شەهیدبوونەی ئەوانیتر پێماندەبەخشن و یادمان دەکەنەوە، یان ئەو شەقانەی خۆمان یادیان دەکەینەوە و مچووڕکە بە لەشماندا دەهێنن؟. مرۆڤ لە چاو خواردندا زۆر درەنگ ماچی کەشفکرد و بایی ئەوەش کە ئەو چێژەی لەکیس چووە دەیەوێ باربووی بکاتەوە و ئەوەتا ئەمێستاش لێی تێر نابێ..

هەموومان دەزانین لە مێژوودا خواستی مرۆڤ بۆ خواردن زۆر لەپێشترەوە دەستیپێکردووە وەك لە مەیل و ئارەزووی بۆ ماچکردن و پێدەچێ لە پێش نالییشەوە مرۆڤایەتی بیری لە (ماچخواردن) نەکردبێتەوە.. لەگەڵ ئەوەشدا خواست و ئارەزووی خواردن تێر دەکرێ و مەیلی ماچکردن: هەرگیز. لانیکەم تا مرۆڤ لە ژیاندا مابێ، چونکە وەك لە شیعرەکەی نالیدا بینیمان، ماچ و ژیان لە پەیوەندییەکی نزیکدان پێکەوە: هەموو ماچکردن و خواردنی ماچێ، ژیانەوەیەکی نوێیە. ژیانیش پڕە لە بەخشین و چاوپۆشین و دەستهەڵگرتن لە سەر و ماڵ.. نالی ناحەقی نەبووە لە پێناوی ماچدا سەر و ماڵی ببەخشێ و بڵێ:

**ماچی دەمەکەی دامێ، کە دامێ سەر و ماڵم**

**بنواڕە چ سەییادە، چ جەللادە بە حاڵم!**

بەمجۆرەش وەك عاشقی ژیان، مرۆڤ ناچارە هەموو شتێ ببەخشێ و لە جیاتی زۆرخۆری، کەم بخوات و کە ماچیشی لیقەدەغە بکەن، غەم بخوات:

**گەر دەپرسی من لەبەرچی کەم دەخۆم،**

**من بەبرسی قەت مەزانە، غەم دەخۆم.**

ئەمەیە چارەنووسی عاشق، کە لەپێناوی خواردنی ژیاندا ناچار دەبێ خواردنی نان کەمبکاتەوە و ئیشتیهای دەمرێ. عاشقی ڕاستەقینە، تەنیا بە شەرابی دەمی یار، واتە بەئاوی مەستی و لەخۆدەرچوون و بێهۆشی، سەرخۆش دەبێ و کاتێ ئەوەی لێیسەنەوە، ناچارە لە سەرخۆشی بێداربێتەوە و سەری خۆیشی بە نەماو لە قەڵەم بدات و غەم بخوات:

**سەرخۆشی شەرابی دەمی تۆ بووم و، ئەمێستاش**

**قوربان، سەری تۆ خۆش، کە نەماوە سەری خۆشم!**

لەڕاستیدا نالی زۆر عاشقانە بیری لە خواردن کردۆتەوە و خواردنیش بەدەم دەخورێ و دەم دەبێتە ئەو ئەندامەی لەش کە ڕاستەوخۆ دەمانبەستێ بە ژیانەوە، جا ئەگەر بە موبالەغە لەقەڵەم نەدرێ، دەکرێ بڵێم: لەگەڵ باسکردنی دەمدا، باسی ماچمان کردووە و ماچیش دەمانبەستێتەوە بە سەرچاوەی ئاوی ئینسانەوە کە وەك خواردن دەخورێ و سەرخۆشمان دەکات. وەی خوایەگیان، کە خۆشە!؟..

بۆیە ناچارم بۆ باسکردنی خواردنە عاشقانەکەمان لە باسکردنی بەری ڕووەکێکەوە دەستپێکەم، کە بەهەموو مانایەك دەکرێ بیکەینە سێمبوولی ئەم خواردنە: خواردنی عاشقان، کە بێگومان تامەکەی نەك لە خواردنەکەدایە، بەڵکو لە ماچانەدایە عاشقان بۆ یەکتری دەیانهاوێژن و بارانی نوێبوونەوەی ژیان دەبارێنن بەسەر خۆیان و ئەوانیتردا. بۆچی وا هەستدەکەم دەبێ خودای گەورە لە شوێنێکدا فەرموویێتی: (لە هەر شوێنێ عاشقان هەبن، ڕەحمەتی ئێمەش لەوێیە!)..

### ***(تەماتە)ی خۆشەویستی:***

ڕەمزەکانی خۆشەویستی زۆرن، هەروەکچۆن جۆرەکانی خۆشەویستیش جیاوازن. بەڵام من واهەستدەکەم تەماتە ڕەمزی خواردنی عاشقانەیە. دەزانم تۆ زۆرجار تەماتەت خواردووە، وەلێ خواردنی تەماتە وەك ڕەمزی خواردنێکی عاشقانە شتێکی ترە. تەماتەی خۆشەویستی، جگە لە شێوە و ڕەنگ و بۆن و دەنکەکانی، خەسڵەتێکی دیکەی تێدایە کە لە کەم ڕووەك و میوەی تردا هەیە، یان هەر نییە: تەماتە دەتوانێ تۆڕی خانەکانی لەش و پێستمان لە هەڵوەشانەوە ڕزگار بکات و یەکێکە لەو چارەسەرانەی بۆ تووشبوو بە نەخۆشیی شێرپەنجە بەکاردەهێنرێ. عاشقبوون لەم وڵاتەی ئێمەدا جۆرێکی شێرپەنجەیە و ئێمە لە عاشقبوونەوە دووچاری

هەڵوەشانەوەیەك دەبین کە هیچ دەرمانێ چارەی ناکات و پێویستە بۆ پتەوکردنەوەی تۆڕەکانی خانەی دڵ و بەستنەوەی دڵەکان پێکەوە، پەنا بۆ تەماتەی عەشق ببەین.

کەواتە لە ئێستاوە داوات لێدەکەم، بەرهەڵبێنەکەت هەڵدە، لیستی خۆراکەکان لەبەر چاوتدا بێت و دوو کەوچکی چێشت، ڕۆن بکەرە تاوەکەتەوە. پاشان بە چەقۆ دەم زبرەکەت سەری تەماتەکان بە خڕی لێبکەوە و ناوەکەیان هەڵقرۆنجە و بەوردی بیانجنە و لەولاوە لە قاپێکدا دایانبنێ. ئەمجا سەلکە پیازەکە بەدەم وتنەوەی شیعرەکەی نالییەوە، کە بۆم ڕاڤەکردیت و لە زنجیرەی پێشوودا داوام لێکردبویت بیری لێبکەیتەوە، زۆر بەوردی بجنە و بیکەرە تاوەکەوە و سەرقاپەکەی بنێرەوە و ئاگرێکی کزکزی لەژێردا دابگیرسێنە. وریابە پیازەکە لەکاتی جنیندا، نەتخاتە گریان، چونکە ئەوە بەمانای ئەوە دێت کە تۆ هێشتا بەتەواوی دڵی خۆت نەخستۆتە گرۆی خۆشەویستەکەتەوە و ئامادەییت تێدایە بۆ شتێکی دیکەش دڵت گەرمبێ.. پیاز جگە لەوەی خەسڵەتێکی باشی هەیە و خوێنی خەستوخۆڵی ئەڤینداران ڕووندەکاتەوە و جنۆکەمان لێدوور دەخاتەوە، نابێت شەوانی هەینی بیخۆین، نەبا فریشتەیەك بیەوێ لێمان نزیکبێتەوە.. بەڵام پیاز خەسڵەتێکی فزولیانەشی هەیە و دەیەوێ بکەوینە داویەوە و تا سنووری گریان عاشقی بین. نەکەی!.

لەگەڵ ئەوەی گوێت لە چزەی هەڵقرچانی پیازەکە دەبێت، دەتوانیت پارچەیەك گۆشتی قیمە، یان باسترمە (لە سەد گرام زیاتر نەبن)، بکەیتە تاوەکەوە، تاکو تەواو سووربێتەوە. (لە ڕاستیدا من بۆخۆم لەم خواردنەدا گۆشت زۆر کەم بەکار دەهێنم، بۆیە نەمکردۆتە مەرجێکی سەرکەوتنی خواردنەکە و تۆش ئازادیت..). ئەمجا بکەوەرە جنینی وردی هەموو ئەو سەوزەیەی هەڵتبژاردووە، بەمەرجێ نەعنا و پونگەی تێدا بێت بەڕێژەیەکی کەمتر و ڕۆیکەرە هەمان قاپەوە، کە ناوی وردکراوی تەماتەکانت تێکردووە. دوو چڵ نەعنا بهێڵەوە دوایی ئیشمان پێیەتی.. لە هەڵبژاردنی سەوزەدا هیچ مەترسە و دەتوانیت هەرجۆرە سەوزەیەك تێکەڵی خواردنەکەت بکەیت. بۆ نمونە نیو لەتی بیبەرێکی سەوز، کەرەوز، چەند گەڵای سلق، تەرەتیزە، شویت، ئەگەر

دەستتکەوت: چنگێ کووزەڵە و تەنانەت سێوێکی ترش. هەموو ئەمانە بە وردی دەجنیت و لەگەڵ گۆشتی تەماتەکە و کەمێ خوێ و بیبەری ڕەش و هەر تامێکی دیکە، کە خۆت حەزی لێدەکەیت، تێکەڵیان بکە و هەر بەو دەستەشت و بە هێواشی بکەوەرە گووشین و شێلانی تێکەڵاوەکەت.
دەبێ بزانیت کە ئیتر ئێستا پیازەکان و گۆشتەکە سووربوونەتەوە و کاتی ئەوە هاتووە تێکەڵاوی ناو قاپەکەش بکەیتە ناو تاوەکەوە و بە کەوچکێکی چێشت ئەملاولایەکی پێبکەیت و سەرەکەی بنێرەوە و کەمێ ئاگرەکە زیاد بکە.. گرنگترین شت ئەوەیە سەری تاوەکە بخەیتەوە سەری و نەهێڵی بۆنی خواردنەکەت بڕوا. پێویستە بزانیت کە بۆن بانگکەر و سەرنجڕاکێشە، لەوپەڕی دنیاوە کەسێکت بۆ دەهێنێتە ئەم نزیکانە.. سەرچاوەکانی ئیرۆتیکا و خۆشەویستی ڕۆمانسیانە بەوجۆرە باسی کیژی دانیشتووی کەنار پەنجەرە لە خۆرهەلاتی کۆندا دەکەن، کە گوایە بە بۆنەکانی سەرنجی ڕێبواران و بازرگانەکانی ڕادەکێشا و ماندوویی بیر دەبردنەوە. پاشان بەنیازی دیداری خانمی ئەودیو پەنجەرە، ناچار دەبوون چەند ڕۆژێ لەو شارەدا مەنزڵ بگرن و زۆریش ڕێکەوتووە هەر لەوێ بمێننەوە و لەوێش بمرن! کەواتە بۆن لە دواجاردا بۆی هەیە بکوژیش بێت.. ئەمە جگەلەوەی کە نوێکەرەوەی ئیرادە و لەبیربەرەوەی ئازار و شتی ناخۆشە. دەڵێن ئەو کۆیلە و خولامانەی لە کۆندا کەژاوەی شاژنیان هەڵدەگرت، لە حەسرەتی بۆنی مێینەیی، ئازاری سەرشانەکانیان بیر دەچۆتەوە!!.. زۆرجاریش لە ئافرەتانمان گوێ لێبووە: کە بۆنی عەرەقی پیاو هەمیشە جاڕسکەر نییە، بەڵکو هاندەرە.. ئەوەیان خوا دەزانێ و نەچیت ئیتر بە مانگ خۆت نەشۆیت و پێتوابێ بۆنەکەت خەڵك جاڕس ناکات!
لەدوای ئەوەی سەری تاوەکەت نایەوە، تەماتەکان بهێنەرە بەردەمت و هەوڵبدە پارچەیەك لەو پەنیرە زەردە، یان سپییە تەنکەی وێنەی سەرە (گا)کەی لەسەرە و پاکەتی (دە) دانەی تێدایە، بخەیتە ناو هەریەکێ لە تەماتەکانەوە. لێگەڕێ گوێچکەی پەنیرەکان بەمدیواودیوی تەماتەکاندا شۆڕببنەوە! پاشان سەموون و وردەنان بەسەر

تەماتەکاندا بپروێنە بەمەرجێ هەر تەماتەیە دوو کەوچکی چێشت، نانی پرواو (وردکراو)ی بەرکەوێ. لەگەڵ گوێگرتن بۆ خرمەی وردبوونی لەژێر پەنجەکانتدا، بیر لەو خەیاڵە ئایینیە جوانە بکەرەوە کە سیفەتی (پیرۆزیی) بە نان بەخشیوە! ئاخر نان بە کۆی ئەو پرۆسانەدا ڕۆیشتووە کە مرۆڤ لە مێژووی شارستانیەتدا دایهێناون و فێریانبووە و ئەویان لە ئاژەڵ جیاکردۆتەوە. لە بوونەوەرێکی سرووشتییەوە کردویانەتە بوونەوەرێکی مێژووکرد و خاوەن کولتوور..: نان چییە لە گۆڕینی بەرهەمی ڕووەك زیاتر، کە شتێکی سرووشتییە بۆ ئەوەی ببێتە شتێکی کەلتووری و مرۆکرد؟ نان چییە لەوە زیاتر کە ئێمە بەرهەمی گەنم و جۆ و هەرشتێ کە نانی لێدروستدەکەین، لە دانەوێڵەوە دەکەین بە خۆراك، دەیکەین بە ئارد و هەویر و دەیبرژێنین و لەسەرچاوە سرووشتییەکەی خۆی دووریدەخەینەوە و وەك بەرهەمێکی کەلتووری و دەستکردی مرۆڤ دەیخەینە ڕوو، کەچی دواجار پێیدەڵێین: (پیرۆزە) و سوێند بە نان و زەواد دەخۆین؟ ئەوە چییە لە ناندا کەوادەکات، دوای برژاندن و سووتاندنیشی هەر پیرۆزیی خۆی لەدەست نەدات و لەجێی قورئان دەستی پێدا بدەین؟! ئەوە چییە کاتێ هەندێ خواردن کە بۆخۆیان لەگەنم و جۆ و هەرزن و خۆراك و دانەوێڵەی دیکە دروستیاندەکەین، (وەك ساوەر و برِوێش و تەنانەت فەلافل)یش، کەچی هەر بەنانەوە دەیانخۆین و بەبێ نان تێریان پێناخۆین؟! کەواتە لە ناندا تایبەتمەندییەك هەیە و پێویستە هەر لەبەر ئەو تایبەتمەندییەش ببێتە بەشێکی گرنگی خواردنی عاشقان..

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە جارێکی دیکە ناو تاوەکەت بە کەوچکەکە تێکهەڵدەیتەوە و سەرەکەی لەسەر دابنێیتەوە. تا ئاوێ دەکەیت بە چەقۆ و ئەو تەختەیەی سەوزەکانت لەسەر جنیون و دەفر و شتە زیادەکان کۆدەکەیتەوە، تێکەڵەی ناو تاوەکە تامی خۆی گرتووە. جارێکیتر ئاگرەکەی کز بکەوە. سەرەکەی لەسەر لابەرە و یەك بەیەك تەماتەکان بخەرە ناوی و ناوەکەیان بە تێکەڵەی سەوزەکان پڕبکەوەرەوە و سەرقاپی تەماتەکان بە ئەڵقەی یەکەمی خۆیان بنێرەوە و یەکی کەوچکێ لە

تێکەڵەکە بکەرەوە بەسەریانا. سەری تاوەکەش بخەرەوە سەری و ئاگرێکی مامناوەندی بۆ داگیرسێنە. بەلەمێکی لێواردار بهێنە و داینێ، هەردوو قۆخەکە پاك بکە، بەمەرجێ تویکڵەکەیان بخەیتەوە ژێر خۆیان و یەکێکیان لەمسەر و ئەویتریان لەوسەری بەلەمەکەوە دابنێ. خودا بۆخۆی دەیزانی: بەبێ قۆخ ژیان شتێکی کەم دەبوو، بۆیە ئێمەش دەزانین خۆشەویستیش بەبێ قۆخ هەستی بەتەنیایی دەکرد.. دوایئەوەی زانیت پەنیرەکە تواوەتەوە، ئاگرەکە بکوژێنەوە و بە کەوگیرێك و بەهێواشی تەماتەکان بەشێوازێکی جوان لە بەلەمەکەدا و لەنێوان هەردوو قۆخەکەدا دابنێ و ئەو چڵە نەعنایانەی هەڵمانگرتبوون، بەناویاندا بچەقێنە. مەبەست نییە تەماتەکان تەواو تلیسابنەوە، هەرئەوەندە بەسە کەمێ پیشابن. سەوزە و گۆشتە تێکەڵەکەش بکەرە قاپێکی دیکەوە و لەتەنیشت بەلەمەکەوە داینێ. بەڵام ئالێرەدا وریابە! چونکە من ئابەوە ناو دەم و زمانی خۆم سووتاند.. دوای ئەوەی تێکەڵەی ناو تاوەکەم خستە قاپەکەوە، هێشتا کەوچکەکەم بەدەستەوە بوو، کەوچکێکی گەرم و داغ، ئەوەبوو لەسەر دەستووری خووپێوەگرتن، بەهەمان شێوەی کە ئێمەی نێرینە سمێڵمان دەخەینە دەمانەوە و دەست بۆ ناوگەڵی خۆمان دەبەین و پەنجە دەخەینە لووتمانەوە، منیش کەوچکەکەم برد بۆ دەمم تاکو بیلێسمەوە و لەوکاتەدا چسکەم لە زمان و مەڵاشووی خۆم هەستاند.. وەلێ نامەوێ بەهۆی باسکردنی ئەم کارەساتەوە، چێژی پێکەوەبوونت لەگەڵ یاردا لەبیر بەرمەوە، کە بۆخۆی هەنگاوێکی عاشقانەیە بەرەو ژیانێکی مرۆڤانە، ژیانێ کە نالی سەر و ماڵی خۆی لەپێناودا دەبەخشی..

لە زنجیرەی داهاتوودا، یا ئەوەتا باسی ئەوەت بۆ دەکەم، ئەگەر خۆشەویستەکەت نەهات، یان خواردنەکەت خراپ دەرچوو چیدەکەیت؟! یان ئەوەتا باسی خواردنێکی دیکەت بۆ دەکەم بەناوی... نا، پێویست ناکات ئەوەندە شاعیرانە بم لە گەڵتا و هەموو فەنتازیاکانی خۆمت بۆ ئاشکرا بکەم.. تۆش بیرکەرەوە ئاخۆ لەدوای عەشق، دەکرێ بیر لە چیتر بکەینەوە..؟!

# خواردنی شاعیرانه

پێشکەشە بە: محەمەد عومەر عوسمان

**وەك** دەبینی لەم بەشەدا قسەم هەیە لەسەر (خواردنی شاعیرانە) و کار لەسەر بەرجەستەکردنی چەمکێك دەکەم کە بوونێکی بەرجەستەی نییە، بەڵام ئەگەری بەرجەستەبوونی پێویست و فرەیە. بەمەش وەڵامی ئەو پرسیارەمداوەتەوە کە لە کۆتایی زنجیرەی پێشوودا خستبوومە ڕوو: **بیرکەرەوە: ئاخۆ لەدوای عەشق، دەکرێ بیر لە چیتر بکەینەوە..؟!** بێگومان لە شیعر و لە دنیای شاعیرانە، نەك لە ناکامی و تێکشکان و ژاکان.. چونکە دنیای شاعیرانە بۆخۆی پڕە لە عەشق و عەشقیش بەو پێیەی مێبوونەوە و هەستەوەریی ئێمەیە لەئاست خۆمان و ئەویتر و جیهانی دەوروبەردا، ئەوە پڕە لە شاعیرییەت و کرانەوەی هەستەکانمان و ئازادیدان بە خەیاڵمان. خواردنی شاعیرانە هیچ نییە لە (شاعیرانە خواردن) و (شاعیرانە هەستکردن) زیاتر، لە پەیوەستکردنی جەستە بە ڕۆحەوە و لە بەرپەرچدانەوەی هەر بیروبۆچوونێ کە چێژی جەستەیی و ئەو بەختەوەرییەی لە ئەنجامی ئەو چێژەوە پێیدەگەین، بەکەم دەگرێ و سووکایەتی پێدەکات. مێژووی سووکایەتیکردنیش بە جەستە ئەوەندە دوورودرێژە، ئەگەر ئەبیکۆرۆس، (دەوروبەری 300پ.ز) و هاوڕێ چێژپەرستەکانی دیکەی لە یۆنانی کۆندا نەبوونایە، ئێستا ئێمە جەستەی خۆمان بەتەواوی بیردەچۆوە و بێبەش دەبووین لە هەر چێژێ کە لەڕێگەی جەستە و

هەستەکانییەوە، دەستگیرمان دەبێ.. لـەم نێوانەشـدا شـاعیرەکان زۆرتـرین چـاکەیان لەگەڵدا کردووین، بەوەی پەیوەندیی هەستەوەرانەمان بە ژیان و جیهانەوە لـە دەسـت نەدەین و هەسـتەکان بەبـەردەوامی، وێـڕای ئـەوەی جاروبـار بەهەڵـەشماندا دەبـەن، سەرچاوەیەکی باش بـوون بـۆ دەرککردنـی خۆمـان و سرووشـت و بوونـەوەرەکانی دیکە..

ئەگەر لـە شیعرەکانیانەوە بیربکەینـەوە و ڕێنمـایی وەربگـرین سـەبارەت بـە داهێنـانی خواردنێکی شاعیرانە، ئەوە بێگومـان ئـەو خواردنـە پـڕ دەبـێ لـە (گـەڵای وەریـوی درەخت) و کڕووزانەوەی (بولبـوول) و بـۆنی (بێوەفـایی ژن) و (زەمانــە) و تەنانـەت پێویستە بیر لـە دروستکردنی سووپێکیش بکەینەوە لـە (کرم و فرمێسك و جودایی!).. بەم پێیەش خواردنـێ دروسـتدەکەین، کـە یەکـەم ئـەنجامی چـاوەڕوانکراوی بۆسـەر ئەوانەی دەیخۆن: شێتبوون و جنوونە. لێرەشەوە پێویسـت ناکـات غـازێکی زۆر بـەو هـەموو گرانییـە و ڕۆن بـەو هـەموو چـەورییە و کـاتێکی زۆر بـە دروسـتکردنی خواردنێکەوە سەرفبکەین، کە دوارۆژەکەی بریتییێ لـە جنوون و شێتبوون.. لـە وڵاتی ئێمـەدا مـرۆڤ بیـەوێ شـێت بـێ، ئەوەنـدە بەسـە ڕۆژی دە خولـەك تەماشـای تەلـەفزیۆنەکان، پێنج خولـەك پیاسە بکات و لــە سـێ خولـەکـدا بـرنج و فاسـۆلیایەك بخوات و دووخولـەکی دواییش تەرخان بکات بۆ وەسیەتکردن!

کەواتە بۆ داهێنانی خواردنێکی شاعیرانە، پەنابردن بۆ شیعری شاعیران سەرچـاوەیەکی باش نییـە و پێدەچـێ شـاعیران لــە هـیچ کوێیـەکی جیهانـدا سرووشبەخشـی لێنـانی خواردنی خۆش و بەتام نەبووبن. لەڕاستیشدا، (ئەمەیان نهێنییەکە و بۆتی باسدەکەم): زۆر دەگمەنن ئەو شاعیرانەی خواردنی ناخۆشیان خواردبێ و وێـڕای خـەمخۆرییان بـۆ چەوساوەکان، بێنەواکان و هـەژاران و هـەروەها ستایشـیان بـۆ خشـۆك و باڵـدار و هەرچی بوونەوەرانی ئاوی و ژێرزەوی هەیـە، کەچـی بۆخۆیـان لـەڕووی خـواردن و خواردنیانـەوە، بێـدڵیی خۆیـان نـەکردووە. ڕەنگـە لـەمـەدا پێویسـت بـەوە بکـات، سەردەستەی شاعیرانی موکریان، واتە هێمنی مەزن و هەمیشە ئـاوارە بکەینـە دەرەوە،

کە چەندە بە شیعر ناوبانگی دەرکرد، ئەوەندەش بە برسێتی و ئاوارەیی.. شاعیر هەیە قەبارەی ئەو شیعرانەی بۆ سرووشت و مار و مێرووی نوسیون، لە مەنجەڵێکی مسیی گەورەدا جێگەیان نابێتەوە، کەچی هێندەی مەودای فڕینی بولبولێکیش دوای ئازادبوونی لە قەفەس، باڵی مریشکی خواردووە و ساڵی بەلایکەمەوە بەدرێژایی کیلۆمەترێکیش کەباب دەخوات.. بەهەرحاڵ، من نامەوێت باسی ئەو ناکۆکییەت بۆ بکەم کە لە ژیانی شاعیراندا هەیە، هێندە هەیە ئەگەر ویستت لەمە تێبگەیت، پێویستە ڕۆژێ، بەدزی قالۆنچەیەك ببەیتە ژووری شاعیرەوە و داوای لێبکەیت، چەند شیعرێکی تازەی خۆییت بۆ بخوێنێتەوە.. لە ناوەڕاستدا، دوای ئەوەی قالۆنچەکەت بەرەڵلا کردووە، قیژەیەك لێدە و هاوار بکە و بڵێ: (ئەها.. ئەوە دەعبایەکە!). ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی شاعیر زۆر بەنەرمی هەستێتە سەرپێ، دوایین مژی لە جگەرەکەی بدات، کاغەزەکانی لەسەر مێزەکەی دابنێ و لەبەر خاتری تۆ، بە وردی لە قالۆنچەکە بچێتە پێشەوە و وردەوردە قاچی ڕاستی بەرز بکاتەوە و بە نووکە قۆندەرەکانی، نەرم نەرم و شاعیرانە، قالۆنچەکە بفلیقێنێتەوە..

ناکۆکیی لەنێوان ئەوەی دەیڵێین و ئەوەی دەیکەین، لەنێوان ئەوەی بڕوامان پێیەتی و ئەوەی دەبێتە ڕەفتارمان، لە نێوان ئیتیك و مۆراڵماندا، شتێك نییە تایبەت بێت بە شاعیران، بەڵکو تایبەتە بە ئێمەی ڕەگەزی مرۆڤ و ئەمەش خاڵێکی گرنگە کە لە ئاژەڵانمان جویدەکاتەوە. ئاژەڵەکان لەو ڕووەوە زۆر لە ئێمەی مرۆڤ (ڕاستگۆترن) و لە نێوان غەریزە و ڕەفتاریاندا ناکۆکیی نییە، شتێ ناکەن لەگەڵ سرووشتی غەریزەیی خۆیاندا ناکۆك بێت. ئەگەر تۆ وەك نێچیرێ بکەویتە بەردەم شێرێکی برسی، هەتا ئێوارە باسی ئەوەی بۆ بکەیت کە وڵاتەکەت بەسەر چوار دەوڵەتدا بەشکراوە، ڕەخنەت لەسەر حکومەتی هەرێم و بەشداریی کۆنە بەعسییەکان هەیە لەو حکومەتەدا بۆیە کەوتویتە ئەو جەنگەڵەوە، شێرەکە هەر دەتخوات و وەکو ئێمەش بە نیوەناچڵی دەست لەخواردنەکەی هەڵناگرێ و تا تێرنەخوات لەڕوودانامێنێ.. حەیوانات وەکو ئێمە موجامەلەی درۆش ناکەن، بە زمان پێتبڵێین: (فەرموو، بخۆ..) و

لە دڵەوە پێیان ناخۆش بێت، ئەوان تا بۆخۆیان وەستابن، فەرمووی کەس ناکەن. دیمەنی شەڕی پڵنگ و چەقەڵ و داڵەکەرخۆرەت بیر نەچێ، کە هەتا یەکەمیان تێرنەخوات، دووەمیان بۆی نییە لە کەلاکەکە نزیکبێتەوە و تەنیا دوای مرپبوونی دووەمیشیانە، سێیەمیان بۆی هەیە دەنووك بەرێ بۆ ئیسقانەکان. ئەوەی ئێمە لەم دیمەنەوە فێری بووین، ئەو نایەکسانییەیە کە لە دابەشکردنی خواردنەکاندا ڕەچاوی دەکەین و لەمەشدا خاوەنهێز براوەیە و تا ئەو تێر نەخوات ئەوانی دیکە بەریان ناکەوێ.

میوان لە کۆمەڵگای ئێمەدا خاوەن هێزی یەکەمە، واتە (شێرە) و خواردن بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە، لە دوای میوان بۆ پیاوان و ئەمجا بۆ ئافرەتان و منداڵەکان! زۆرجاریش کابانی ماڵ هیچی بۆ نامێنێتەوە لە بنکڕ و چەرم و پرزۆڵە زیاتر..

بۆیە پێویستە کەلتووری خواردنمان لەوێوە کە پەیڕەویکردنە لە لۆژیکی نایەکسانیی هێز و موجامەلە و عەیبە، بگۆڕین بۆ کولتوورێ کە هەموومان پێکەوە لە دروستکردنی خواردنەکان و لە خواردنیان و لە شتنی قاپەکانیشدا بەشدار بین: جوانترین سرووتی خواردن ئەوەیە، ماندوویی و چێژ لەنێوان خۆماندا دابەشبکەین. دانمارکی و سکەندناڤییەکان لەمڕووەوە خاوەن کەلتوورێکی زۆر شایان و دەوڵەمەندن، دەبێ لێیانەوە فێرببین، ئەگەرچی زەحمەتە لەوە تێبگەین چۆن دەتوانن چەندین کاتژمێر بەدیار مێزەکانیانەوە دابنیشن. لێتناشارمەوە، من بە سیازدە ساڵ ئەمجا تێگەیشتم کە سرووتی خواردن بەلای سکەندناڤییەکانەوە، هەر تەنیا هەوڵدان نییە بۆ چێژ وەرگرتن و تێربوون، هێندەی ئەوەی سرووتی یەکترناسین و مەعریفەیە بە ئەویتری مرۆڤ.. ئەوەی لەو دانیشتنانەدا ڕەچاو دەکرا، کێبڕکێ نییە لەسەر زووتێرخواردن و قسەی خۆزاڵکردن بەسەر ئەوەی لەبەرامبەرت و لە تەنیشتتەوە دانیشتووە، کە بۆی هەیە ڕەگەزپەرست و نەیاریش بێت، بەڵکو ڕەچاوکردنی ئەخلاقی گفتوگۆیی هابرماس و لۆژیکی دیالۆگی باختینە لەسەر سفرە.. جارێکیان لە دانیشتنێکدا بە دوورودرێژی قسەم لەسەر خراپی پۆلیس دەکرد لەگەڵ پەنابەراندا و

دواجار وتاری (**پۆلیس: باوکێکی ناحەز لەسەر شەقامی ئازادی**) لێبەرهەمهات، کە لە (دیاردەگەرایی تاراوگە)دا بڵاومکردەوە، وەلێ تەنیا دوای گفتوگۆکە بۆمدەرکەوت، سێ کەس لەوانەی بەشدارییان کردبوو لە گفتوگۆکەدا، بە پیشە ئەفسەری پۆلیس و پۆلیسی نهێنی بوون!. ئەوان پەیڕەوکاری فەلسەفەی ئەخلاقی کانت بوون و لەو دانیشتنەدا وەك هاووڵاتییەك ئامادەبوون، نەك وەکو خاوەن پلەوپایە..

دەمویست باسی ئەوەت بۆ بکەم کە شیعری شاعیران سەرچاوەیەکی باش نین بۆ دروستکردنی خواردنی چێژبەخش، بەڵام ئەوەی پێویستە لە شاعیرەکانەوە سەبارەت بە خواردن فێری ببین، بریتیە لە هەستکردنی شاعیرانە و شاعیرانە چەشەکردنی خواردنەکان. (هەستکردن) و (چێژبینین) و لەئەنجامی ئەمەشەوە (خۆشحاڵی) و (بەختەوەربوون)، لە کەلتووری زۆربەی گەلانی وەك ئێمەدا، وەك مەسەلەیەکی (ڕواڵەتی) و (هاکەزایی) و (کەم)، تەماشای کراوە. ئەوەی زۆر خۆشحاڵە، یان بەدوای چێژدا دەگەڕێ و هەستیارە، کەسێکی ساکار و گەمژە و خەمسارده و لەدنیا تێنەگەیشتووە.. ئەوەی زۆر پێبکەنێ و هەستی خۆی دەربڕێ، (عەقڵی سووك)ە و (منداڵانە) ڕەفتاری نواندووە. لەبەرامبەر ئەمەشدا عەقڵێکی (قوورس) و (زیرەك)مان هەیە کە دەرکی (تراژیدیا) و مانای (قووڵ)ی ژیان دەکات.. نیتشە لە شوێنێکدا ئاماژە بەوە دەکات و دەڵێ، ئەوەی مرۆڤەکان لەخۆیان قەدەغەی دەکەن، ناچارن وەك شتێکی ساکار، لاکەوتە و پیس تەماشای بکەن. بەڵام بەوەی بەکەم تەماشای حەز و هەستەوەرییەکان بکرێ و حوکمیان لەبارەوە دەربکەین، هیچمان نەکردووە لەوە زیاتر کە نامانەوێ دان بەو ڕاستییەدا بنێین کە پێماندەڵێ: مرۆڤ بوونەوەرێکی خاوەن جەستەیشە. نیتشە دەیەوێ بڵێ: ئێمە ناتوانین چاو لە لایەنی هەستەوەری خۆمان بپۆشین و لە جەستەمان فرێی بدەینە دەرەوە، ئەگەرچی دەتوانین بیچەپێنین و سەرکوتی بکەین. بۆیە چاوپۆشین و بەکەم تەماشاکردنی هەستەکانمان هۆکارێکی هەرەسەرەکیی شێوازی تێرکردنی سادۆماسۆشیانەی حەزەکان و مەیل و ئارەزووەکانمانن. ئێمە

لەکاتی تێرکردنی حەزەکانیشماندا ئارەزووی ئازاردان و ئازارچەشتنمان هەیە و چێژ لەمەش دەبینین... پێدەچێ ئەو تێگەیشتنەی نیتشە، بەرپەرچدانەوەی ئەو نەریتە فەلسەفییە بێت کە لە ئەفلاتوونەوە تاکو ئایینی مەسیحی و تاکو دیکارت، لە کەلتووری ئەوروپیدا درێژ بۆتەوە و بۆتە کەلتوورێکی جیهانی. لەو نەریتەدا بەشێوەیەکی گشتی بیرۆکەیەك هەیە کار لەسەر بەکەمگرتن و بێبەهاکردنی هەستەوەری دەکات و لەوێشەوە مەیل و حەزەکانی مرۆڤ ڕەتدەکاتەوە و لە ئاستی دەروونیشدا توندڕەوی و چەپاندن و سادۆماسۆشییەت بەرهەمدەهێنێ..

پێویستناکات لە کۆمەڵگایەکی ئەفلاتوونیدا بژین، یاخود پاڵنەرێکی ئایینی هەبێ بۆ ئەوەی بەچاوی نزم تەماشای جەستە و حەز و مەیلە جەستەیی و هەستەوەریی خۆمان بکەین. هێندە بەسە کۆمەڵگا قەبووڵی جۆرەکانی توندوتیژی و ئەتککردن و بەکەمگرتن و بەزۆر داپۆشین و حیجابکردنی جەستەکان بکات، ڕێگا بدات بە کوشتنی ڕۆژانەی جەستە و خۆکوژی و ئەویدی کوژی ببێتە دیاردە، تاکو هەمووومان بکەوینە بێحورمەتی و سووکایەتیکردن بە هەستەوەری و گاڵتەمان بە ژیانێکی چێژبەخشانە بێت..

کەواتە قسەکردن لەسەر خواردنی شاعیرانە، قسەکردنیشە لەسەر هەستەوەری و گرنگیی جەستە سەبارەت بە هەستکردن و ئەزموونکردنی ژیان. خواردنی شاعیرانە، بەمانای جۆرێ لە خواردن نایەت کە بتوانین دروستیبکەین، بەڵکو بەمانای شاعیرانە مامەڵەکردنە لەگەڵ خواردنەکاندا و شاعیرانە هەستیاربوونە لە کەش‌وهەوایەکدا کە ژەمێکی تێدا دەخۆین. بەم مانایەش دەکرێ، هەموو ژەمەکانمان و هەموو خواردنەکانمان شاعیرانە بن. لەڕاستیدا شاعیران میراتگری مرۆڤایەتین لە هەستکردن و کردنەوەی هەستەکانیاندا و ئەمەش ئەو شتەیە کە وادەکات ئێمە زۆرشت لە شاعیرانەوە فێر ببین، تەنانەت لەسەردەمێکیشدا کە شیعری باش کەمبۆتەوە و لە ناو کۆمەڵگایەکیشدا کە بیرۆکە مرۆڤدۆستییەکان لەکاڵبوونەوەدان و لە کەلتوورێکیشدا کە ئیدیعای ئەوە دەکات: سەردەمی شیعر کۆتایی پێهاتووە و تەنانەت

دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوەش بە ترسەوە لە چاپکردنی کۆمەڵە شیعرییەکان نزیکدەبنەوە و لۆژیکی بازاڕی کتێب دەکەنە پێوەر بۆ ڕۆڵی شیعر. لەبەر ئەوە ئەرکی شاعیران لە مێژوودا هەر ئەوە نەبووە کە تەنیا شیعر بنووسن، بەڵکو ئەوەش بووە و هەیە، کە نەهێڵن پەیوەندیی هەستیارانەی مرۆڤ ببێ بەژێر چەرخی گۆڕانکارییەکانەوە. مرۆڤ لەوەدا کە بوونەوەرێکی هەستەوەرە و کەچی مەحکومە بەوەی لەهەر شوێنێکی دنیادا لەناو ژیانێکی تاقەتپڕووکێندا بژی، پێویستی بە شاعیرەکان و هەستیاریی شاعیرانە هەیە تاکو هەستەکانی لەو دڕندەییە ڕزگار بکەن، کە ژیان بەسەریدا دەیسەپێنێ. شاعیرانە ژیان و شاعیرانە ئەزموونکردنی شتە ڕۆژانەییەکان، لەوانەش خواردن، بەشێکی گرنگی ئەو بەرگرییەن کە پێویستە ئێمەی مرۆڤ لەبەرامبەر ژیانێکی نامرۆڤانەدا، هەمانبێ. بۆ ئەمەش پێویستناکات ببینە شاعیر، هێندەی ئەوەی ڕێز لە هەستەکانمان بگرین و توانای هەستەوەریی خۆمان لە ژیانێکی پڕ تەنگوچەڵەمەدا، نەدۆڕێنین.

بۆئەوەی شاعیرانە بژین دەبێ شیعر بخوێنینەوە و کە شیعریشمان خوێندەوە هەستیار دەبین و کە خواردنیشمان دروستکرد و خواردمان، ئەو هەستیارییە یارمەتیمان دەدات چێژی لێوەربگرین و ژیانێکی خۆشیش لەوەدایە کە مرۆڤ توانای هەبێ کاتە خۆش و ناخۆشەکان لێکدی جیابکاتەوە. مەرج نییە هەژاران کە بەزەحمەت نانی خۆیان پەیدا دەکەن و هەردەم سفرەشیان پڕ و ڕەنگاوڕەنگ نییە، شاعیرانەتر نەخۆن، لەوانەی خواردنیان بە ئاسانی دەچێتە بەردەم. بۆیە زۆرگرنگە مرۆڤ بە سەلیقە و چەشەی هەژارانە و بەگەڕانەوەی بۆ قۆناغیی هەژاریی ڕەگەزیانەی خۆی، ژەمەکانی بەرێ بکات.

لە ڕاستیدا کاتێ ڕەگەزی مرۆڤ خۆی لە ئەفسوونی ئەفسانەکان و هێزی خواوەندەکان ڕزگار دەکات، لەناو ژیانێکی ئازادانەتردا خۆی دەبینێتەوە و لێرەشەوە توانای ئەو بۆ خەیاڵکردنەوە پەرە دەستێنێ. خەیاڵکردنەوەش، بەمانای فەنتازیا، پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ ئازادیدا هەیە. ئازادی، مەرجی گەشەکردنی خەیاڵی

تاکەکەسی مرۆڤ و ڕەگەزی مرۆڤایەتی بووە. لەهەر شوێنێ مـرۆڤ ئـازادی هـەبووبێ، داهێنان و کرانـەوە و پۆیسـیس سـەریانهەڵداوە، لەهـەر شـوێن و لەهـەر قۆنـاغێکی شارستانییەتیشدا مرۆڤ خۆی لـە ترسـی ئاسمانـەکان و خواوەنـد و سرووشـت ڕزگـار کردبێ، پتر فەنتازیای خـۆی بـەکارهێناوە بـۆ ناسـین و پەیوەنـدیگرتن و ئـاوێزانبوون لەگەڵ دەوروبەریدا. شاعیران لـە قۆناغێکدا سەرهەڵدەدەن و مرۆڤ لـە سـەردەمێکدا دەبێتە شاعیر، کە فێر دەبێ هەستەکانی خۆی بخاتە کار و ئازادیان بکات. بـەو پێیـەی خەیاڵکردنەوە پرانسیپی یەکـەمی شـیعرە و بـەرەنجامی (گـوێگرتن)، (هەسـتکردن) و (بینین)ی مرۆڤە بۆ دەوروبەری خـۆی، ئـەوە یەکـەمین هۆکاریشـە لـە دروسـتبوونی پەیوەندیی مرۆڤ بە سرووشت و مرۆڤ بە هاوڕەگەزەکانی خۆیـەوە، کـە بێگومـان ئـەم پەیوەندییەش پەیوەندییەکی کۆنکرێتی و هەستپێکراوە، ئەنجامی ئەو ئازادییەیە کە مرۆڤ بە هەستەوەری خۆی بەخشیوە. مرۆڤ هەرکات ڕێزی لە هەستەوەری خـۆی گرتبـێ، ئازارەکانی کەمبوونەتەوە و خەیاڵکردنەوە و داهێنان ئەویان پتر بە خودی خۆی و بـە ئەوانیتر ئاشناکردووە. ناسـنامەی مرۆڤبـوون بـەرەنجامی ئـەو پەیوەندییەیـە کـە مـرۆڤ لەڕێگەی شیعر و شاعیرانەژیانەوە دروستیدەکات. بەمجۆرەش هیچ ساتەوەختێکی ژیانی ئێمە نییە نەتوانین شاعیرانە تێپەڕێنین و هەستەکانمان لە ئاستیدا نەکەینـەوە و ڕەهایـان نەکەین. ئەم قسەیە سەبارەت بە نانخواردنیش دروستە و چ لە دروستکردنیدا و چ لـە خواردنیدا پێویستیمان بە ئازادیدان بە هەستەکانمان هەیە.

خواردنی شاعیرانە ئەوەیە کـە بتـوانین ئـەو خواردنـە بـۆن بکـەین، دیمـەنی لێنـان و ڕازاندنەوەکەی سەرنجمان ڕابکێشێت و دنەی چەشـە و ئیشـتیهامان بـدات تـاکو بـە چـێژەوە بیخـۆین و بەخواردنیشـی ئـارام ببینـەوە. هەسـت بەخۆشـیی بکـەین و بەختـەوەرمان بکـات. دروسـت بەهـەمان شـێوەی مرۆڤـی سـەرەتایی کـە لەکـەنار ئەشکەوتەکاندا هەستی دەکرد، بۆنی دەکرد و سەری لە ئاست دیمەنەکاندا دەسووڕما و خەیاڵیدەکردەوە و ئـەوجا دنیـای بەشـێوەیەکی دیکـە دەبینـی و شـاعیرانە دەهاتـە ئاخاوتن.. لەم ڕوانگەیەوە، خـواردنی (شـاهانە)، خـواردنی (دەربارییانـە)، خـواردنی

(هەژارانە)، خواردنی (کوردی) و خواردنی (ڕۆژهەڵاتیانە) و (خۆرئاواییانـە)، بـەلای منەوە هیچ مانایەکیان نییە، ئەگەر لەهەمان کاتیشدا بەهەستێکی شاعیرانەوە ئامادەمان نەکردن و بەهەستێکی شاعیرانەشەوە نەمانخواردن.

ئێمە منداڵـەکانمان فێردەکەین خواردنەکەیان باش بجوون و ئەوان بە نەجووراوی قووتی دەدەن، لەبەرئـەوەی فێرمـان نـەکردون چـێژی لێـوەربگرن. لـە ئەنجامـدا منـداڵ بەوجۆرەی ئێمە دەمانەوێ فێری ئەو شێوەیە لە نانخواردن دەبێ کـە ئێمـە بەلامانـەوە پەسەندە، بەڵام فێری هەستکردن و تامکردنی ئەوەی دەیخوات، نابێ. بۆیە لە ئەنجامـدا ئەو دەخوات بەبێئەوەی بەلایەوە گرنگبێ و بزانێ چی دەخـوات و لـە چ ماوەیەکـدا دەیخوات.. ئەو ئەرکێك لەسەرشانی خۆی کەمدەکاتەوە، ئەو دەخوات بـۆ تێربـوون، ئەو بە دەست و کەوچك و چەتاڵ شتێ دەخاتە دەمییەوە، قوتیدەدات و قومـێ ئـاوی بەسەردا دەکات، تاکو گـەدەی پڕدەبـێ، بـەڵام هەسـت بـەو خواردنـە ناکـات کـە خواردویەتی و پاش کەمێکیش لەبیری دەچێتەوە چی خواردووە.

پێویستە تۆ بەو جۆرە لەمن تێبگەیت کە دەمەوێ پێتبڵێم، تـامکردن و چـێژبینین لـەو شـتەی هەسـتپێدەکەین، هێنـدەی ئـەوەی کـە مەسـەلەیەکی کولتوورییـە ئەوەنـدە سرووشتی نییە. سرووشت توانای هەسـتکردن و ئەندامـەکانی هەسـتکردنی بـە ئێمـە بەخشیون، بەڵام پێویستە فێری چۆنێتی بەکارهێنانیان بـبین. چـێژبینین بـە پێچـەوانەی ئاژەڵەکانەوە، کە چێژ نابینن، شتێکە لە کۆمەڵگادا فێری دەبـین و پێویسـتە گەشـەی پێبدەین.. بەڵام بێگومان لەکۆمەڵگایەکدا کەلتووری ڕێزگرتن لە جەستە ئامادەبێت و چێژبینن نرخی هەبێ و (عەیبە) نەبێت. وەلێ ئەم کولتوورە میکانیکییەی خواردن، کە لە وڵاتی ئێمەدا باوە، ئێمەی لەزۆر چێژ بێبەش کردووە و هیچـمان تەمـەنمان ناگاتـە سی ساڵی، نیشانەی ئەو نەخۆشیانەمان تێدا سەرهەڵدەدەن، کە ئەنجامی بەدخواردن و میکانیکیانە خواردنن!.

دەگمەنن ئەو ڕیستۆرانت و چێشتخانانەی ناو کۆمەڵگای ئێمـە خەسـڵەتی شـوێنێکی شیاو بۆ خواردنێکیان تێدا بێت کە شایانی مرۆڤە، چجای ئەوەی خواردنێکی شاعیرانە

بێت! دەگمەنن ئەو خواردنگانەی وڵاتی ئێمە کە لە پێش پارە پەیداکردن و ئێمە بە کڕیارکردنەوە، بیریان لە ئێمە کردبێتەوە وەك بوونەوەری هەستەوەر و چێژوەرگر. ئەمە بۆخۆی کارەسات و زەوقکوژییەکە و بەدوورە لە ئەتەکییەت و کەلتووری خواردن. ڕیستۆرانتێك یان چێشتخانەیەك نەیتوانییێ فەزایەك بۆ خواردن بەرهەم بهێنێ، نەیتوانییێ بیر لە دابینکردنی لانیکەمی ئارامی بۆ مشتەرییەکانی بکاتەوە و دووریانبخاتەوە لە هەراهەرا و دووکەڵی جگەرە و بۆنی تەوالێتەکانی و تەنانەت فەزایەك دروستبکات تاکو (مشتەرییە مێیینەکانی)، لە چاوی برسیی و تیرهاوێژی تێرخواردووەکان، ڕزگار بکات، شایانی ئەوە نییە یەك پوولی ساخ بدەین بە خواردنەکانی.. نەبوونی فەزایەك بۆ خواردن لەناو چێشتخانە و ڕیستۆرانتەکانی ئێمەدا، کۆمیدیایەکە تەنیا ئەم وڵاتە و ئەم کۆمەڵگایە قەبووڵی دەکات.

لەناو ئەم کەشوهەوایەدایە، پێویستە گرنگی بە تازەکردنەوەی کەلتووری خواردنمان، وەك سەرەتایەك بۆ گرنگیدانەوە بە توانای هەستەوەری و چێژبینینمان بدەینەوە. ئێمە مێژوویەکی جەستەکوژ و هەستڕووشێنمان لەپشتەوەیە، کە تەنانەت کاریگەریی خراپی خۆیشی کردۆتە سەر جۆری خواردنەکان و چۆنایەتی خواردنەکانمان. لێرەوە پێویستە ڕەهەندی شاعیرانە بۆ ژیانی خۆمان بگێڕینەوە با ئەوە لە ڕێگەی خواردنیشەوە بێت، کە زۆربەمان بە شتێکی بێمانا و ساکاری لەقەڵەم دەدەین.

خواردنی شاعیرانە هەروەکو چۆن فۆرمێکی تایبەت و دەستوورێکی تایبەتی نییە، ئاواش ناوەڕۆکێکی تایبەتی نییە. هەر بۆ نمونە دەکرێ نانێکی تیری، یان بازاڕی، یاخود سەموونێك بهێنی و سەموونەکە دوو لەت بکەیت. دوو/سێ هێلکە بشڵەقێنی و لەگەڵ هەندێ سەوزەی وردکراو، خوێ و کەوچکێ دۆشاوی تەماتە و سێ دڵۆپ گوڵاودا تێکەڵیان بکەیت. یەك پارچە سنگی مریشك، کە پێشتر کوڵابێ، یان سوورکرابێتەوە، ڕیشاڵڕیشاڵ بکە. (دەتوانیت سوود لە قارچك و گۆشتی سوور، یان گۆشتی قتوو، یان یەك دوو شفتەی وردکراو، وەربگری، بەمەرجێ پێشتر برژابن و ئاگریان بەرکەوتبێ). پاشان تاوەکەت چەور بکە و ئاگرێکی ئاسایی لەژێردا بکەرەوە.

نان، یان سەموونەکە بە کراوەیی و لەسەر پشت، بخەرە ناو تاوەکەوە و لێگەڕێ کەمێ ئاڵ ببێت. بەڵام نەیخۆیت و جارێ پەلە مەکە! ئەمجا هەوڵبدە تێکەڵەی هێلکە و سەوزە و دۆشاو و گوڵاوەکە، بە کەوچکێك و بەهێواشی بەسەردا بکە و نەهێڵی بەملاولای نانەکە و پارچە سەموونەکاندا بڕژێتە ناو تاوەکەوە. دوایەوە، سەرقاپەکەی لەسەر دابنێرەوە و بۆماوەیەك، هەتا تەواو گەرم دەبێ، لێیگەڕێ با نان و سەموونەکە، تێکەڵەکە بمژێ. پاشان هەوڵبدە ریشاڵی سنگە مریشکەکە، یاخود شفتە وردکراوەکە، یان هەر گۆشتێکی تر کە هەڵتبژاردووە، بەسەریدا بکە. دەبینی کە چۆن ئەم گۆشتە لەناو تێکەڵەی هێلکە و سەوزەکەدا دەنیشێ. (بۆ ئەوانەی گۆشتخۆر نین، دەتوانن لەجیاتی گۆشت، وردکراوی قارچك، یان ناوی باینجان بە ڕەندەکراوی بەکار بهێنن). بێگومان ئەگەر گۆشتەکە، یان قارچك و باینجانەکە بە گەرمی بەسەر نانەکەدا بکرێ، زووتر یارمەتی برژانی هێلکەکەش دەدات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بەخێرایی نانەکە، یان سەموونەکە هەڵگێڕیتەوە تاکو بەشی سەرەوەیشی ببرژێ. دوای کەمتر لە پێنج خولەك دەتوانیت ئاگرەکە بکوژێنیتەوە، چونکە نابێت بهێڵی زۆر وشك ببێتەوە و با کەمێ تەڕایی تێدا بمێنێ.. ئەگەر مەبەستت بێت دەتوانیت زەڵاتەیەکی سادەی بۆ دروستبکەیت و پەرداخێ دۆ، یان ماستاوی لەگەڵ بخۆیتەوە..

هەرئەوەندە ماوە لێت بپرسم: ئایا جاری پێشوو، خواردنی عاشقانەکەت دروستکرد؟ ئایا خۆشەویستەکەت هات؟ یاخود دروستتکرد و خراپ دەرچوو؟ لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا دەتوانیت ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێیت:

یەکەم: ئەگەر دروستتکردبێ و لەگەڵ خۆشەویستێ خواردبێتت، جارێکی دیکە دروستی نەکەیتەوە.

دووەم: ئەگەر دروستتکردبێ و خۆشەویستەکەت نەهاتبێ، بزانە کە لەکاتی پیاز جنینەکەدا گریاویت.

سێیەم: ئەگەر دروستتکردبێ و خراپ دەرچووبێ و خۆشەویستەکەشت نەهاتبێ، پێویستە قسە نەکەیت!

چوارەم: ئەگەر دروستتکردبێ و خراپ دەرچووبێت و خۆشەویستەکەشت هاتبێ، پێویستە داوای قەرەبووی مادیی خواردنەکەت لەم هەفتەنامەیە بکەیتەوە، چونکە ئەمانیش لەجیاتی ئەوەی وێنەی تەماتە لەگەڵ وتارەکەدا بڵاو بکەنەوە، وێنەی سێوێکیان بڵاوکردبۆوە!

پێنجەم: ئەگەر دروستتکردبێ و یار هاتبێ و تۆش لە پەلەپەلیان دەموزمانی خۆتت سووتاندبێ، دڵنیام عاشقێکی ڕاستەقینەیت.

بۆیە ناچارم لە هەفتەی داهاتوودا بیر لە خواردنێك بکەمەوە، کە تەواوکەری عەشق و پارێزەری شاعیرییەتی ژیانی ئێمەیە! بەڵام تا ئەوکاتە حەزدەکەم جارێکی دیکە دیوانی (لە غوربەتا)ی محەمەد عومەر عوسمان و چەند لاپەڕەیەك لە یاداشتەکانی (ئیحسان نووری پاشا)ی ڕابەری شۆڕشی (ئاگری داغ)، بخوێنیتەوە..

# خواردنیی هاوڕێکان

***کەسایەتی پەتاتە:***

بەڕاستی زۆرم بیر لە پەتاتە کردۆتەوە، لە مێژووەکەی و لەو ڕۆڵەی کە لەمێژوودا سەبارەت بە ژیانی مرۆڤ گێڕاویێتی.. ئێستا ئەگەر بڵێم: پەتاتە دەرمانی هەموو دەردانە، ڕەنگە زیادەڕۆیی پێوەبێ، بەڵام ئەگەر بڵێم: پەتاتە بۆ بەهێزکردنی توانای جنسیی مرۆڤ یەکاو یەکە، بۆ سبەی نرخی پەتاتە هێندە بەرزدەبێتەوە، مەگەر بەرپرسی سیاسی بیت، دەنا کیلۆیەکت بۆ ناکڕدرێ! هێندە هەیە لە ئێستادا خەڵکی ولاتی ئێمە پەتاتەخۆرێکی باش نین و تەنانەت پەتاتە وەك خواردنێکی نزم و بێفەڕ تەماشای دەکرێ و بە ژەمی هەژاران و پەنابەر و لێقەوماوان دەدرێتە قەڵەم. نەتەوە یەکگرتووەکانیش لەمەدا بێکاریگەر نەبووە و زۆرینەی خواردنەکانی ئەو ڕێکخراوە مەزنە لە ناو کەمپ و ئۆردووگای پەنابەراندا، پڕن لە پەتاتە: پەتاتەی کوڵاو، سوورکراوە، سوێرکراو، حەڵوای پەتاتە، قامکەپەتاتە (فینگەر) و هتد..

من گەرەکمە لەم زنجیرەیەدا، پەتاتە وەك خواردنی (هاوڕێکان) بخەمە ڕوو، چونکە لەو بڕوایەدام ئەمە باشترین بەهانەیە بۆ ڕەتکردنەوەی کۆی ئەو ڕوانگانەی کە پەتاتە وەکو خواردنێکی کەم بەها تەماشا دەکەن، جگە لەو هەوڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە دەیەوێ (برایەتی مرۆڤایەتی) لەڕێگەی خواردنی پەتاتەوە بخاتە ڕوو: (ئەگەر هەموو مرۆڤەکان پەتاتان بخۆن، دەبنە برای یەك!)، ئەوە هیچ هەوڵێکی دیکەم ئاگا لێنییە بۆ بەجیهانیکردنی ئەو ڕووەکەی پێدەچێت نیشتیمانێکی دیاریکراوی نەبێ.. لەلای من

پەتاتە زیاتر ڕەمزی هاوڕێیەتییە، نەك برایەتی. چەمکی برایەتی چەمکێکی ڕەگەزمەندە: (چونکە تەنیا نێرینەکان و هاوڕەگەزەکان دەتوانن برای یەکتر بن)، چەمکێکی مەرجدارە (چونکە پێویستە براکان هاوخوێن بن) و دواجار چەمکێکی سنووردارە (چونکە تەنیا هاوزمانەکان برای یەکترین). وەلێ هاوڕێیەتی بەوەدا کە بەرزترین و جوانترین پەیوەندیی نێوان مرۆییە و سنووری نێرایەتی و مێیایەتی و ڕەگەزیی نێوان مرۆڤەکان دەبەزێنێ، ئەوە بە هەژارانەترین خواردن تێردەبێ.

لەنێوان براکاندا هەمیشە شەڕی بردنەوە و دابەشکردن هەیە لەسەر زۆری و کەمیی بەشەکان و برای گەورە زۆر و برای بچووك کەمی بەردەکەوێ، برای گەورە هێزی سەندنی هەیە و برای بچووك توانای چاوەڕوانی و قەناعەتکردن بەو بەشەی بەریدەکەوێ. برای گەورە پەتاتەی گەورەی دەوێ و برای بچووك پەتاتەی بچکۆلەی دەدرێتێ.. پەندێکی سیوەیلایەتی هەیە دەڵێ: (عەزاب و نیعمەت بۆ براگەورە، کەباب و نازیش لەبۆ تاقانە، برابچووکیش: سەگوسەگبابە!)..

لۆژیکی هاوڕێیەتی دابەشکردنی تێدا نییە، هاوڕێکان لە هەموو شتێکدا هاوبەشن و ئەوان بەرلەوەی لەڕووی جەستەییەوە خۆیان تێر بکەن، لەڕووی مەعنەوییەوە پڕپڕ دەبن.. بەڵام لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵگای ئێمەدا و زۆرینەی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا، (کە ناعەدالەتی تیایاندا دەسەڵاتدارە و پارە و سەرمایە لەسەرووی هەموو شتێکی دیکەوەن و تەنانەت کاریگەرییشیان کردۆتە سەر پەیوەندیی هاوڕێیەتی)، پێویستە لە پێشدا خواردنەکەمان دروستبکەین و زگمان تێر بکەین، ئەمجا باس لە پەیوەندیی هاوڕێیانە بکەین.. پەیوەندیی هاوڕێیانە ئەو پردەیە لە نێوان پەیوەندی عاشقانە و پەیوەندیی شاعیرانەدا، جا ئەگەر تۆ خواردنی عاشقانە و خواردنی شاعیرانەت دروستکردبێ، بە ئاسانی تێدەگەیت بۆچی پێویستە شارەزای سازکردنی خواردنی هاوڕێیانەش ببیت. مرۆڤ هەروەکچۆن پێویستە لە ژیانی خۆیدا، عاشق و هەستیار بێت، ئاواش پێویستە ژیانێکی دۆستانە و هاوڕێیانە لەگەڵ کەسەکانی دەوروبەری خۆیدا دابمەزرێنێ. دەزانم تۆش بەدەست ئەوانەی ڕۆژگارێ بە هاوڕێی خۆت دەزانین،

عەزابت چەشتووە، وەلیٚ کەشفی گەورەی ژیان ئەوەیە مرۆڤ هەمان ئەو شتانە لەگەڵ ئەوانیتردا نەکات کە لەدژی خۆی کراون..

## مرۆڤ وەك پەتاتەخۆر:

مرۆڤ بەرلەوەی پەتاتە بخوات، شتی دیکەی لە شێوەی پەتاتەدا زۆر خواردووە و مێژووی سەرهەڵدانی پەتاتەش، لەچاو مێژووی سەرهەڵدانی مرۆڤ و مێژووی خواردنەکانی دیکەدا، بەراوورد ناکریٚ.. هێندە هەیە، پەتاتە یەکەمجار لە خۆرئاواوە دێتە خۆرهەڵاتەوە و وەك فرنان برۆدڵ دەبێژیٚ: چینییەکان کە ئەو هەموو داهێنراوانەی خۆیان بۆ خۆرئاوا ناردووە، کەچی بۆخۆیان تەنیا لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە پەتاتەی خۆرئاوایی ئاشنا دەبن و لەسەرەتایشەوە زۆری حەز لێناکەن.

حەزی لێبکەیت یان نا، پەتاتە بەزۆر شێوە دەخورێت و لە زۆربەی وەرزەکانیشدا دەستدەکەویٚ، ئەمە یەکەمین خەسڵەتی هاوبەشی پەتاتە و هاوڕێکانە: هاوڕێکانیش جۆربەجۆر و جیاوازن، بەڵام لەزۆربەی ئەو کاتانەدا کە ئێمە پێویستیمان پێیان هەیە، ئامادەن.. کەواتە هەر ئێستا بڕۆ چەند پەتاتەیەك، لەو پەتاتە قوڕاویی و لاخوارە خۆماڵیانە بهێنە و بە سیمای چڵکنیاندا تێمەکەوە، کە پڕن لە ڕۆحیی خاکی وڵات و دوایین دڵۆپەکانی باران و خۆری خۆشەویستی.. بڕۆ بەرهەمی ئەو ڕووەکە بهێنە کە لە سەدە دوورەکانەوە تا ئێستا وەك هاوڕێیەکی فریاگوزار و بە وەفا، چەندینجار مرۆڤایەتی، هەر لە ئیرلەنداوە بۆ پورتوگال و بۆ چین، لە برسێتی و قڕان ڕزگار کردووە.. پەتاتە هەر تەنیا خواردنی هەژاران نەبووە، بەڵکو خواردنێکی هاوڕێیانەش بووە، فەریادڕەسیٚ بووە لە کەنار بارودۆخە ناخۆشەکاندا، نەیهێشتووە مرۆڤ لەناو بچیٚ.

کوڵاندنی پەتاتە لە قەیتانێك ئاودا، زۆر ئاسانترە وەك لەوەی قابلەمەیەك نیوەکەین لە ئاو. بۆیە دوایئەوەی پەتاتەکان دەشۆیتەوە، بیانکەرە قابلەمەیەکەوە و کەمیٚ ئاوی تێبکەو سەرەکەی لەسەر دابنیٚ و ئاگرێکی ئاسایی بۆ دابگیرسێنە. ئەوجا بەردیٚ، یان

هەر شتێکی دیکەی لەسەر دابنێ با هەڵمەکە نەیەتە دەرەوە و زوو پەتاتەکانت بۆ بپیشێنێ. دەتوانیت ئەم میتۆدە بۆ زوو کوڵاندنی هەر شتێکی دیکەی وەك هێلکە، یان گەرمکردنەوەی خواردن، بەتایبەتی برنج، بەکار بهێنی و دوایئەوەی دەیخەیتە سەر ئاگر، کەمێ ئاوی پێدا بڕشێنە، تا بە هەڵمەکەی زوو گەرم ببێتەوە.

ئێستا پەتاتەکانت خستۆتە سەر ئاگر. کەواتە ئەم خۆراکانە حازرکە: پیازێك، هەندێ کەرەوز (تەڕ بێت، یان ووشك)، یەکدوو چڵ جاترە، زەردێنەی هێلکەیەك، یان دوان (بەپێی زۆریی پەتاتەکان)، لەوێچێ نانی هاڕدراو، یەك قتوو ماسیی شیلانە، لەتێ تەماتەی گەورە، چەند گەڵایەکی سلق، ئەگەر لەبەردەستدا بێت. کەوچکێ ڕۆنی ئاسایی، یان کەرە، کەوچکێ خوێ و چەند پارچە پەنیری چوارگۆشەی زەرد، وەکئەوەی لە خواردنی عاشقاندا بەکارمان هێنا.. کێشی هەموو ئەمانە دەکاتە (750) گرام و دەتوانیت لەگەڵ کیلۆ و نیوێك پەتاتە تێکەڵیان بکەیت.

سەرەتا پیازەکە لە ڕەندە بدە، بەڵام لەکاتی ڕەندەکردنیدا فوو لە دەستی خۆت بکە بۆئەوەی بۆنی پیازەکە چاوت پڕئاو نەکات. لە خواردنی عاشقانەدا، کەمێ باسی سیحرەکانی پیازم بۆ کردبوویت، بەڵام خۆت دەزانیت هاوڕێیەك بەچاوی فرمێسکاوییەوە ببینێ، یەکسەر خەمت بۆ دەخوات و بۆی هەیە وەکو تۆ دەستبکات بە گریان!

ڕەنگە ئێستا ئاوی پەتاتەکان وشکبووبێ، بۆیە پێویستە هەر بەسەری قابلەمەکە کەمێ ئاوی تری تێبکەیت و خێرا سەرەکەی بخەرەوە سەر. بەردەوامبە لە جنینی وردی تەماتەکەت. تەماتە بەهەمان شێوەی کە لەخواردنی عاشقانەدا، ڕۆڵی سەرەکیی هەبوو، لێرەدا نییەتی، بەڵام پێویستە هەبێ، چونکە بۆی هەیە پەیوەندیی هاوڕێیانە دواجار ببێتە پەیوەندییەکی عاشقانە و بەمەش خواردنی هاوڕێیانە دەبێتە پردێ لەنێوان هاوڕێکان و مرۆڤە عاشقەکاندا. ئەمجا بە وردی، کەرەوز، جاترە و گەڵا سلقەکان بجنە و بیانکەرە هەمان دەفرەوە کە تەماتە و پیازەکەت تێکردووە. لەپاش ئەوە زەردێنە هێلکەکە جیا بکەرەوە و بیکەرە ناو هەمان قاپەوە و بەو کەوچکەی ڕۆن و نانە

هاڕدراوەکەت تێکردووە، کەمێ تێکەڵیان بکە. پێدەچێ ئێستا پەتاتەکان تەواو پیشابن، بۆئەوەی لەمە دڵنیابیتەوە، ئاگرەکەیان کز بکە، نوکی چەقۆ دەمزبرەکەت بکە بە پەتاتەیەکدا، ئەگەر زانیت تەواو کوڵاون، ئاگرەکەیان بکوژێنەوە و یەکسەر ئاوێکی ساردیان پێدا بکە و دایانبنێ. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە قتووە ماسییەکە هەڵپچڕیت، ئەگەر ڕۆن، یان ئاوی تێدابوو بیڕێژە و گۆشتە ماسییەکە بکەرە ناو ئەو قاپەی شتەکانی دیکەت تێکردوون، ئەمجا هەوڵبدە بە کەوچکێکێک و بە هێواشی تێکەڵیان بکە تاکو گۆشتە ماسییەکە شییدەبێتەوە. لەپاش ئەوە پەتاتەکان یەکە یەکە لە ئاوەکە دەربهێنە و پاکیان بکە و هەر لەسەر ئەو تەختەیەی سەوزە و تەماتەکەت لەسەر جنیوە، بە چەقۆکە قاش قاشیان بکە با گەرمایی ناوەوەیان بڕوات. لەبیرتبێ ئەو هەڵمەی لە پەتاتەکانەوە بەرزدەبێتەوە، بەوێنەی ڕۆحی خاکێکی تینووە کە پاش باران و هەتاوکەوتن، عەردەکە جێدەهێڵێ.. بۆیە کاتێ تەواو ساردبوونەوە، هەوڵدە بە پشتی چنگاڵێك وردیان بکە و بیانهاڕە و بیانکەرە ناو هەمان قاپی شتەکانیترەوە. کەوچکێ خوێی تێکە و بەدەستی ڕاستت، بکەوەرە شێلانی وەکئەوەی بتەوێ شفتە دروستبکەیت. دەتوانیت کەمێ تۆزی سیر، لەگەڵ چەند دانە مێخەکیش بکەیتە ناوی.. پێویستە تا تۆ تێکەڵەکە دەشێلیت، حەکایەتی مێخەکت بۆ بگێڕمەوە..

### ***حەکایەتی مێخەك:***

*جارێك لە ڕیحانەیان پرسی: ڕیحانە، کاتێ دەچیت بۆ ئاهەنگی باران، چ بۆنێ لە خۆت دەدەی؟ ئەویش گوتی: مێخەك! لە مێخەکیشیان پرسی: ئەی تۆ ئەم هەموو بەرامەیە لەکوێوە دەهێنی؟ ئەویش زۆر بە دڵنیاییەوە گوتی: لە نەرمەعارەقی نێوان دوو مەمکی ژنەوە.. ئیتر لەو ڕۆژەوە پەتاتە وەسێتی کرد: (دوایئەوەی لە ژێر بۆنی خاکەوە دەمهێننەدەر، لەگەڵ هەموو کوڵاندنێکما، چەند مێخەکێ لەسەر تەرمەکەم دابنێن)..*

دەڵێن کاتێ وەنەوشە گوێی لەم وەسێتەی پەتاتە بوو، دۆعایکرد: (خودایە نە بەڵام

هێندە بەرزکەیت لە خاکەوە دوور کەومەوە و نەهێندەشم تەمەن بەیتێ کە بۆنەکەم لەپێش گەڵاکانمدا بمرێ)..

(گۆران)ی شاعیر هەموو جارێ کە ئەم حەکایەتەی دەگێڕایەوە، پەرۆشیی دایدەگرت و شیعرێکی دەنووسی پڕبوو لە بۆنی ژن و خامۆشیی وەنەوشە و حوزنی گەرمی خاك.. بەڵام دواجار ئەویش بێ هاوڕێ سەری نایەوە..

کەواتە پەلە لەسازکردنی خواردنی هاوڕێیانە بکە و لێگەڕێ با هەموو ئەو تێکەڵەیەی ئامادەت کردووە، بە ئەندازەی نزیکبوونەوە و بە ئەندازەی ئاوێتەبوونی هاوڕێکان لەگەڵ یەکتردا ئاوێتە بن، بەبێئەوەی هیچکامیان بۆن و ڕەنگ و تامی خۆیان بدۆڕێنن.. هاوڕێیەتی داوای توانەوەمان لێناکات، چونکە نایەوێ ئێمە سەربەخۆیی خۆمان بدۆڕێنین، وەلێ هاوڕێیەتی چاوەڕوانی وەفا و دڵنیایی و ڕاستگۆییمان لێدەکات، چاوەڕێی فیداکاری و نازکێشان.. **چی لەوە خۆشترە مرۆڤ تا دەمرێ لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەدا ژیان بەسەر بەرێ، کە وەکو پەتاتە و پیاز، وەکو گۆشتی ماسی و جاترە، بەوێنەی تەماتە و مێخەك لەکەنار یەکتردا سووربێتەوە و سەربەخۆیی خۆی، تامی خۆی و ڕەنگی خۆی لەدەست نەدات.** هاوڕێیەتی بۆخۆمانین وەك ئەوین، بەڵام ئەوین لەئێمە جیاوازە و ئەوەی لە هاوڕێیەتیدا ڕێز بۆ ئەو جیاوازییە دانەنێ، ناعەدالەتی کردووە، چونکە ئەرستۆ لە کتێبی هەشتەمی (ئەخلاقی نیکۆماخۆسی)دا گوتویەتی: لەهەر شوێنێ هاوڕێیەتی هەیە، پێویست بە عەدالەت ناکا.

بۆیە لێگەڕێن بە هەمان شێوەی کە لەتاوەی ئەزموونەکانی ژیاندا لەگەڵ هاوڕێکانمان دەبرژێین، تێکەڵەی ناو قاپەکە بەناو تاوەکەدا، کەپێشتر سێ کەوچك ڕۆنمان تێکردووە و داغ بووە، پان بکەینەوە و لێگەڕێین سوور بێتەوە و پاشانیش ئەمدیوەودیوێکی پێبکە با تەواو ببرژێ.. ببرژێ تا ئاڵ دەبێ و تا بۆنی خاك و ئاو و خۆری ولاتەکەت، لە بۆنی خواردنی هاوڕێیانەدا دەناسیتەوە.. دەتوانیت بۆ کەمکردنەوەی ئازارەکانی ئەو برژانە، لەسەر حیکمەتی مێخەك، جامێ ئاوی ترێ، کە بۆنی گەردنی سپی و ئازاری لووخواردووی مێوی لێدێ، لە گەرووی شووشە

ئازادکـەیت.. ئـازادی کـەیت لـەم سـەردەمەی خەریکـە لـە ناعەدالـەتیـدا بـواری پەیوەندییەکی هاوڕێیانەمان بۆ نامێنێتەوە.. ئێمـە نـەك هـەر بێبەشـین لـەو پەیوەندییـە گرنگەی مرۆڤ لەرێگەیەوە خۆی دەناسێ، بەڵکو عەدالـەتێکیش نییە جێگـەی بـەتاڵی پەیوەندیی هاوڕێیانەمان بۆ پڕ بکاتـەوە.. بـەڵام پێشـئەوەی خواردنەکـەت دابگـری و لەگەڵ هاوڕێکەتدا و بەدەم خەمی تووڕتی ترێوە نۆشیی بکەیت، کەمێ باسی ئەرسـتۆ و چـەند فەسلەسـووفێکی دیکـەت بـۆ دەکـەم، کـە بەبێئـەوەی هـەرگیز پەتاتـەیان خواردبێ، بە گرنگیپێدانەوە باسی پەیوەندیی هاوڕێیەتییان کردووە.

### ***فەلسەفە و پەتاتە:***

ئەرستۆ لە دوو بەشی کتێبێکی زۆر گرنگی خۆیدا کە تەرخانیکردووە بـۆ قسـەکردن لەسەر ئەخلاق، بە وردی قسان لەسەر هاوڕێیەتی دەکات. هاوڕێیەتی بۆ ئەرستۆ لـە عەدالـەت گـرنگترە و تەنانـەت لای وایـە عەدالـەتیش بـۆ کەسـی دادوەر جێگـەی هاوڕێیەتی ناگرێتەوە.. دادوەرەکانیش بۆ بەدەستهێنانی کامەرانی پێویستییان بە هاوڕێ هەیە.. هاوڕێیەتی پەیوەندییەکی نێوان مرۆییە کە نە لەپڕ و ئاسان بەدەست دێت و نـە بەخێرایی و هاکەزاییش لەناو دەچێ. خۆشیی و کامەرانییەك مرۆڤ لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەدەستی دەکەوێ، ئەزموونکردنی تەواوی ژیان و ئەوپەڕی دوورکەوتنەوەیە لە ترسی مەرگ. وەلێ ئەو ئازارانەی مرۆڤیش لـە ئـەنجامی تێکشـکانی پەیوەنـدیی و لـەکاتی لەدەستدانی هاوڕێکانیدا ئەزموونی دەکات، مردنێکی تەواوە..

ئەرستۆ، بەپێچەوانەی هەندێ بیروڕای دیکەیەوە، کە تیایدا فەزڵی یۆنانییەکان و مرۆڤی ئازاد و نێرینە دەدات بەسەر غەیرەیۆنانی و کۆیلە و مێینەدا، کاتێ قسان لەسەر پەیوەندیی هاوڕێیەتی دەکات، وەکئەوە وایە باس لە چارەنووسی هەموو ژیان و مرۆڤایەتی بکات: (*کەسێ کە گیرۆدەی غەریبی و تەنیایی بووە و پاش ماوەیەکی زۆر سەرلەنوێ مرۆڤێکی ئاشنا دەبینێتەوە، بەباشی هەست بەوەدەکات کە مرۆڤ چەندە لەگەڵ مرۆڤێکی دیکەدا خۆمانە و نزیکە. لەم هەستکردنەشدا نە جیاوازیی یۆنانی و*

*بێگانە کاریگەریی هەیە و نە جیاوازیی نێوان ئازاد و کۆیلە*). ئەم بیروڕا مرۆڤدۆست و یەکسانخوازانەیە لە هزری ئەرستۆدا درێژە بەخۆی نادات، بەڵکو لە هزری فەیلەسووفە ستۆیکەکان (ڕەواقییەکان)دا و بەتایبەتی لەسەر دەستی (سیسەرۆ 43–106 پ.ز) دەگاتە لوتکەی خۆی.

سیسەرۆ زۆر پابەند بوو بە هزری ڕەواقییەکانەوە و بەلای ئەوەوە ڕەواقییەکان ئەو هزرمەندانە بوون کە بەبێ هیچ سڵەمینەوە و ترسێ باسیان لە حیکمەتی چاکە و خراپە کردووە. ئەو بڕوای وابوو کە مرۆڤ، چ دەسەڵاتدار و چ بێدەسەڵات بێت، پێویستە ژیانێکی سەربەرزانە بژی و لەپێناوی دەستەبەرکردنی دادوەری و لەدژی نادادوەری کۆمەڵایەتی تێبکۆشێ. چونکە نادادوەری هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆی نییە و مرۆڤی نادادوەر مرۆڤێکە نەك هەر ئازا نییە، بەڵکو ترسەنۆکیشە: (*ئەگەر کەسێ نەیەوێ بە هەمان شێوەی کە لەپێناوی خۆیدا تێدەکۆشێ، لە پێناوی خەڵکیتریشدا تێبکۆشێ، ئەوە ناتوانێت بە خۆی بڵێت ئازا*). بێگومان مرۆڤێکیش ئازا نەبێت ئامادە نییە هیچ جۆرە خۆبەخشییەك لە پێناوی هاوڕێکانیدا بنوێنێ. بۆیە بەلای سیسەرۆوە هاوڕێیەتی هێزێکی کۆمەڵایەتیی گرنگە و هاوڕێیەتیەکی کامڵیش پێویستی بە ***هاوبیری*** هەیە. ئەوە شتێکی سرووشتی و فەرمانێکی سرووشتیشە کە هەموو بوونەوەرەکان لەسەر بنەمای (***هاوخوێنی، هاوئایینی، هاونەرێتی و هاویادوەری***)، تێکەڵیی لەنێوان خۆیاندا دروستبکەن. وەلێ ئەو پەیوەندیانە هەرچەندەش پتەو بن، ناتوانن لە گرنگیی پەیوەندی ***هاوڕێیانە*** کەمبکەنەوە. هاوڕێیەتی پەیوەندی نێوان مرۆڤە خاوەن فەزیلەت و ڕۆح پاکژەکانە. ئەو کاتەی ئێمە پاکژی و ڕاستگۆیی لە کەسێکدا بەدی دەکەین، ئیدی بەدەست خۆمان نییە و خۆشمان دەوێت. ئەوە ڕاستە کە هەرجۆرە چاکە و فەزیلەتێك سەرنجڕاکێشە، بەڵام چاکە و فەزیلەتی عەدالەتخوازانە و سنگفراوانی مرۆڤ، لە هەموویان شایانترە. جوانترین دیمەن ئەوکاتەیە کە مرۆیەکان لە چاکەکاری و میهرەبانیدا لێکتر بچن، چونکە لەنێوان کەسانێکدا کە هاوکارن و بەشدارن لە خۆشییەکانی یەکتردا، هەرکەسە بەهەمان ڕێژەی کەخودی خۆی خۆشدەوێ،

ئەوانیتریشی خۆشدەوێ. لەم ڕێگەیەشەوە، سیسەرۆ گەرەکییەتی پەیوەندیی هاوڕێیەتی بکاتە بناخە لەبۆ تەییارکردنی کۆمەڵگایەکی دادوەرانە و دەسەلاَتێکی دادپەروەر.. ئەگەر ئەم ئاواتەی سیسەرۆ بهاتبایەتە دی، بێگومان ئێستا لە هەموو کۆمەڵگاکاندا پەتاتە خواردنێکی سەرەکیی و پیرۆز دەبوو، وەلێ چوون ئەو بۆخۆی باش دەیزانی کە مرۆڤەکان، بەزەحمەت دەبنە هاوڕێی یەکتر، ئاواش بە زەحمەت حەزیان دەچێتە سەر پەتاتە خواردن.. ئێستاش دوایئەوەی ئەمدیواودیوی خواردنەکەت برژاوە، کاتی ئەوە هاتووە چەندپارچە پەنیرەکەی لەسەر دابنێی بۆ ئەوەی بەسەریدا بتوێتەوە..

یەکێکی دی لەو نووسەرانەی کە ئەگەری ئەوە هەیە پەتاتەخۆرێکی عەنتیکە بووبێ، ناوی (میشێل ئیکیم دی مۆنتنی)یە.. بە پێچەوانەی سیسەرۆوە، مۆنتنی (1533–1592) لە شاکارەکەیدا بەناوی (پەیگیرییەکان) و لە پەرەگرافی (13)دا، کاتێ باسی هاوڕێیەکی خۆیدەکات، پەیوەندیی هاوڕێیەتی وەك مەسەلەیەکی تایبەت و کەسیی پێناسە دەکات و هەڵیدەسەنگێنێ. ئەو دەبێژێ: (.. *لە قۆناغی هاوڕێیەتیدا، نەفسەکان بەجۆرێ لێکدی دەئاڵێن و بەجۆرێ ئاوێتەی یەکدی دەبن، ئیدی پەیوەستەگی خۆیان بەهەر شتێکی دیکەوە مەحوو دەکەنەوە و بۆیان نادۆزرێتەوە.. ئەگەر ناچارم بکەن تا بڵێم بۆ ئەو هاوڕێیەم خۆشویست، وا هەستدەکەم نەتوانم هۆکارەکەی بەیان بکەم، چونکە ئەو خۆی بوو، منیش، من*). مۆنتنی بەم گوتەیەی قامکی لەسەر خاڵێکی گرنگ داناوە: هاوڕێکان یەکتریان خۆشدەوێ، بەلاَم ڕەنگە نەتوانن هۆکارەکەی بڵێن. هۆکاری بوونە هاوڕێی کەسانی دیکە هەرچییەکیش بێت و ئەوان چەندەش ئاوێتەی یەکتر بن، سەربەخۆیی خۆیان لەدەستنادەن، چونکە ئێمە ئەوانیترمان خۆشدەوێ وەك خۆیان و ئەوانیش ئێمەیان خۆشدەوێ وەکئەوەی کە هەین.. لە درێژەی قسەکانیدا، مۆنتنی دان بەوەدا دەهێنێ کە نازانێت ئەو هێزە بەیاننەکراوە چییە کە دەبێتە هۆی یەکبوونی هاوڕێکان.. بەلاَم لەلای ئاشکرایە کە هاوڕێیەتی ئەو لەگەڵ هاوڕێکەیدا بەناوی (ئەتین دولابۆتی)، جگە لە خودی پەیوەندییەکەیان هیچ نمونە و سەرمەشقێکی دیکەی نەبووە و نەدەکرا ئەو پەیوەندییەی ئەوان جگە لەخۆی،

بەهیچ پێوەرێکی دیکە هەڵسەنگێنرێ: *(نازانم کامە جەوهەری ئەو هەموو تێکەڵبوونەیە کە ویستی ئێمەی لە مشتی خۆی نا و بە تینوێتییەکی چوونیەك و تامەزرۆییەکی دوو لایەنەوە، ڕاپێچی نغرۆبوون و مەحووبوونەوەی لەیەکتردا کردین. گوتم (مەحووبوونەوە) و ئەم قسەیەشم ناواقیعیانە نیە: هیچکامێ لە ئێمە شتێکی نەدەکردە هی خۆی، وەکئەوەی بەتەنیا تایبەت بێ بەخۆی، یان تایبەت بێ بە من.. ئەو خۆی بوو، منیش، من).*

کەواتە دەتوانین لەمبارەیەوە قسەی خۆمان بکەین. بەڵام بەر لەوە، تکا دەکەم ئاگری خواردنەکەت کە بۆی هەیە ئێستا پێدا سووتابێ، بکوژێنەوە..

من لەو بڕوایەدام، هەروەکچۆن پەتاتە لە خۆیەوە ناکوڵێ، ئاواش کەسەکان لە خۆیانەوە نابنە هاوڕێی یەکتر. کەواتە لە هاوڕێیەتیدا هەڵبژاردن هەیە و زۆر نییە، ئازادی هەیە و جەبر نییە.. مرۆڤ دەتوانێت بۆخۆی هاوڕێکانی هەڵبژێرێ، نەك ئەوانیتر خۆیانی بەسەردا بسەپێنن.. ئەمەش بەپێچەوانەی ناسیاوەتی و هەواڵێتییەوەیە، کە لە یەکەمیاندا ناچاریت لە ئاست ئەو کەسەدا کە ناسیوتە ڕەچاوی هەندی شت بکەیت کە بەدڵی خۆت نین و لە دووەمیشیاندا پێویستە قۆناغێك لەگەڵ ئەو کەسە هەڵکەیت کە بۆتە هەڤاڵت. دۆعا بکە ئەو قۆناغە زۆر درێژ نەبێتەوە و هەرگیز لەژێر سەقفێکدا پێکەوە نەژین، چونکە زۆرن ئەوانەی عومرێ لەگەڵت دەژین و شیعری هاوڕێیانەت پێشکەش دەکەن و هەرگیز نابنە هاوڕێی کەس.. ئەوان دەیانەوێ تۆ دزی و پۆخڵەواتەکانیان بشاریتەوە و نهێنییەکانیان بپارێزی و ڕۆژێکیش متمانەی ئەوە بەکەس ناکەن لەو هەموو کلیلی مەعریفە و میتافیزیقا و فەلسەفەی عیشقەی پێیانە دانەیەکیانت بدەنێ تاکو دەرگای ئاودەستێکیشیان پێبکەیتەوە.. ئەرێ بە ڕاست ئەو هەموو کلیلە نیشانەی ترسەنۆکی ئەوان نییە!

هاوڕێیەتی بریتیە لە پەیوەندییەکی دوولایەنەی درێژخایەنی خۆویستانەی نێوان دوو کەس، کە خۆی لە پەیوەندیی (ناسیاری) و (هاوەڵی) بەوەدا جیادەکاتەوە، تیایدا کرانەوەیەکی هەستەکی زۆرتر، نزیکی و بەرپرسیاری ئامادەیە. لە پەیوەندیی

ناسیاوەتیدا، ئەو کەسەی دەیناسین، ئەوەندە لێمانەوە نزیك نییە کە بتوانین لەتەکیدا کراوە بین و هەستەکانمانی بۆ دەربڕین، هەروەکوچۆن لە پەیوەندی هاوەڵیشدا، ئەو کەسەی دەبێتە هاوەڵمان بۆ ماوەیەك دەناسین و پاشان بۆی هەیە درەنگ، یان زوو لێکدی جیابینەوە. هاوڕێیەتی پەیوەندییەکی قووڵترە کە داوای وەفا، دڵنیایی و هەستکردنی باشتر و ڕێز و تا ئەندازەیەکیش نازکێشانمان، لەئاست یەکتردا لێدەکات. بێگومان هەموو ئەمانەش لە کەلتوورێکەوە بۆ کەلتوورێکی دیکە ڕێژەیین و ئەگەری گۆڕانیان هەیە.. بۆنموونە هەندێ لە کولتوورەکان بەپێچەوانەی پەیوەندیی خۆشەویستییەوە، ڕێگەنادەن لە پەیوەندیی هاوڕێیەتیدا هەستی ئیرۆتیکی بەرجەستە بێ، وەلێ خودی پەیوەندیی هاوڕێیەتی لە هەندێ کەلتووری دیکەدا ڕێگر نییە لەبەردەم پەیوەندیی سێکسیدا.

بەشێوەیەکی نموونەیی و ئایدیاڵ، هاوڕێیەتییەکان سنووری تەمەن، ڕەگەز، پشت، چین، سیما، حەزە تایبەتییەکان و بەهاکان دەبەزێنن. بۆی هەیە مرۆڤ، هاوڕێکەی لە خۆی گەنجتر و بەتەمەنتر بێت، بۆی هەیە نێر، یان مێ بێت و لە پشتەوە سەر بە نەتەوە و میللەتێکی دیکە بێ، جیاوازی چینایەتی، جوانی و ناشیرینی، ئایینی و خولیا فەردییەکان و بەها کولتوورییەکان نابنە ڕێگر لەبەردەم دروستبوونی پەیوەندیی هاوڕێیانەدا. وەلێ نموونەی ئەو پەیوەندیانەی لە واقیعدا دەیانبینین، بەزۆری لەنێوان کەسانێکدا دروستدەبن، کە هاوتەمەن، هاوپێگەی کۆمەڵایەتی، هاوحەز و سەلیقەی کەلتووری و مەتریاڵی و نزیکن لە جیهانبینی و بۆچوونی یەکترەوە.. لێگەڕێ ئەم بەشەی زنجیرەکەمان بە قسەیەکی لیژیك کۆلاکۆفسکی کۆتایی پێبهێنم کە گوتوویەتی: (ئەگەرچی ئاشکرایە، نابێ دەستی هاوڕێیەتی بخەینە دەستی هەر کەسێکەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بۆی هەیە تێڕوانینمان لە جیهان بەوجۆرە بێت، کە یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەکانمان لەگەڵ کەسەکان، پێویستە لە تێڕوانینێکی باشەوە بێت و سەبارەت بە ماهییەتی پەیوەندییەکەمان گەشبین بین. هەرچەندە ئەگەری ئەوە هەیە ئەم تێڕوانینە زوو لە بۆتەی ئەزموونەدا بتوێتەوە و تەنانەت بەرژەوەندییەکانیشمان

بخاته مەترسییەوە، وەلیّ بەشیّوەیەکی گشتی پەیڕەویکردن لەو ئامانجە لە ژیاندا، شتیّکی سوودبەخشە..).

لە کۆتاییدا، نامەویّت قسەی دڵی خۆمت لیّبشارمەوە: تۆ ئەزموونی تایبەتیت لە بواری هاوڕێیەتیدا هەرچییەك بیّت، چەندە تیّکیان شکاندبی، ئازاریان دابیت، بیّوەفا و سپڵە بووبن، دیارییەکانتیان بیرچووبیّتەوە، دوو ڕوو بووبن، کۆی بیرکردنەوە و هەوڵدانەکانیان بیّبەها کردبیت و ژیانی تۆیان وەك هەموو شتیّکی خۆیان تەزویر کردبیّ.، هیّشتا کاتیّ خەریکی دروستکردنی خواردنی هاوڕێیانەیت و ئەمیّستاش تامی خواردنی عاشقانە و شاعیرانەت لە بیّخی ددانندا مابیّ، پیّویستە بەر لەهەموو شتیّ لەگەڵ خۆشەویست و کەسانی دەوروبەرت و ژیانی خۆتدا، هاوڕێیانە مامەڵە بکەیت.. ئەمە دەڵیّم و دەشزانم کە لەکۆمەڵگای ئیّمەدا چیدی ناتوانین ناوی (دۆست) و (هاوڕێکان) بهیّنین، ئەگەر لەهەمان کاتیشدا ناوی (نەیار) و (دووژمن)ــەکانیشمان بە خەیاڵدا نەیەت. کەشفی گەورەی ژیان ئەوەیە مرۆڤ هەمان ئەو شتانە لەگەڵ ئەوانیتردا نەکات کە لەدژی خۆی کراون..

# زەڵاتەی حیکمەت

***(فەلسەفە) و (حیکمەت) لە ڕوانگەی زەڵاتەوە:***

بەوەدا کە فەیلەسووفەکان عەودالّن بەدوای حیکمەتدا، مانای ئەوەیە حیکمەت پلەیەك لەسەرووی فەلسەفە و حەکیمەکان کەمێ لە فەیلەسووفەکان داناترن. لە یۆنانی کۆندا فەیلەسووفەکان ئەو کەسانەبوون کە حیکمەتیان خۆشدەویست و دەیانویست ژیانێکی دانایانە بژین. ئەوان فەلسەفەیان وەك (زانستێك)، کە تایبەتمەندی خۆی و گوتارێکی تایبەتی هەیە، لە حیکمەت، وەك (شێوازەژیانێك) جیادەکردەوە و چاوەڕوانیان وابوو، فەلسەفە شێوازێکە لە ژیانکردنی حەکیمانە. بەم پێیەش دەبوو فەیلەسووف ئەو شێوەژیانە بژی کە هاوسەنگ بێت لەگەڵ ناوەڕۆکی فەلسەفەکەیدا. دەبوو گوتاری فەلسەفی، واتە ئەوەی فەیلەسووف وەك فەلسەفەیەکی تایبەت لەڕووی تیۆرییەوە دەیخستە ڕوو، پەیوەندییەکی تۆکمەی لەگەڵ شێوەی ژیانی خۆیدا هەبێ. فەلسەفە هەر تەنیا کەڵەکردنی زۆرترین زانیارییەکان، هەرتەنیا بەرهەمهێنان و کۆکردنەوەی تیۆرە و بنەماکان نەبوو لە گەنجینەی بیری فەیلەسووفدا، بەڵکو شێوازێکی ژیانکردنی پراکتیکیانەش بوو. فەیلەسووف بەوجۆرە دەژیا کە بیری لێدەکردەوە و بیرکردنەوەکانیشی بەرجەستەکەری ئەو ژیانەبوون کە ئەزموونی دەکرد. هەربۆیەشە زەڵاتەی فەلسەفی سوکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ، بە کلاسیکترین جۆری زەڵاتە و لەهەمانکاتیشدا خۆشترین جۆری زەڵاتە دەژمێردرێن. ئەوان کونجێکی ژیان و بوون نەماوە لەڕووی فەلسەفییەوە قسەی لەسەر نەکەن و

ئەزموونی نەکەن و دواجار لەناو دەفرێکی حەکیمانەدا داینەڕێژنەوە. کانت دەڵێ: (*بەساڵاچوویێك بۆ ئەفلاتوونی دەگێڕایەوە کە لە خولی خۆپارێزیدا بەشداریدەکات. ئەفلاتوونیش پێدەڵێ: ئەدی کەی ژیانێکی خۆپارێزانە دەستپێدەکەی؟ ناکرێ بەردەوام قسان بکەین، پێویستە ڕۆژێکیش قسەکانمان بکەین بە کردەوە*). وەك پییەر هادۆ (کە من لەمبارەیەوە زۆر شتی لێوەفێربووم) دەڵێت: (*بە بڕوای بیرمەندانی دێرین، فەیلەسووف لەبەر ڕەسەنایەتی و زۆریی ئەو گوتارە فەلسەفییانەی دایاندەهێنێ، یان تەفسیر و ڕاڤەیان دەکات، نابێتە فەیلەسووف، بەڵکو ئەوە شێوەژیانی ئەوە دەیکاتە فەیلەسووف. پێش هەرشتێ پێویستە خۆمان چاك بکەین و گوتاریش ئەوکاتە فەلسەفییە، کە ببێتە شێوازێکی ژیانکردن*). مەبەستی هادۆ ئەوەیە، ئەوەی فەیلەسووف دەکاتە فەیلەسووف قسەکردن نییە لەسەر جۆرەکانی زەلاتە، بەڵکو ئەوەیە کە بۆخۆی زەلاتەخۆربێت و زەلاتە وەك ژەمەخواردنێك بخاتە ناو خشتەی بیرکردنەوەکانی خۆیەوە.. هادۆ، بەدرێژایی کتێبێکی گەورە و پڕ لە وردەکاری بەناوی (*فەلسەفەی دێرین چییە؟*)، بەڵگەی ئەوە دەهێنێتەوە، کە فەلسەفە لە درێژەی مێژوویی خۆیدا، هەر لە پێش سوکراتەوە تاکو دیکارت و کانت و فەلسەفەکانی بوونخوازیی، جۆرێ لە پڕۆڤەکردن و ڕاهێنانی فەیلەسووفانەی مرۆڤ بووە بۆ گەیشتن بە ژیانێکی حەکیمانە.. بەم مانایەش بێت، ئێمە هەموومان دەتوانین پڕۆڤەی ژیانێکی ئەوتۆ بکەین کە لەسەر فەلسەفەیەك بەندە، بەبێئەوەی فەلسەفەمان لە قوتابخانە و زانکۆدا خوێندبێ و زانیارییە فەلسەفییەکانمان لە ئاستی زانیاریی فەیلەسووفەکاندا بن. حیکمەتی ژیان لەوەدا نییە کە بە پیشە و پسپۆڕی، فەیلەسووف و دانا بین، بەڵکو لەوەدایە کە ژیانمان ئەوەندە حەکیمانە بێت تا ئەوەی بیری لێدەکەینەوە، بکەینە ئەوەی کە ژیانی ئێمەیە و شایستەی ژیانکردنە. کانت پێیوابوو (مرۆڤ خاوەنی حیکمەت نییە وەلێ مەیلی هەیە بەلایدا و تەنیا دەتوانێ حیکمەتدۆست بێ و ئەمەش هەرگیز کۆتایی پێنایەت و جێگەی ستایشە.. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو خۆشەویستییەك لە کۆتاییدا کردارێکە.. تەنانەت خۆشەویستیش بۆ عەقڵی تیۆری مەرجدارە و بەبێ

بەکارهێنانی کردەییانەی، ناکامڵ دەبێت).. کەواتە هەموو گرنگیپێدانێکی تیۆریانە بە ژیان، دواجار دەبێت لەبواری ژیانکردنێکی کردەییانەدا ڕەنگبداتەوە. بەم مانایەش فەلسەفە ئاسانترین و لەهەمان کاتدا قورسترین خۆڕاهێنانە لەسەر ژیانێکی بێ ناکۆکی و بەدەر لە گرێ و گۆڵ.

وەلێ با بپرسین: ژیانێکی حەکیمانە چییە؟ ژیانێکی حەکیمانە ئەو ژیانەیە کە شایستەی مرۆڤە و بەدەر نییە لە فەلسەفەیەکی تایبەت کە ڕێنمایی مرۆڤ دەکات بۆ گەیشتن بە ئامانجە باشەکانی. ژیانێکی حەکیمانە ئەوەش دەگرێتەوە کە مرۆڤ چۆن بژی و پەیوەندییەکانی ڕێکبخات، چۆن بیربکاتەوە و بیرکردنەوەکانی لە ژیانی خۆیدا ڕەنگبدەنەوە و ئاراستەکەری ژیانەکەی بن. ئەوەش دەگرێتەوە چۆن لە پێناوی خۆی و ئەوانیتردا کار بکات و تێبکۆشێ و دواجار ئەوەش دەگرێتەوە چۆن ئەو ژیانە گفتوگۆیەکی بەردەوام بێت لەگەڵ خودی خۆی و ئەوانیتردا لەبارەی ئەوەی چۆن کار بکات و بخوات و بنوێ و پشوو بدات.. ژیانێکی حەکیمانە بریتییە لە ژیانێک بەدووربێ لە گرێوگۆڵ و گرژبوونەوە و ناکۆکی.. چونکە هەروەکچۆن ناکۆکی نێوان بیروڕا و شێوەی ژیانکردن، ژیان ئاڵۆز دەکات، ئاواش تێکەڵکردنی ئەو خواردنانەی لەگەڵ جەستەدا ناکۆکن، گەدەمان ماندوو دەکەن و شپرزەیی ڕۆحییمان بۆ دەهێنن. کەواتە ژیانێکی حەکیمانە بەدەر نییە لە بیرکردنەوە لە داهێنانی خواردنێکی حەکیمانە.

### *زەڵاتە وەك یەکەمین خواردن:*

ئەگەر حیکمەتی ژیان ئەوەبێ کە ناکۆکی لەنێوان بیرکردنەوە و کرداردا، لەنێوان تیۆرە و پراکتیدا کەمبکاتەوە، ئەوە خواردنێکی حەکیمانە هیچ نییە لە تێکەڵکردنی ئەو خۆراکانەی گەدەمان ماندوو ناکەن و ژیانمان ناشێوێنن. زەڵاتە نموونەی ئەو خواردنەیە کە ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەیەکی حەکیمانەیە لە ژیان.

کاتێ دوور، دوور بۆ ژیانی مرۆڤ دەڕوانین لەناو سرووشتدا، دەبینین و بەڵگە مێژووییەکانیش ئەوە دەسەلمێنن کە زەڵاتە یەکەمین جۆری خواردنە بۆ مرۆڤ.. ژیانی مرۆڤ لە سەرەتای سەرەتاوە، پێکهاتەیەکی زەڵاتەیی هەیە: (*لەسەرەتاوە، زەڵاتە هەبوو*)، بەڵام زەڵاتە بەو مانایە نا کە ئەمڕۆ ئێمە تێیدەگەین و تەنیا بەمانای (تێکەڵکردن) دێتەوە بیرمان. تێکەڵکردنی خۆراکەکان بەتەنیا نابێتە زەڵاتە و هەرگیز ناشبێتە زەڵاتەیەکی حەکیمانە. بەڵکو پێویستە ئەو تێکەڵکردنە بەئاراستەی دوورخستنەوەی جەستە و پارێزگاریکردنی ژیان بێت لە ناکۆکییەکان و ئەو شتانەی دەیشێوێنن.

لە ڕیوایەتە ئایینییەکاندا، یەکەم مرۆڤ کە بوونێکی شێوە فریشتەییانەی هەیە، خواردنی ئەو خۆراکانەی لێقەدەغە دەکرێ کە فریشتەکان نابێ بیخۆن.. گەدەی فریشتەییانەی مرۆڤ، نابێت ئەو خۆراکانەی تێبکرێت کە خۆراکی فریشتە نین، چونکە بەوە مرۆڤ لە فریشتایەتی خۆی دەکەوێ و ناکۆکیی دەکەوێتە نێوان بوونی و ژیانییەوە. بوونی ئەو، وەکئەوەی یەزدان بیری لێکردۆتەوە و بڕیاری لەسەر داوە، نابێت ناکۆك بێت لەگەڵ ژیانی ئەو، کە لەکردەوەکانیدا ڕەنگدەداتەوە. بەوەی ئادەم ئاگاداری ئەم حیکمەتەی یەزدان نییە و ئیبلیس ئەم هەلە، هەم لە دژی ئیرادەی یەزدان و هەم لە دژی ئادەم، دەقۆزێتەوە و خۆراکێ بە ئادەم دەخوات کە لێی یاساخکراوە، لە فەزای بەهەشتی دەکرێتە دەرەوە. ئەگەرچی ئەو خۆراکە بەپێی ڕیوایەتە جۆربەجۆرەکان، لە میوە و ڕووەك و دانەوێڵە بەدەر نییە، واتە لە جنسی بەرهەمە سرووشتییەکانە. بەهەرحاڵ، ئێمە لەمەوە تێدەگەین کە بوونەوەرێکی ئاسمانیی وەکو ئادەم نابێ ئەو میوەیە بخوات. کەچی دەیخوات و بەمەش یەزدان لە ئادەم تووڕە دەبێ و لە هەڵقەی ئەندامانی سەرکردایەتی دەیکاتە دەرەوە، چونکە بەگوێی تەکتوولچییەکی وەك ئیبلیسی کردووە.. لەڕاستیدا ئادەم هیچ ناکات لەوە زیاتر کە قەدەری مرۆڤانەی خۆی هەڵدەبژێرێ و ژیانی خۆی لەسەر زەوی دروستدەکات، نەك لە ئاسمان. ئادەم نەیدەتوانی بە بوونێکی فریشتەییانەوە ژیانێکی مرۆییانە بژی، ئەوە ژیانی ئەوی دەکردە

زەلاتەیەکی بێتام و نەگونجاو.. ئەو نەیدەتوانی لەگەڵ خۆی ناکۆك بێت و نەیدەتوانی ئەو شتەی نەوێت و نەیخوات کە بیری لێدەکاتەوە. حیکمەتی یەزدان لەمە تێدەگات، بۆیە شانسێکی دیکە دەداتەوە بە ئادەم: ئەوەی یەکەمین مرۆڤ لە ئاسمانەکان لێیدەسەنرێتەوە، لە ئامێزی سرووشتدا و لەسەر زەوی بە مرۆڤایەتی دەبەخشرێتەوە. مرۆڤ دەیەوێ ژیانی خۆی بژی وەکئەوەی بۆخۆی بیری لێدەکاتەوە، ئەو بیر دەکاتەوە کە دەبێ بخوات، دەبێ ئەو بەرهەمە سرووشتییە بخوات کە لێیقەدەغە کراوە، کەواتە دەبێ لە ئاسمانەوە بێتەخوار بۆسەر زەوی و بۆ ئەمەش سەرپێچی لە فەرمانی یەزدان دەکات، تاکو بەپێی فەرمانی سرووشتیی ڕاستەقینەی خۆی بژی. یەزدان لەمەدا هێمنانە مامەڵە دەکات، ئادەم لە قەڵەمڕەوی ئاسمانی وەدەردەنێ، بەلام هەموو ئیمکانییەت و شانسەکانی لێناستێنێتەوە. لایەنگری لە سرووشتی مرۆییانەی ئادەم دەکات، نەك سووربوونی لەسەر سزاکەی خۆی و فەرزکردنی ئیرادەی یەزدانیانە.. بۆیە ئادەم ئەگەر بیەوێ دەتوانێ بەهەشتی خۆی لەسەر زەوی دروستبکات، یەزدان لەمەشدا هاوکاریی دەکات، بەلام سرووشتی مرۆڤانەی ئادەم ناچاری دەکات ژیانی خۆی بژی و دروستیبکات: تازە ئەو یەکەمین مرۆڤە مانیگرتووە و لە (قاپە سوورەکەدا نەبێت)، ناخوات! لەدوای ئەم قوربانیدانەی ئادەم بە ڕۆحی فریشتەییانەی خۆی لەپێناوی گەدەی خۆیدا، یەکەمین خواردنێ، لە ناندێنی سرووشتدا چاوەڕێی مرۆڤ دەکات، ئەو خۆراکە سرووشتیانەن کە مرۆڤ بە چاولێکەری و لاساییکردنەوەی ئەو ئاژەلانەی کە پاشان دەبنە هاوەڵی و دەستەمۆیان دەکات، دەیانخوات. ئاژەڵ چی دەخوات؟ بێگومان زەلاتەی سرووشت: پنجی سەوزایی و پەلکی داران، میوەی وەریوی درەختان، قارچك و کەنگر و ڕەگی ناسکی گژوگیا، پیچکە و کوڕایە و ئاڵەکۆك، پەڵپینە، سێپەڕە، پنگەڵە، ڕێواس، حاجیلە، ڕازیانە، گوێکی نزاران، خونچەی نەپشکووتووی نەمامان و دەیان و سەدان خۆراکی نەرم و تەڕاوی دی کە مرۆڤ لەناو قاپی گەدەی خۆیدا تێکەڵیان دەکات. بەم پێیەش پێدەچێ بۆ نمونە: بزن یەکەمین مامۆستای مرۆڤ بووبێ لەبواری خواردنی ئەو خۆراکانەدا کە لەبەرزاییەوە

بەدەستیهێناون، چونکە بزن مەهارەتێکی باشی لەسەرکەوتن بەسەر تاشەبەرد و لقی باریکی درەختاندا، هەیە.. دووەمین مامۆستایشی لە بواری ئەو خۆراکانەی لە عەردێرا کۆیکردوونەتەوە، پێدەچێ کەر بووبێ، چونکە کەریش بەهۆی ددانە سپی و گەورە و لچ ولێوە نەرم و پانەکانییەوە، پسپۆڕە لەبواری ڕنینەوەی پنجی گیا و خواردنی گۆپکی دڕکدا، بەبێئەوەی چقڵەکانی بەدەمیدا بچن.

مرۆڤ ئەگەر لەکاتی لەوەڕینی ئەم گیاندارەدا، بۆنمونە لەکاتی خواردنی گۆپکەی ڕووەکێکی دڕکاویدا (چقڵەکەرتەشی)، لە دیققەت و مەهارەتەکەی وردبێتەوە، بۆی دەردەکەوێ: کەر، بەپێچەوانەی شارەوانییەوە، هیچ هەنگاوێك نانێ بەبێئەوەی حسابی وردی بۆ نەکات و پلانی تایبەتی بۆدانەنێ. خۆ ئەگەر مرۆڤ ئەم دیمەنە بەراوورد بکات بە خۆی کاتێ گوڵ لێدەکاتەوە و زۆربەی جاران چقڵێ دەچێ بە پەنجەکانیدا، ئەوە پێویستە لە ئاست ئەو حوکمە پێشینانەی بەسەر کەریدا داون، بەخۆیدا بچێتەوە. بەخۆداچوونەوەش بەشێکە لە ژیانێکی حەکیمانە..

هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە بیسەلمێنێ، مرۆڤ هەتاکو زەڵاتەی سرووشتی خواردبێ، هەرگیز دووچاری نەخۆشییەکانی وەك برینداربوونی گەدە، پێچ بە سکداهاتن، قەبزی و پێچەوانەکەی، یان دڵپڕی و ڕشانەوە و زەردهێنانەوە بووبێ..

وەلێ بەڵگە زۆرن لەسەر ئەوەی لەوکاتەوە مرۆڤ کەوتە لاساییکردنەوەی دڕندان و خۆی فێری گۆشتخواردن کرد و لە پێناوی ئەمەدا جەنگەکانی بەرپاکردن، هارمۆنی و گونجانی جەستەیی خۆی لەدەستدا و هەر ڕۆژە بە ئازارێکەوە تلایەوە. بۆ تێگەیشتنی زیاتر لەو ڕاستییەی کە پێماندەڵێ مرۆڤ لە ئاستی ڕەگەزیانەی خۆیدا (فیلۆگینی)، تا ئەوکاتەی زەڵاتەی سرووشتی خواردووە، حەکیمانە لە هاوسەنگیدا ژیاوە، پێویستە بڕوانینە ئاستی تاکەکەسیانەی (ئۆنتۆگینی) ژیانی مرۆڤ. منداڵ، وەك بزن، لەسەرەتای لەدایکبوونییەوە تا قۆناغێکی باشی تەمەنی خۆی شیر و شلەمەنییەکان و بابەتی گیایی دەخوات و گەدەی کاری سرووشتی خۆیدەکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەی منداڵ فێری (چزە)ی برژاو و گۆشتی سوورخواردن و برنج و فاسۆلیای چەور دەکرێ و دایکان

و باوکان پێیانوایە ئەگەر ئێسقانێ نەگرێ بە دەمییەوە، ددانــەکانی دەرنایــەن، منداڵــە فێرکە دەیگرێ. دوایئەوەش قوونی دەسووتێتەوە و پاشانیش ئاوی لـەلـەشـدا نامێنــێ و هتد.. هەموو ئەمەش لـەبەرئەوەی ئێمە ناهێڵین منداڵ بە شێوەیەکی سرووشـتیانە، لــە سرووشت جیابێتەوە و دەمانەوێ هەرچی زووترە، بەو خۆراکانەی بۆخۆمان دەیانخۆین و حەزیان لـێدەکەین، ئەوانیش (کولتـووریزە) بکـەین.. هـەموو کولتووریزەکردنــێ، ئەگەر لـەگەڵ ئەو ئیقاعە سرووشتییەدا وێکنەهاتەوە، کـە مـرۆڤ پێویسـتی پێیــەتی بـۆ ژیانێکی حەکیمانە، باجی قوورسی خۆی دەوێ..

بەودیوی تردا، کاتێ دەڕوانینە گەشەی ڕەگەزیانەی مرۆڤ بـۆ ئـەوەی لــە سرووشــتی تاکەکەسیانەی باشتر تێبگەین، بۆمان دەردەکەوێ هەتا مرۆڤ لــە زەلاتــەی سرووشــت دوورکەوتبێتەوە، حیکمەتی ژیانی خۆی لـەدەستداوە و دڕنـدەتر و تێرنـەخۆرتر بـووە. وەکـو فرنــان بــرۆدل ڕوونیدەکاتــەوە، تــاکو پــێش ســەدەی شــازدەیەم، واتــە دوای سەفەرەکەی کۆلۆمبۆس، (*خـواردن و مەتبـەخێکی ئـاڵۆز و شـلووق لــە ئـەورووپادا نەبووە*). لـەو سەدەیە بەدواوە، مرۆڤایــەتی حیکمــەتی ژیــانی خـۆی لـەســەر سـفرەی گۆشتخواردن دەدۆڕێنێ، بەجۆرێ کە ناوی ئـەو باڵنــدە و ئاژەڵانــەی لـەســەر سـفرە دەکرانە خۆراك، چـۆڵبوونی جەنگـەڵ و دارسـتان و دوورگـەکانمان لــە گیانـداران، دەهێنێتەوە پێشچاو!. وەك برۆدڵ لـە سەرچاوەیەکەوە کە ساڵی (1393) نووسـراوە، دەیخاتەوە بیرمان، هەر ژەمێ خواردن لـەم خۆراکانە پێکهاتووە: (پارچەیەك گۆشتی گا، ماسی، مارماسی، دوو جۆر شلـەی گۆشت، سوپی ماسی) و هتد. پاشـان وەك مـۆنتنی لــە ســاڵی (1580)دا دەنووســێ، لــە ســاڵۆنەکانی نانخواردنـدا، گۆشــت بێئەنـدازە دادەنرا: گۆشتی گا، مەڕ، بەراز، مایین، کۆتر، بزن و نێری. (ڕابڵـە)ش، سەبارەت بـە جۆری باڵندە ڕاوکراوەکـان لیسـتێکی سەرنجڕاکێشـی دروسـتکردووە، کـە هەنـدێ باڵندەی وەکو (لـەقلـەق، قورینگ، ماسیخۆرە، کەو، کۆترەکێوی، قومری، قرژاڵکـە، قەلـەباچکە، فلامینگۆ..) و چەندانیتر دەگرێتەوە. هـەموو ئەمانــەش هاوکـات لـەســەر

سفره ئامادەبوون!. ئەو ساڵانە، چەندە ساڵانی لەدەستدانی حیکمەتن لە ژیانی مرۆڤدا، ئەوەندەش ساڵانی بەپەراوێزبوونی زەڵاتەن لەسەر سفره.

مرۆڤ لە سەدەی شازدەهەم بەدواوە، بە تێپەڕین بە داگیرکاری و قۆناغی کۆلۆنیالیزمدا و لەوێشەوە بۆ شۆڕشی پیشەسازی و پاشان بۆ سەدەی نۆزدەهەم، ناوبەناو ئەوەندە لە گۆشتخۆریدا نغرۆ بووە، ناچار لەسەدەی بیستەمدا دەردی هاریی دەیگرێ و دوو جەنگی ئەوەندە مەزن وماڵوێرانکەر بەرپا دەکات، کە بۆنی ڕەشی دڕندەیی زاڵدەبێت بەسەر حیکمەتی سەوزی سرووشتیدا. نمونەی بەرز لەبەردەم مرۆڤدا چیدی تێگەیشتن نییە لە ڕازی جیهان و هارمۆنیای سرووشت، بەڵکو تازە وەکو ئەدگار مۆرن دەڵێ بریتیە لە (*داهێنانی بیرۆکەی دەسەڵاتگرتن بەسەر سرووشتدا، کە ئەمەش هەر بیرکردنەوەیەکی حەکیمانەی خستۆتە لاوە*). ئیدی بەم پێیەش، یەکەمین خواردنی ئادەمیانە، لەبیری مرۆڤایەتی دەچێتەوە و چیدی زەڵاتە و خۆراکە میوەیی و ڕووەکییەکان خواردنی سەرەکیی مرۆڤ نین و زیاتر دەبنە خۆراکێکی تەشریفاتی و لۆکسی و نومایشکارانەی سەر سفره.. وەکئەوەی مرۆڤایەتی بیەوێ بە باوکە ئادەم بڵێ: چۆن تۆ لە پێناوی زەڵاتەی حیکمەتدا لە دروستکەری خۆت یاخیبوویت، ئاواش ئێمە لەو یەکەمین خواردنە یاخی دەبین کە تۆ لە پێناویدا بەهەشتت جێهێشت..

مرۆڤی هاوچەرخ، بەوهۆیەوە کە لە حیکمەتی ژیان دوورکەوتۆتەوە، تازە نازانێ چۆن سوود لە چێژەکانی ژیان وەربگرێ و ئەمەش وایکردووە تەسلیمی تەماعەکانی ژیان بێ.. لەم نێوانەدایە کە زەڵاتە وەك خواردنێکی سرووشتی و وەك یەکەمین خواردن، شوێنی خۆی بۆ ئەو خواردنانە چۆڵدەکات کە هەرگیز جێگەی زەڵاتە بۆ مرۆڤ ناگرنەوە. ئەمڕۆ لە چێشتخانە بەناو مۆدێرنەکانی ئێمەدا، داوای زەڵاتەیەك بکەیت، لە خەیار و تەماتە و هەندێ جار پیاز و بیبەر زیاتر، هیچیترت بۆ ناهێنن. فەنتازیای خواردنی چێشتخانەکانی ئێمە ئەوەندە لاوازە، نەك هەر خۆیان بەستۆتەوە بە تەنیا خواردنی دووبارەوەبووی پیرۆزەوە: (برنج و فاسۆلیا و گۆشتی چەور)، بەڵکو

تەنانەت نەیانتوانی لەو هەموو سەوزاییەی کوردستان نمونەی زەڵاتەیەکی خۆماڵی بروەوپێدەن. ئەمڕۆ لەنێو هیچ شارێکی ئەم مەڵبەندەدا، یەك چێشتخانەت دەستناکەوێ تایبەتمەندی لە خواردنە گیاییەکاندا هەبێ و تەندوورێکی تێدابێ، تا لەگەڵ قاپێ زەڵاتەدا کولێرەیەك و جامێ دۆت بۆ دابنێ، بەتۆزێ قەزوان و تۆراخەوە. بۆیە ئەوە هەڵوێستێکی نەك هەر تەندروستییە، بەڵکو هەڵوێستێکی ئەخلاقیشە، مرۆڤ بە یادی باوباپیرانی خۆیەوە جاروبار ئەو خۆراکانە بخوات کە ئەوان بەر لەچوونیان بۆ شەڕوبەرگریکردن لە داگیرکاران، بەر لە ململانێ لەگەڵ دەسەڵاتی وەرزەکاندا، دەیانخواردن.. ئەگەر ئەو کەسەی ئەمڕۆ لە ڕیستۆرانت و چێشتخانەکانی ئێمەدا دادەنیشێ و پێیوایە ئەوەی دەیخوات پاكوخاوێنتر و تەندروستانەتر و بەسوودترە لەوەی باوباپیرانمان دەیانخوارد، زۆر بەهەڵەدا چووە.. چونکە هیچ نەبێ ئەوان لەپێش بەدەستهێنانی خواردنە سادەکانیاندا، زەحمەت و ڕەنجیان دەکێشا و لەدوای خواردنیشیان دەکەوتنەوە کارکردن بۆ دروستکردنی ئەم وڵاتە.. کەچی ئێمە لەپێشخواردنەکانەوە بچووك بووینەتەوە بۆ بوونەوەرێکی برسی و کە زۆریشی تێدەپێچین، یەکسەر خەومان لێدەکەوێ..

### *(مایۆنیز) ژەهری زەڵاتە:*

داگیرکاری هەر یەك شێوەی نییە.. ئەمڕۆ کۆمەڵگای ئێمە جۆرێکی دیکەی داگیرکاری ئەزموونەدەکات کە پێشینەی نەبووە: جگەرەکێشان و مایۆنیزخواردن!.. یەکەمیان تایبەتە بە پیاوان و دووەمیشیان بە ژنان.. ئەمڕۆ هەروەکچۆن دەگمەنن ئەو ڕیستۆرانت و خواردنگانەی جگەرەکێشانیان تێدا قەدەغەکراوە، یان شوێنی تایبەتییان بۆ جیاکراوەتەوە، ئاواش دەگمەنن ئەو زەڵاتانەی لەوێدا بەبێ مایۆنیز نەخرێنە بەردەممان.. لەوەش ترسناکتر ئەوەیە مایۆنیز، نەك هەر لە سۆپەرمارکێتەکانی ئێمەدا، بەڵکو لە ڕیستۆرانت و پیتزاخانە و لە زۆربەی ماڵی کوردیدا، ئامادەییەکی بەرچاوی هەیە. ژەم نییە جۆرێ زەڵاتەت نەخەنە بەردەم کە پڕە لە ژەهری مایۆنیز..

ئەم ژەهرە سپییە بەتامە، زۆرترین ڕەفەی داگیرکردووە و دەبێ هەمیشەش ئاگامان لە ڕێکەوتی بەسەرچوونەکەی بێت.. ئەم ژەهرە نوێیە جگە لەوەی خۆی وەکو یەکێ لە داهێنانە تازەکانی کارگەی لە قتووکردن دەخاتە ڕوو، ئاواش لەناو خانەکانی لەشماندا جێگیر دەبێ و لەشێوەی چەوراییەکی خەستدا، بۆ هەمیشە داگیرمان دەکات.. بگرە داگیری کردووین و ئەم زبڵەی لە وڵاتانی دراوسێوە دەرخواردی ئێمە دەدرێ، لە حاڵی حازردا کاریگەری و نیشانەکانی بە جەستەی گەنجانی ئێمەوە، بە کچ و کوڕەوە بەدیار کەوتوون. مایۆنیز، ئەمڕۆ لە کەلتووری خواردنی ئێمەدا بە جۆرێ شوێنی خۆی کردۆتەوە، ئەگەر مرۆڤ ڕۆژی جارێك نەیخوات، وادەزانێ بە هەتیوی گەورە بووە. ئەم نەوەی مایۆنیزخۆرە، ڕۆژگارێکی سەختی لەبەردەمدایە بۆ ئەوەی لە هۆڵە وەرزشی و مەلەوانگەکاندا عارەقێکی زۆر بڕێژێ، نەك لەپێناوی نیشتیماندا، بەڵکو لەپێناوی دابەزاندنی کێشی خۆیدا..

ژیانێکی حەکیمانە خۆبەدوورگرتن نییە لە چێژەکانی ژیان، بەڵکو بەدەستهێنانی دانایيە بۆ سوودوەرگرتن لەو چێژانەی ژیان پێمانی دەبەخشێ.. کەواتە هیچ نەبێ جاروبار، بە ڕۆحییەتی بزنەوە، هەوڵبدە زەڵاتەیەك دروستبکە و وەك ژەمێکی تەواو، بە نانێکەوە بیخۆ.. حیکمەتی زەڵاتە لەوەدا نییە کە تێرمان دەکات، یان نا، بەڵکو لەنموونەی ئەو سادەیی و هەڵکردن و گونجانەدایە کە دەیهێنێتەوە بیرمان.. هیچ لەوە جوانتر نییە لە پێکەوە هەڵکردنی دانەی وەریوی هەنار و پەڕی ناسکی کاهوو، لە ئەڵقەی کەفداری پیاز و فێنکایەتی خەیارەوە، لە نازی وردی شویت و بۆنی شینکایی کەرەوەز و بەزەڕوو (تەڕەتیزە) و لە فراوانی باڵی کەلەم و ڕەنگی شەرمنی تەماتەوە، لە شێداریی بیبەر و خرمەی هەناسەی ترۆزی و گێزەرەوە، (پێکەوە هەڵکردن) و (پێکەوەگونجان) و (تەبابوون)مان بیرکەوێتەوە، لەم قاپە گەوەرەیەدا کە قاپی گەورەی ژیان و بوونە لەناو جیاوازییەکاندا. بەڕاستی زەڵاتەی حیکمەت فێرماندەکات لەگەڵ خۆماندا بە ئاشتی بژین، ئەوەندە لووتبەرز و خۆبەشتزان نەبین.. لەبەر ئەوەی خەڵکی پێمان نەڵێن چاوچنۆك و ڕەزیل، گۆشتخواردن نەکەینە بتێك و بیپەرستین..

## خودایە بۆ نەتکردم بە قۆخ فرۆش؟!

سادەبین لە ژیاندا وەك پەڕی سەوزی کاهوو
وەك گوارەی شۆڕی شویت،
بەوێنەی سنگی پانی گەڵای سلق..
جاروبار یادی شاتوو بکەینەوە لەکەنار سێوی ترشدا،
ترۆزی ئەوەندە گران نەکەین، کرم لێیدا..
پەنجەکانت ڕابێنە با کراسی سپیی کەلەم بکاتەوە،
(کاتێ بە لێو دەخورێ کەلەم،
چ پێویستیمان بە کارد هەیە بۆ جنین!؟)
هیچ چارەیەك نییە، ئەمجارەیان ڕێواس بێتەوە،
دەبێ تا ئەوسەری بەهار بچین بەپیرییەوە..
هیچ چارەیەك نییە، ڕۆژگارێ دێ،
سووجدە بۆ تووی فەرەنگی دەبەین
دڵنیام ساتێك لە ژیاندا هەیە
بەئاواتەوەین ڕەسمێ بگرین لەگەڵ هەنار..

ڕۆژگارێ تێدەگەین بۆچی تەڕەتیزە لە گریاندا تیژ بووە،
مەعلوومە ئەگەر کابرای عەرەبانچی بۆنیدەکرد،
نەعنای نەدەفرۆشت بە پارە،
هاواری نەدەکرد: (وەرنەوە بۆ جاترە، ئەوەیە ڕازیانە)..

ئەوەیە ژیان کە پڕیکەین لە حیکمەتی شیرینی کاڵەك،
لە پرسیارە گەورەکانی شەمامە.
ئەوەیە ژیان،
کە لە گۆپکەی مێوەوە هەست بە سەرخۆشیی ترێ بکەی
ساوەر نەخۆی بەبێ پیاز
ئەوەیە ژیان، کە بە تامەزرۆیی بزنەوە دایڕنی گەڵامێو،
بەسەر دڕکدا شاڵاو بەری بۆ تووتڕك
یەکجار خەیار و پەنیر بکەیتە بابۆڵە،
هەناسەت دەبێتە عەتر!
یەکجار هێلکە و شویت پێکەوە بخۆیت،
پاشایت!

دەترسم ژیان بتکوژێ و بۆنت نەکردبێ بە دارچینەوە!
دەترسم قەبرەکەت پڕنەبێ لە نووری گوڵەبەڕۆژە
تا پێشمردن، درەنگ نییە بۆ خواردنی کولێرە و شووتی،
هەتا جەڵتە، کاتت ماوە بۆ بۆنکردنی بیبەری سەوز
تا کوژانەوەی کارەبا، هەلێکی باشە بۆ خرمەی گێزەر..

دەزانم جوانترین حیکمەت،
ڕشتنی خوێنی گێلاسە لە شەڕی دوو ماچدا، بەر لەپیری..
دەزانم جوانترین تابلۆ
سادەیی ڕووتبوونەوەیە لەناو بۆنی گوڵەباخدا، بەدزی..
دەزانم تەماتەی عەشقت نەخواردبێ،
سەد حەیف، تەنیایت!

ئەم پەرلەمانەی ئێمە بۆ ئەوەندە بێوەفایە لەئاست لۆبیادا؟
هەتا ئێستا لەدژی ئافاتی گۆشت بڕیارێکیان دەرنەکرد..
دەزانم لایەنگرانی کەباب لە حکومەتتدا بەهێزن،
کوڕانی قەل، بەچەندین باڵەوە.. فەوتان.

مەعلوومە ڕۆژێ ئەهلی تۆراخ دەیکەنە خۆپیشاندان
دڵنیام لە تووڕەیی ترش، لە توندوتیژیی ترشیات..
ئەم هەموو زەویانەیان فرۆشت بە بلۆك و چیمەنتۆ
پرسێکیان بە خۆڵ، نەکرد
ئەم هەموو بیرەیان لێدا و لە ڕازی قووڵایی نەگەیشتن!
باینجان ئەوەندە حورمەتی خۆی گرت
قەت نەبووە ڕەمزی ڕووممانە،
وەلێ وەڕسە لەناو ئەو هەموو قیمەیەدا،
بکرێتە تەبسی..

کە بەلای پردەکەدا دەڕۆم، لای سەوزە فرۆشەکان
بازاڕی ئەسڵەحەم بیردێتەوە
بامیە بە نرخی فیشەك
کەلەم بە نرخی گوولە ئارپیجی و
باینجانیش بە هی خومپارە
دەفرۆشن!

سەوزەفرۆشەكان
لەكاتی كڕینی عاشقانەترین میوە و سەوزەدا
تەریقماندەكەنەوە:
(هەڵبژاردن نییە.. لاچۆ خانم.. بڕۆ خاڵە..).

دە وەڵڵاهی،
من سەوزە و میوەفرۆش بم و كچێك بێت بۆلام
لە خۆشیان دەبوورێمەوە..
من تەماتەفرۆش بم و پیرەمێردێ بێت بۆ لام
عاشق دەبمەوە
من خەیارفرۆش بم لەم قرچەی هاوینەدا
هیچیشم دەستنەكەوێ، فێنك دەبمەوە..
بەو حاجی كاك ئەحمەدی شێخە،
بە شێخی بڵندی (چۆلی)
من قۆخ فرۆش بم و ژنێ پێمبڵێ قۆخ بەچەند؟
تەریق دەبمەوە..

**خودایە بۆ نەتکردم بە قۆخ فرۆش؟**

**من قۆخ فرۆش بام،**
**لەکەنار عەرەبانەکەمدا بیرم دەکردەوە:**
**مادەم پەروەردگار ئەم خەڵکە دڵخۆش ناکات**
**مادەم پەرلەمان ئەم وڵاتە دڵخۆش ناکات**
**مادام حکومەت سەردانی کەس ناکات،**
**پێویستە بە خۆخ، بە گندۆرە،**
**بە شفتی و ترۆزی دڵخۆشیان کەین..**
**بەو خودایە خەڵك دڵخۆش دەبن**
**بەگۆڕی ئەو سەحابانە قەسەم،**
**خەڵك بە ڕووخۆشیی تەماتەفرۆشەکان دڵخۆش دەبن،**
**خەڵك بە میهرەبانی شویت فرۆشەکان دڵخۆش دەبن،**
**خەڵك بە هەرزانیی گێلاس،**
**بە عەدالەتی تەرازوو لەکاتی کێشانی مۆزدا،**

خەڵك بە شتی سادە، ساكار و هاكەزایی دڵخۆش دەبن..
بەگەرمیی سەموون، بە بڵقی قاوەیی نان
بە هاتنەوەی كارەبا
بە هاتنەوەی ئاو..

من جارێك پیرەمێردێكم بەوە دڵخۆشكرد، كە پێمگوت:
(دەستت ماچدەكەم!)
كابرای دووكاندارم بەوە دڵخۆشكرد، كە پێمگوت:
(چەند بفەرمووی لە خزمەتدام)
كە هاتمەوە ماڵ پارەكانم ژمارد، تەماشامكرد
سێ هەزار و نیوی داومەتەوە لە پێنج هەزار..
ئافرەتێكی گەڕاوەم بەوە دڵخۆشكرد كە پێمگوت:
(تۆ لەو گەلامێوانە بكڕی بۆ یاپراخ،
من دەمەوێ ببمە برنجی خووساو)!
دەمزانی ئەم دایكە پڕە لە بەخشندەیی بۆ میوان
دەمزانی پڕە لە حەز بۆ باوەش پێداكردنی كوڕەكەی،
لە هەندەران..

جارێك كچێكی لوتبەرزی سلێمانیم
بەوە هێنایە پێكەنین كە پێمگوت:
(گەر پەتاتەبام، خۆم لەو خۆڵە وەردەدا
تا بەو پەنجانەت پاكمكەیتەوە، زۆرترین كات..)
ئەویش پێكەنی و بەدەم ڕۆیشتنەوە قسەیەكی كرد،
وابزانم گوتی: (گووبخۆ، شەیتان!)
جارێكیش، پەنابەرێكی سنەییم بەوە دڵخۆشكرد كە پێمگوت:
(ئاغاگیان، نەك هەر میوە و بەس،
دەرگای ڕۆحیشم، بە ڕووتدا كراوەس..)

بەر لەوەی خۆپیشاندان بكەن،
جامێ گوڵاو دەبەم بۆ كانی عاشقان،
قەیناكا: بەلای مۆنۆمێنتەكەدا ناچم!
پێش ئەوەی تەقە بكەین، گوێبگرین
خودایە تۆ گوێت بۆچی دروستكردووە؟
بۆ گوێگرتن لە تەقە
یان لە خەڵك؟!..

دەمەوێ عەرەبانەیەك هەنجیر بدەمە عاشقانی کەلار
دەمەوێ لۆرییەك قەیسی بڕێژمە دەربەندیخانەوە
دەچمە خانەقین و پڕ بە گۆزەکانی (نیاز بەیاتی)
ترێ دەبەم بۆ ماسییەکانی ئەڵوەن
هەر لەوێش هاواردەکەم:
خودایە بمکەی بە قوربانی (خوداداد عەلی)
لەناو پیکابێ کالیاردا خۆم دەکەم بە (ڕەحیماوا)دا
ڤیروسیا، بە ئەمەریکییەکان دەڵێم:
(تا (عەلی مەردان) نەناسن
تێناگەن لە قەتار، حاڵی نابن لە ئەڵلاوەیسی
ئێوە کە لە بەیاتی کورد تێناگەن،
ئەم هەموو مەخزەنە چییە پێتان؟)
کەیفی خۆیانە دەمکوژن، یان کیسە دەکەن بەسەرما..
بەس ئەگەر کوشتیانم، تکایان لێدەکەم
لە (باخچەکانی سووبحی)دا فڕێمدەن..
چەند خۆشە سپیدەیەك بە مردوویی شاعیرێکی مەست
باوەشت پیاکا؟
باوەشی تۆ، سووبحی،
بەخشندەترە لە باوەشی کابینەی یەکگرتوو،..

که له هەولێر بووم جاشی کەس نەبووم له جاشی ماست زیاتر
ئێستاش که دەچمەوه قەلا، هەر دەبمەوه جاشی لۆر و پەنیر،
جارێك لەگەڵ (مەسیفی)دا، لەوبەر مەچکۆوه،
له قەیسەرییەکەدا،
نان و پەنیرمان خوارد
له کۆلانی دارتاشەکاندا،
گایەك سمکۆڵی دەکرد، مەسیفی پارووەکەی پێ تەواونەکرا..
(دەشتی) بەوێدا هات، (پیانۆی ڕۆژهەلات)ی لێدەدا
ئەم دڵشاد عەبدولایه شایەته
ئەوکاته من چیم لێهات،
بۆیه شیعری (بابەتایەر)ی نووسی..

خودایه لێمگەڕێ بچم بۆ دەڤەری ئاکرێ،
بۆسەر گردەکەی بەرامبەر شار،
بەر لەوەی وەك بەنزینخانه گڕبگرێ
بەشکم لەژێر عەباکەیەوه،
بمباتەوه بۆخۆی، ڕووبەند لەسەرێ..
بەدهۆکدا دەچم بۆ زاخۆ،

**تا سەر پردەکەی برایم خەلیل هاواردەکەم:**

**سەیدا، هێندە شیرین بن، بە کاڵی دەخورێن**

**تاقتان نامێنیٚ..**

**دەزانم لەگەڕانەوەمدا (ناڵبەند)م لێپەیدا دەبیٚ**

**دوایین قەسیدەی، بۆ شێخ ڕەزا نووسیوە،**

**پێکەنینی لەبەر دەڕژیٚ..**

**ناوەستم هەتا ڕانیە، بە دەربەندیٚدا دێمەوە قەڵادزیٚ**

**بەدیار خەییاتێکەوە هەڵدەترووشکێم**

**تا جلانم بۆ نەدووریٚ، نابزووێم**

**پاشانیش بەسواری ئەسپیٚ،**

**تا کچەی (بەیتی ئاسۆس)ی نەدۆزمەوە**

**سەرم بچیٚ، نوێژم ناچیٚ..**

**خودایە خەڵکی ئەم وڵاتە هەموو دڵیان ناخۆشە،**

**بەرەکەت لەم قۆخانە کەویٚ**

**بەرەکەت لەم بۆنی جاترەیە،**

**بەچی دڵخۆشیان کەم خەڵکی بناری سیوەیل؟**

**چۆن دەبیٚ وەزیریان بەرکەویٚ و**

**قۆخیان بەرنەکەویٚ؟**

خودایە بەرەکەت لەم وڵاتە کەوێ،

خودایە بەرەکەت لە ڕەحمەتت کەوێ

ئەم بناری سیوەیلە

نە جادەی بۆ دەچێ، نە خەستەخانەی بۆ دەکرێ

لەگەڵ وەزیرێکدا لەوبارەیەوە قسان بکەی،

دڵنیام پێتدەڵێ:

(مامۆستا، ئەمرەکەی بۆ دەرچووە

بەڵام تەنفیزەکەی لەبەر یەکگرتنەوە، دوا دەخرێ..)

خودایە من بە خۆم و عەرەبانە و ئەم هەموو قۆخانەوە

چۆن بچم بۆ (بارێ)

کە جادەکەی وێران بێ،

کە خەستەخانەی لێنەبێ

چۆن ڕووم بێ لە (قەڵاچوالانەوە) بچم بۆ (شیوەکەڵ)؟

تا دەگەم، زۆری پێدەچێ..

خودایە شۆفلێ بۆ سیوەیل بنێرە،

خودایە بینێرە بلدۆزەرێ!

عەرەبانەکەشم دەرچێ ئەوان قۆخیان ناوێ

جادەیان دەوێ، گرێدەریان دەوێ..

خودایە من کە دەمەوێ ئوممەتەکەت دڵخۆش کەم،
تۆش نابێ بهێڵی عەرەبانەکەم بچەقێ..

هیچ وەختێ نەبووە ئاوی ڕازیانە
ڕازیی بێ لە پەرداخی بێ بووز،
تەکلیفی عارەق لە عارەقخۆر،
مەستبوونە، مەستبوون..
دڵخۆشکردنی کوردیش،
تەکلیفی منە لە تۆ..

خودایە ئەوانەی بەنانەڕەق گەورەبوون،
بۆ لە تشریبا غەرقیانکەیت، تێرناخۆن؟
پەروەردگارا، چ مەخلووقێکە ئەو قەومەی
چەندین سەرۆکی هەیە و تێرنابێ بە سەروپێ؟
ئەو هەموو گایە بخۆین،
زەوییەکان بەچی بکێڵین؟
ئەو هەموو بزنانە بخۆین،
گوندەکان بەچی ئاوەدان کەینەوە؟

به بۆنی شیر و ماست و پەنیری موعەللەبەوە

بچینەوە بەردەم یەزدان، دەفەرموێ:

(ئەمانە لە ئوممەتی من نین.. بیانبەن بۆ کەسنەزان..)

ئەو مەڕی پێغەمبەرانە هەموو سەربڕین،

زستان ڕەقدەبینەوە..

من لە بیری پنجێ گیادام، خەیاڵ بە لمبۆزی کەرەوە لێدەدا..

گەر هەموو کەرەکان بەر ئۆتۆمبێل بکەون، گیا دێتە زمان،

گەر گوێرێژەکان نەمێنن، (نالی) خۆی بەراووردکا بەچی؟

قەلاچۆی مریشکەو سەگەکان ئاوارەبوون و وەڕین:

(ئەمانە چ میللەتێکی پەستن، لە نووزەی وەفا تێناگەن؟)،

(ئەمانە چ مەخلووقێکن بەو هەموو خوێنەوە،

حاڵی نابن قرووسکە یانی چی؟).

خودا بەرداری نییە،

تاووس ناوێرێ بە ئاسمانی ئەم نیشتیمانی ڕاوچییانەدا بفڕێ!

پشەی ناو شیعری منداڵان، زۆرحاڵی چاکترە لە پشیلەی کۆڵان!

هەرچی زووترە لەم غەریبایەتییەوە دەچم بۆ باخی شیعر،
بە ئازادی دەژیم لەگەڵ هاوڕێکان..
خودایە لەتوکوتم کەیت وەك گەڵای پاییز،
ئەم باخەی وڵاتی ئێمە چ ئافاتیەتی؟
هەنجیر دەگات و دەستمان دەیگاتێ و
کەچی بەکاڵییش لێومان بە لێوی ژن ناگات؟
خودایە ئەم باخەوانە پیرە چییە لە باخی شاردا،
گووشینی پەنجەی حەرامکردووە و
هی بەلەپیتکە قەدەغە ناکا؟
بەو هەنارانەی وادەقڵێشێنەوە دەڵێم:
ڕازی خۆتان بۆکەس مەپروێنن،
لەناو ئەم قەسسابخانەیەدا،
تازە کەس زەڵاتەی حیکمەتێ مەیل ناکا.

شەرتبێ بەشەرتی خودا، بەهاری داهاتوو،
کابینە لەگەڵ بەڵاڵووکدا پێکدەهێنم..
بەدرێژایی تەمەنی کورتی چواڵە،
بۆئەوەی گەندەڵ نەبین، دەمی یەکتر دەمژین..

خودایە ئەم حکومەتەی ئێمە چ بەڵایەتی؟
ئەم پەرلەمانەی ئێمە چ سندانیەتی؟
سندان لەم ژیانەدات، کە دڵمان خۆشناکات..
سندان لەم ئاوەدات کە بەش ناکات
سندان لەم کارەبایەدات
کە نایەتەوە..
سندان لەم گەرمایەدات کە نابڕێتەوە..
خودایە ئەم باخەی ئێمە چ ئافاتییەتی؟
دەزانم لە شیلەی تەڕی خۆخدا،
تامی ماچت نەیەتەوە یاد، مردوویت..
کەچی وا وەرزی قۆخ تەواو دەبێ و ماچ پێناگات؟
کەچی وا بڵ دەبین لە پیریدا و ئەو تێناگات..

# خواردنیی دایکانه

**وەك** دەبینی لەدوای خواردنی *عاشقانە، شاعیرانە، هاوڕێیانە و حەکیمانە*، باسی خواردنی *دایکانەت* بۆ دەکەم، خواردنێ، کە سەدان جار خواردوتە و خواردنێ ئەگەر تا ئێستا نەتخواردبێ لە کیست چووە.. چاوەڕێ نەبیت من لەم زنجیرەیەدا ناوی خواردنەکە و پێکهاتەکانیت، لەسەرەتاوە و بەڕاشکاوی پێبڵێم، چونکە شێوەی ئەو خواردنە پابەندی ئیستیعارە و پێچانەوەیە و منیش لە درێژەی قسەکانمدا هەوڵدەدەم کەمێ لە گرێکانیت بۆ بکەمەوە. لەم زنجیرەیەدا ئەوەندەی باسی دایکت بۆ دەکەم، باسی جۆرێکی تایبەت لە خواردنت بۆ ناکەم. فەنتازیای خواردن، ئەگەر نەتوانێ خەیاڵ لە باشترین خواردندروستکەری ناو ژیانی ئێمە بکاتەوە، کە دایکمانە، ناتوانێ ئەو خواردنانە دابهێنێ کە دواجار بەیادهێنەرەوەی دەستپووختەی دایکن.. هێندە هەیە، ئەمە ئەو خواردنەیە کە ناتوانین دەستوورێکی بۆ دەستنیشان بکەین، ڕێنمایی کەس بکەین بۆ دروستکردنی بەوجۆرەی کە پێویستە دروستبکرێ.. ئەمە ئەو خواردنەیە کە یەك دەستووری نییە و هێندەی ژمارەی هەموو دایکان، دەستووری تایبەت بە خۆیان و چێژی جیاوازی هەیە.. هەر کات بزانین ئەو خواردنە دایکانەیە چییە، یەکسەر شویتی جنراو، برنجی خووساو و تەڕەپیازی باریکمان بیر دەکەوێتەوە، کە بۆنەکەی پێش تامەکەی پێماندەڵێ: ئا لەوماڵەدا، دایکێ قۆڵی لێهەڵماڵیوە و

بەدەم خەیاڵ و بیرکردنەوە لە یەکبەیەکمان، واخەریکە (پەنجەکانی لەناو سەوزاییدا دەچێنێ)..

ئەفسانەکان دەگێڕنەوە، کاتێ دایک ویستی هەموو ڕازی دڵی خۆی بۆ نەوەکانی پاشەڕۆژ لە شتێکدا بپارێزێ، ئەم خواردنەی داهێنا و خستییە ناو قابلەمەیەکەوە و چەند بەردێکی لیسۆکەی لەسەر دانا و سەرەکەی لەسەر دانایەوە. ماوەیەک تێدەپەڕێ و قابلەمە بەبێ ئاگر، ڕۆحی دەچێتە بەر و هەر بە گەرمایی دڵی دایک، دەکەوێتە قوڵپەقووڵپ و هەڵم لە هەموو لایەکەوە بەرز دەبێتەوە. لەو کاتەدا، وەک ئەفسانەکە دەڵێ: (*ئەسکەندەری مەکدۆنی بەخۆی و سووپایەکی بێشوومارەوە خەریکن بەوێدا ڕابوورن تا بچن ئێرانێ داگیر بکەن. ئەسکەندەر دەست لە قشوونی خۆی بڵند دەکا تاکو لەشوێنی خۆیان بسەکنێن، لە ئەسپەکەی دێتەخوار و لغاوەکەی بەرەڵڵا دەکات و خۆی بەژووورێدا دەکا و یەکراست دەچێتە سەر قابلەمەی. بە دەستە خەپەتۆڵەکانی سەرەکەی لەسەر لادەبا، دانە بەردەلیسۆکەکان هەڵدەگرێ و دوو پەنجان بەناو هەڵم و قووڵپە و گەرماییڕا دەباتە ژوورێ. لەو کاتەشدا سەرلەشکر و جاڕدەر و دەستوپێوەندەکانی لەناو دەرگاییڕا سەریەک نیشتوون و لە سەرداری خۆیان دەنۆڕن کاتێ دەستی دەهێنێتەوە دەر، شتێکی بەدەستەوەیە..*).

مێژوونووس، کە لە کونی پەنجەرەیڕا تەماشا دەکات، ئەم ڕووداوە بە وردی تۆمار دەکات و هەر ئەویش بۆی گێڕامەوە، کە لەو کاتەدا یەکێ لە پەیڕەوکارانی فەلسەفەی ئەبیکۆر، هاواری کرد: (***پایەدارا، ژیان دە چێژەکەیدایە و چێژ سەرەتای ژیانە***)!. ئەسکەندەر کە ئەمەی گوێ لێدەبێ، یەکسەر گوتەیەکی بەناوبانگی ئەرستۆی مامۆستای خۆی بیر دەکەوێتەوە، کە گوتبووی: (***هیچ شتێ لە ژیاندا نییە، شایانی ئەزموونکردن نەبێ..***)، بۆیە یەکسەر خواردنەکە دەخاتە دەمییەوە و هێواش هێواش دەیجوێ.. سەرباز و پێشقراوڵ و هەواڵبەر و دەرەجەداران، تێکڕا دەچنە سەر شانوملی یەکدی و دەیانەوێ بزانن پادشای خۆیان بەو خواردنەی چی بەسەردێ..

مێژوونووسەکە لەو هەراوهۆسەیەدا، پەڕەمووچەکەی لێبەردەبێتە خوارەوە و چاویلکەکەی دەشکێ. بۆیە ئەوەی لەوەدوا تۆماریکردووە، جێی متمانە نییە، وەلێ حەکایەتەکان دەگێڕنەوە: ئەسکەندەر لە شوێنی خۆی حەپەسا، پاشان دوو هەنگاوان کشایەوە و لەسەر کورسییەك دانیشت و لەبەر خۆیەوە گوتی: (*ئەوەی لە ناخی دڵیدا پەنگی خواردۆتەوە، لەم خواردنەوەی پێچاوە،..*). ئەمجا فەرمان دەردەکا لەبۆ مەتبەخدار و سەردەستەی نانپەزان کە ئەو خواردنەی بکەنە خواردنی ڕەسمیی لەشکرێ، تاکو سەربازەکانی بەو جۆشەی دە خواردنی دایکانەدایە، بخرۆشێن و ورەیان لە ڕووبەڕووبوونەوەیان دەگەڵ دوژمنێدا، بەرزبێ..).. ئەو بەشەی ئەفسانەکە لێرەدا تەواو دەبێ و ئەسکەندەر شەڕەکە دەباتەوە، وەلێ باسکردنی خواردنی دایکانە، بەردەوامیی هەیە..

** ** **

چێژی ئێمە لە خواردن پەیوەستە بە سەلیقەی داییکەوە. وەکئەوەی داییك بۆ هەمیشە تاموچێژی بە هەموو ئەو خواردنانە بەخشیوە کە ئێمە مەحکومین بە خواردنیان.. هیچ کەسێ لە ئێمە نییە، کە یەکەم ئەزموونی خواردنی خۆی لە خواردنەکانی دایکییەوە وەرنەگرتبێ و دواجار ئەو ئەزموونە وەك چێژێکی ئەبەدی، بە ژیانیدا درێژ نەبوو بێتەوە. خواردنی دایك لەو ژەمە دەچێ کە ئەو یەکجار بۆی دروستکردوین، وەلێ ئێمە تا دەمرین گەرمیدەکەینەوە، تا هەبین چێژی لێوەردەگرین.. یەکەمین ئەزموونی خواردنی دایك پێوەرە بۆ هەموو ئەو خواردنانەی کەسانی دیکە لە (خۆشەویستی) و (حەز)ی خۆیانەوە بۆمانی دروستدەکەن.. بۆیە بەر لەوەی هاوسەر و خۆشەویستەکانمان لێمان زویر بن و خۆیان بکوژن تاکو بەو خواردنانەی بۆمانی لێدەنێن، تامی خواردنی دایکمان بیر بەرنەوە، پێویستە پێیان بڵێین: (*هاورێی ئازیز، خۆت ماندوو مەکە! دەزانم پەنجەکانی تۆ لە پەنجەکانی داییك ناسکتر و سەلیقە و ئیمکانییەتی تۆ لە هی داییك فراوانتر و تەمەنی تۆ لە تەمەنی ئەو پیرێژنە بەساڵاچووە*

*کەمتر و تواناشت زیاترە، بەڵام ناتوانیت تامی خواردنێکم بیر بەریتەوە کە بۆنی بوون و تامی بەهەشت و ڕەنگی ژیانی پێوەیە)..*

هیچ خواردنێکی دایك نییە کە تەنیا بریتی بێت لە خودی خواردنەکە، ئەگەر لە هەمانکاتدا ئەو کەش و میهرەبانی و نیگا پڕ لە خۆشەویستیانەش کە دایك ئاراستەمانی دەکات، لە ئارادا نەبن. خواردنی دایك، بە چەندایەتی و چۆنایەتییەکەیدا هەڵناسەنگێنین. بەڵکو بەو ئاماژە و وردە نیگا و ئامۆژگاری و وردە دۆعا و هەناسانەدا، کە هەڵیدەکێشان، بەو جوولە و وەڵام و هەستان و دانیشتنانەدا هەڵیدەسەنگێنین، کە ئەو لەکاتی دروستکردنی خواردنەکانیدا پێیان هەڵدەستا و بۆ یەك ساتەوەختیش ئامادەیی ئێمەی لەو شوێنەدا لەبیر نەدەکرد و خەیاڵی لەو ئازیزانەیشی نەدەپچڕی کە چیدی لە دنیادا نەمابوون و هەمیشەش لەبیری ئەندامانی دیکەی خێزاندا بوو.. دایك کە خواردن دروستدەکات، جگە لە تام و خوێ و چێژێ کە دەیکاتە خواردنەکانییەوە، ئاواش لەناو بۆن و بەرامەی یادگاری و بیرەوەرییەکانیدا ئەو خواردنانە دروستدەکات. دایك لەگەڵ دروستکردنی هەر خواردنێکدا، بەدەم شتنەوەی خۆراکەکانەوە، هاوکات بە قرچاندنی ڕۆن و پیازەکانی، لاپەڕەی ڕۆژگارەکانی خۆیشی لەسەر ئیقاعی چاککردنی سەوزە، بەپێی ئاوازی لێکردنەوەی گەڵامێو، بەهەمان شێوەی پێچانەوەی یاپراخ، هەڵدەداتەوە.. دایك لەکاتی خواردن دروستکردندا، هەر تەنیا چێشتلێنەرێکی کارامە نییە، بەڵکو دەروونشیکارێکی بێموونەیشە. ئەو ناچارە ئێمە لە خۆمان باشتر بناسێ، ڕەچاوی ئارەزووەکانی یەکبەیەکمان بکات، بێدڵیی کەسمان نەکات، جیاوازیمان لەنێواندا نەکات، خواستەکانی منداڵی هەرە بەبیانووی ماڵ، واتە (باوك)، بهێنێتە دی و نەهێڵێ کەسمان هەست بەوە بکەین، کە حسابمان بۆ نەکراوە.. ئێمە نەك هەر لەڕووی سیاسییەوە پێویستیمان بە ئاشتبوونەوە هەیە، بەڵکو لە ژیانی خێزانییشدا پێویستە بەردەوام ئاشتبکرێینەوە. دایك ئاشتکەرەوە و ناوبژیکەرێکی ئەوتۆیە، کە بەبێ ئەو شیرازەی ماڵ دەشێوێ و یەکەمین نامۆییەکان، بۆشاییەکان، بێنازییەکان و دابڕانەکان

لەوێوە دەستپێدەکەن.. تا ئەو کاتەی دایـك لـە ماڵدایـە، مـاڵ هەرچـەندە هـەژار و دەستکورت بێ، هەچەندە ناکۆك و ئاژاوەی تێدا بێ، هەرچەندە بچـووك و قـەبز بـێ، ئەوە نە هەژاریی پێوەدیارە، نە ئاژاوەی دەچێتە دەرێ و نە دڵتەنگی زەفەر بە پێکـەنین و خەنینەوەکان دەبات.. بەم پێیەش دایك هەر لـەگـەڵ یـەکتردا ئاشـتمان ناکاتـەوە، بەڵکو لـەگەڵ ژیان و بوونیشدا دەمانکاتەوە دۆست، تەنانەت ئەو کاتەی ژیان بێتامـە، حەیرانێ..

### ***هونەری بەشکردنی مریشك:***

گریمان کێشەکەمان لـەسەر خواردنی بەشێ لـەبەشەکانی مریشـکەوە، دەسـتپێدەکات، بەڵام ئێمە دەزانین پێکهاتە سەرەکییەکانی مریشك لـەم بەشـانە پێکهـاتووە: دوو ڕان، دوو باڵ، یەك سنگ، یەك ملـەقۆرتە، یەك پشتەقوون، هەندێ پرزۆڵـە چەرم و پێسـت و ئاسمانێ فڕین.. گریمان لـە ماڵێکدا، کە ژمارەی ئەندامەکانی پێنج کەس بوون، کەس نەیهەوێ بفڕێ، کەسیش حەزی لـە سنگ نەبوو، (میوان لـەم کاتەدا لـەسـەر چـاوان، چونکە ڕاست سنگەکەی دەخرێتە بەردەم!)، بەڵام گریمان هـەر لـەوێـدا، سـێ کـەس ڕانخۆربوون، یەك کەس بە ملـەقۆرتەکە ڕازیـی بـوو، دوو باڵـەکـەش بـۆ دوو کەسـی دیکە. ئەو شەڕەی لێرەدا دروستدەبێ ئاوایە: باڵخۆرەکان زوو بەشی خۆیان دەخـۆن، ئەوەی پشتەقوونەکەی بەرکەوتووە هیچ مەترسییەکی لـەسەر نییە!. ئەو دوو کەسـەی دوو ڕانەکەیان بردووە، خۆیان گێل دەکەن بۆ ئەوەی کەسی سێهەمی ڕانخـۆر، مـەیلی بـەلای ملـەقۆرتـەخۆردا بچـێت و لـەگەڵیـدا بیکاتـە نیـوە! ڕێـك لـەم کاتەشـدا ملـەقۆرتەخۆر فرسەت دەهێنێ و بەیەك لرفە، هەموو ملـەقۆرتەکـە هەڵدەلووشـێ بـۆ ئەوەی کەسیتر بێزی نەیەت لـەگەڵیدا بخوات.. (لـە زمانی کوردیدا، جوێنێ هەیە لـەم حاڵـەتەوە دروستبووە)..

ئەگەر دایك بهێڵێ کارەکـە بـەمجۆرە بـڕوات، مەسـەلـەکە وەك سیاسـەتی کـوردی لێـدێت: ڕانخۆرێـك دەتـۆرێ، ملـەقۆرتـەخۆر تەریقدەکرێتـەوە و دوو ڕانخـۆر و دوو

باڵخۆرەکەش وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن. ئەمەش تۆوی سەرەتای شەڕێکی دیکەی ناوخۆیی لە خۆیدا هەڵگرتووە، کە دوو هێزی سەرەکی دەکەونە بەرامبەر یەکتر و هەریەکەیان لەگەڵ وردەهێزی دیکەدا بەرەیەك لەدژی ئەوانیتر و ئیدارەیەکی سەربەخۆ پێکدەهێنن بۆنمونە: دوو ڕانخۆرەکە هەریەکەیان لەگەڵ باڵخۆرێکدا یەکدەگرن. پاشان ملەقۆرتەخۆر و پشتەقوونەخۆر، هەریەکەیان دەچنە پاڵ لایەنەکەی تر و ڕانخۆرە تۆراوەکەش، دوای پەنگخواردنەوەیەکی درێژخایەن، شمشێرێ بەدەستەوە دەگرێ و گەرەکییەتی لەسەر سفرە سەری هەموومان ببڕێ..!

بۆیە داییك، بەپێچەوانەی سیاسییەکوردەکانەوە، ناچارە سیاسەتێکی فرەیی و پلۆرالیستی هەبێ و پێویستە هەر لەسەرەتاوە مریشکەکە بەجۆرێکی دیکە لەتوپەت بکات: پشتەقوونەکە دەکاتە دوولەت، هەر یەکێ لە ڕانەکان لە کەڵکە ئەژنۆدا دەبڕێتەوە و ملەقۆرتەکەش دەکاتە دوو بەش: ملەکە بە جیا و قۆرتەکەش، کە قەفەزی سنگی پێوەیە، بەجیا.. بەمجۆرەش ئاو بەئاگردا دەکرێ، بەڵام دڵنیابە، ئەو بۆخۆی تەنیا پڕزۆڵە و پارچەسووتاوەکان دەخوات! چاوم لێیەتی، لەولاوە، لە قووژبنێکەوە بە تیلەی چاوێکی دەڕوانێتە ئێمە، کاتێ سەرمان بەسەر پێشدەستییەکانماندا شۆڕکردۆتەوە و بە بێ جویین، پاروەکان قووتدەدەین و بە تیلەی چاوەکەی تریشی دەڕوانێتە بەلەم و قاپەکانمان، تاکو ئەگەر کەمیان تێدا مابێ، بۆمان تێکاتەوە.. ئەو بەو دیمەنە تێردەبێ کە ئێمەین کاتێ بەرهەمی دەستوپەنجەکانی ئەو دەخۆین.. ئەو بەوەی دەیخوات تێر نابێ و ئاسوودەیی و تێربوونی ئەو لەوەدا نییە کە دەیخوات، بەڵکو لەوەدایە کە ئێمە پێکەوە و لەناوخۆماندا (عال و سال) بین.. دڵنیابە، ئەو بەبێ ئێمە ناخوات، بەبێ ئێمە، بێ شێو سەردەنێتەوە، لە چاوەڕوانیماندا..

***مۆدێرنیتە و داییك:***

تا ئێستا هەموو کەلتوور و ئایینەکان لە چوارچێوەی ئامۆژگارییەکی یەزدانیانەدا پێگە و ڕێزی دایکیان دەستنیشانکردووە، وەلێ پێویستە ئێمە لە چوارچێوەی ئەزموونی

مێژوویی و ویژدانیدا، پێگەی دایک دەستنیشان بکەین و ڕێزی لێبگرین. هەتا دێ لەڕووی کەلتووری و پێشکەوتنی شارستانیانەوە، ئێمە لە دایکانمان دوور دەکەوینەوە: پێشکەوتنی شارستانیانە و چەکەکەی دەستی، واتە تەکنەلۆژیا، لە شوێنێکدا دایک دەکاتە قوربانی.. سەری دایک، وەك کەسایەتی و وەك پێگەی دایکایەتی، بە گوللەی ئەو چەکەی ناوی تەکنەلۆژیای مۆدێرنە و ئامانجەکەی بریتیە لە بەتەکنۆلۆژیکردنی مەتبەخ، دەپژێ. دایک لە مێژووی ژیانی خۆیدا و لە زۆربەی کۆمەڵگاکانی وەك کۆمەڵگای ئێمەدا، بەرگەی مێردسالاری، بەرگەی ئەنفال و کوڕکوژران و سەنگبارانکردنی کچەکانی و سەدان نسکۆی دیکەی گرتووە. وەلێ دەبێ بە گومانەوە بڕوانینە بەرگەگرتنی ئەو بۆ کەلتوورێك، کە دەیەوێ پێگەی ئەو و جەستەی ئەو، بەپەراوێز بخات و هیچ نرخێکیش بۆ ئەزموون و مەهارەت و تواناییەکانی دانانێ.. دایک لەو کۆمەڵگایانەدا کە دەبنە مشەخۆر بەسەر بەرهەمەکانی مۆدێرنیتەوە و بۆخۆیان خاوەنی کەلتوورێکی دەوڵەمەند نین، بەرەو فەرامۆشکردن و لەبیرچوونەوە دەچێ.. لەو کۆمەڵگایانەدا، دایک، شوناسی (پەروەردەکار)، (ڕاگر) و (کۆڵەکەی ماڵ) و (ئاوەدانکەرەوە) و (ڕووناکیی ماڵ)ی لێدەسەنرێتەوە و هێواش هێواش لەگەڵ تەسلیمبوونی جەستەی ئەودا بەپیری، وەك مرۆڤێکی (بێدەسەلات)، (زیایە) و پەراوێزی تەماشای دەکرێ و لێرەشەوە، ڕۆحیشی دەبێتە قوربانی.. لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا، ئەو بەهایەی لە پێناوی پرۆسەی مۆدێرنیزەبوونێکی ڕواڵەتیانە، پرۆسەی خۆ نوێکردنەوەی ماتەریالیانە و کڕینی بەردەوامی شمەك و کەلوپەلدا دەیدەین، زۆر لەو بەهایە کەمدەکاتەوە کە بە پەیوەندییە هەستەوەری و کۆمەڵایەتییەکانمان دەدا.. دایک لە کۆمەڵگایەکدا کە سۆزداری و حورمەت و خۆشەویستی بالادەست بێت، لە سەنتەردایە، وەلێ لە کۆمەڵگا و پەیوەندیگەلێکی نێوان مرۆییدا، کە هەموو ڕێز و حورمەتێ پەیوەستکرابێ بە ژیانی ماتەریالی و خۆنواندنەوە، دایک پێگەی خۆی لەدەست دەدات.. دایک لەو ژیانەدا کە مرۆڤەکان لەئاست یەکتردا ویژدانی خۆیان نەدۆڕاندووە و خاوەنی (ئێمە)

و یادوەریی مێژوویین لەسەر خەبات و زەحمەتـەکانی دایـك، هـەموومانی لـە دەوری سینییەك دۆڵمە و یاپراخ، کۆدەکردەوە.. بەڵام لە ژیانێکدا، کە (ئێمە)یـەك نـەمابێ و (من)ێکـی خۆپەرسـتی نـەزان و لـووتبـەرز و نـامۆ بـە ژیـانی هاوبـەش و یـادەوەریی مێژوویی، خۆی لە ئاست ئەوانیتردا هەڵاوسێنێ، بێگومان (داییك)، چ وەك پێگە و چ وەك کەسایەتی، دەکەوێتە پەراوێزەوە..

ئێمە چۆن ناتوانین دەست لە دۆڵمە و یاپراخ خواردن، وەك خواردنی دایکانە و وەکو کۆکەرەوەی هەمووان لەسەر خوانی سرووشت، هەڵبگرین، ئاواش نـاتوانین و بۆمـان نییە لەناو ئەو ژیانە ماتەریاڵییەی وا خەریکە قووتماندەدات، دایکانمان پشتگوێ بخەین. چۆن دایکانمان نەیانتوانی خواردنی دۆڵمە وەکو خـواردنێکی سرووشـتی و نـزیکترین خواردن لـە سرووشتەوە، نەکەنە خواردنی پێکەوەبوونی جیاوازییەکانمان، ئاواش ئێمـە ناتوانین دەست لەپەیوەندیی خۆمان بـەو کەسـەوە هـەڵبگرین، کـە ئێمـەی هێناوەتـە جیهانەوە و ئێمەی بە بوونەوە گرێداوە. لـە کتێبی (***نەتەوە و حەکایەت***)دا نووسیبووم: (***داییك و ئاو هەر تەنیا لـە سەرچاوەی بوونەوە نزیك نین، بەڵکو خۆیان سەرچاوەن بۆ بوون.. هەروەك چۆن ناتوانین بیر لـە سرووشت بکەینەوە بەبێ ئاو، ئاواش بیرکردنەوە لـە بوون و لـە ژیان بەبێ بیرکردنەوە لـە داییك، مەحاڵـە***).

لـە ژیانێکدا، کەبەبێ ڕۆڵی دایك مەیسەر نـەدەبوو، بـەبێ قوربانییـەکانی ئـەو بـەهای نەدەبوو، بەبێ سـۆزداریی ئـەو مانـای نـەدەبوو، فەرامۆشـکردنی دایـك و خواردنـە دایکانەکەی، جگە لـە بێویژدانی و گەمژەیی هیچیتر نییە. ئێمە وەك میللـەتێك، کـە ژمارەی دایکە سکسووتاوەکانمان هێندەی ژمارەی گۆڕی شەهیدەکانمانە، کە ژمـارەی ئـەو وێنـەی قوربانیانـەی دایکـان بـە بـەرۆکی خۆیانـدا هەڵیانواسـیون، هێنـدەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، هیچ بوار و ڕێگای ئەوەمان نییـە ئەوەنـدە گەمـژەبین دوو شـت لەبیر بکەین: دایکان و خواردنەکانیان..

بیرکەوتنەوەی داییك ئەو شتەیە کەمترین قوربانیدان و کاتی دەوێ، من پێشنیار دەکەم لـە سـەرۆکی وڵاتەکەمانـەوە، تـاکو سـادەترین ئەنـدامی ئـەم کۆمەڵگایـە، بـە

لەبەرچاوگرتنی ئەو نەخشەی داییك لە كۆمەڵگای ئێمەدا هەیەتی و هەیبووە، ئەم كارەی خوارەوە بكات: بچێتە بەرامبەر داییك، لەئاست سیمایدا بچۆمێتەوە و ناوچەوانی بخاتە سەر نووكە پەنجەی قاچی و پاشان بەدەستی ڕاستی، هێواش هێواش دەستبەرێ بۆ قاچە زبرەكانی و نەعلە شڕەكەی لەپێ دابكەنێ و بیخاتە سەر سەری.. نەعلە شڕەكانی داییك، گەورەترین تاجە پادشای وڵاتێك و ئەندامانی كۆمەڵگایەك بیخەنە سەر سەریان، چونكە ئەگەر مرۆڤێك هەبێ لە ژیانی ئێمەدا شایانی ئەوەبێ سووجدەی بۆ ببەین، ئەو كەسەیە كە دڵی خۆی بۆ خستینە خواردنەكانییەوە و ئەو خوارنانەی بۆ لێناین، كە پێویستە بۆ هەمیشە گەرمیان بكەینەوە، بۆ هەمیشە چێژیان لێوەربگرین.

ئەفسانەكە لە كۆتاییدا، ئەوەش زیاد دەكات و دەڵێ: (ئەسكەندەری مەكدۆنی، دوایئەوەی خواردنە دایكانەكەی خوارد، شەوێ تاكو درەنگانێ خەوی لێنەكەوت.. لەنیوەی شەوێدا بەدزی لەشكرەكەی، هەسپەكەی زینكرد و گەڕایەوە زێدی خۆی، بە ئەسپایی خۆی بە پەرستگایدا كرد، چووە بن درەختێك و شمشێر و مەتاڵ و زنجیرەكەی بەری دانا، لەبەردەم گۆڕێكدا نوشتایەوە و چنگێ خۆڵی ئەو گۆڕەی خستە ناو دەستەسڕەكەیەوە..). مێژوونووسەكە، كە ئیدی هیچی بەچاوی خۆی نەدیتبوو، ئەوەشی زیادكردبوو و نووسیبووی: (هەرجارێ ئەسكەندەر، لە بەردەم سووپای داریووشدا، لە خۆی و لەشكرەكەی بێهوومێد دەبوو، بۆنێكی بەدەستەسڕەكەیەوە دەكرد!)..

## له (خواردنی ژن)ـەوە
## بۆ (خواردنیی ژنانە)!

**ئەو**، هەموو زنجیرەکانی (فەنتازیای خواردن)ی خوێندبۆوە و چاوەڕێ بووە هەر لەسەرەتاوە، زنجیرەیەك بنووسم لەسەر خواردنی ژنانە.. سەرەتا پەیامێکی تەلەفۆنی بۆناردم و تیایدا نووسیبووی: (***چارەت دەکەم، ئەی بێسەفەت***!). پاشانیش لەملاولا دەمدی و خۆی لە گێلی دەدا، تاکو ئەوە بوو ڕۆژێك، لەکاتێکدا نیوەی پەنجەی دۆشاومژەم خستبووە ناو لوتمەوە، گوتی: (.. تۆ دەعوەتی منیت، خواردنی ژنانەت بۆ لێدەنێم..). خەریك بوو دڵم بوەستێ، چونکە ئەو قسەیەی بەجۆرێ پێگوتم، کە ژنە سیحربازەکانی ناو داستانەکانی بیرهێنامەوە، ئەگەرچی لەپڕ بیرم کەوتەوە دیاردەی (ژنی سیحرباز) دیاردەیەکی دیکەی خەیاڵگەی پیاو و ئایینسالارییە و هیچیتر، کە فەسڵێ لە مێژووی ئەورووپا و کەنیسە پێکدەهێنێ.. بەڵام قسەکەیم سەرخۆ نەهێنا و بە دیپلۆماسییەتێکی پیاوانەوە، کە شان و شەوکەتی نێرینەییم تیایدا نەشکێ، پێمگوت: (حەوبرا، خۆت ماندوو مەکە..). ئەویش بەخێرایی گوتی: (حەوت برا و هەشت برا ناخوات، چاوەڕێت دەکە..م..!).

نەمزانی قسەکەی لەشێوەی فەرماندا دەربڕی، یاخود داواکارییەك بوو و هیچیتر، بەڵام پێشئەوەی بەجێم بهێڵێ دووبارەی کردەوە: (چاوەڕێت بم..؟)

بیستبووم گوایە دڵشکاندنی ژن، کارەساتی بەدواوەیە و منیش کە ئیدی بەرگەی کارەساتی دیکە ناگرم، پەیمانم دایێ کە بچم و بەدوای بۆنی مێینەییدا کۆڵانە تەنیاکانی شار بگەڕێم.. ئەم وادە پێدانە قارەمانی ڕۆمانی (پیدرۆپارامۆ)ی بیر هێنامەوە:

*{هاتم بۆ کۆمالا، چونکە پێیان وتم کە باوکم، پیدرۆپارامۆ، لێرە دەژیا. دایکم ئەمەی وت و منیش پەیمانم دایێ هەر کە لە دنیادەرچوو بۆ دیدەنیی بچم. دەستیم گوشی تاکو دڵنیابێ کە ئەوکارە دەکەم. لە بەر ئەوەی لەسەرەمەرگدا بوو، ئامادەبووم هەموو پەیمانێکی بدەمێ. پێی وتم: "هەردەبێ بچیت بۆلای، دەزانم بە بینینت خۆشحاڵ دەبێ". لەبەر ئەوە تەنها کارێك لەو ساتەدا لەدەستم دەهات ئەوە بوو کە زوو زوو بۆم دووبارە دەکردەوە: دەچم و دەیبینم. تائەو ساتەی کە ناچاربووم دەستم لەنێو پەنجە ڕەق هەڵاتوەکانیدا بێنمە دەرێ (...) مەبەستم نەبوو گفتەکەم بەرمەسەر، بەڵام لەپاشاندا قسەکانی هێندەیان سەر گەرم کردم، بیرم لە هیچی دی نەدەکردەوە.. تەنانەت خەوم پێوە دەبینی و کارگەیشتە ئەوەی بیرکردنەوە لە پیدرۆ پارامۆ خەوو خۆراکی لێ حەرام کردم. هەر لەبەر ئەمەش بوو هاتم بۆ کۆمالا.}.*

هێشتا نەگەیشتبوومە لای درەختەکە، بۆنی خواردنەکان ئاراستەی ڕێگاکەیان بۆ دەستنیشانکردم و کاتێ لەدەرگامدا، گوێم لێبوو هاواری کرد:

(دەمزانی شوێن بۆنەکە دەکەویت..)

(ئاخر، بۆن بانگکەر و سەرنجڕاکێشە، لەوپەڕی دنیاوە کەسێکت بۆ دەهێنێتە ئەم نزیکانە..).

پێکەنی و گوتی: ( بەڵام لە دواجاردا بۆی هەیە بکوژیش بێت!)

وەك کۆیلەیەکی مەست و ماندوو، بەڵام بە بڕوا بەخۆبوونەوە وەڵامم دایەوە: (چی لەوە خۆشترە پیاوێ لەژێر کەژاوەی شاژنێکدا سەرشانەکانی خوێنیان تێبزێ..!)

دیسانەوە پێکەنی.، پێکەنینێکی ئازاراوی، وەکئەوەی بیەوێ بڵێت: (ئاخر هەرگیز ژن سەرچاوەی ئازار نەبووە..).

من هەستم بە گەمژەیی خۆم کرد، گەمژەییەك کـە لــە ئەفسـانە و ئایینەکانــەوە تـاکو بەرەبەیانی مێژوو، بە میرات بۆم مابۆوە..

بەرێوەبووم بۆ ژوورەوە، کە لـە ڕاڕەوی حەوشـەکەدا، بینـیم قـەیی درەختەکـەی بـە ڕەنگێکی پەمەیی کاڵ و هەر گەڵایەی بە ڕەنگێ، بۆیاخکردووە و بە لقەکانیشــییەوە، چەندین ملوانکە، لوتەوانە، گوارەی شۆڕ، دەستبەند، بازنگ، مێخەکبەند، ژێرچــەنە، لاگیرە، زنجیر، دەسماڵ، ملبەند، سەرپۆش و ئاڵووالای هەڵواسـیوە.. بـەجۆرێ کاتـێ شنەبایەکە لـە درەختەکەی دەدا، مەحشەرێ لـە دەنگ، لــە سـەمای ڕەنگـەکان، لــە زرینگانەوە و مۆسیقایەکی تایبەتت دەهاتە بەرگوێ..

لـە حەکایەتێکدا بیستوومە، یەکـەمجار یـەزدان بـەر لــەوەی ئـادەم بئافرێنـێ، حـەوای خەڵقکردووە، بەڵام کاتێ داوای لێکردووە ناو لـە شتەکان و ئافەریدەکانی دیکە بنێ، تەماشای کردووە هەموو ئەو ناوانەی حەوا لـە مەخلووقاتەکانی ناون، نـاوی ژنانــە و نەرم و نیانن. بۆ نمونە ئەوەی ئێمە پێیدەڵێین شێر، یەکەمجار حەوا ناوی ناوە، (قژلوول)، بە تیمساحی گوتووە (چاومەست)، بە ماریشی گوتــووە: (عاشـق) و بـەوجۆرە.. بـەو پێیەش بێت جیهان دەبووە شوێنێکی ئارام و هەرگیز جەنگ و پشێوی تێدا ڕوویندەدا. بە پێی ئەو حەکایەتە، یەزدان بیر دەکاتەوە و بەخۆی دەڵێ: جـا ئەگـەر جیهـان ئـاوا ئارام بێت، ئەدی من چۆن یاساکانی سزادان و عەدالـەت و ڕەحمـەت و غـەزەبی خـۆم بخەمە گەڕ؟! لـەوەش بترازێ، کاتـێ بینیبــووی حـەوا خـەریکی ڕەنگکردنـی گـەڵا و هەڵواسینی گوارە و ئاڵووالاکانێتی بە لقـی دارانــەوە، زۆر تـووڕە دەبێـت و ئەمـەش دەبێتە بەهانەیەك بۆ ئەوەی حەوا بۆ ماوەیەك بشارنەوە و پاشان ئادەم خـەڵق بکـرێ..

کاتێ ئادەم ئەو ناوانەی ئێستا لـەو ئاژەڵانە دەنێ، ئاژەڵـەکان تووڕە دەبن و شێر بڕیاری دڕندەیی، تیمساح بڕیاری خۆشاردنەوەی، جگە لـە چاوی و مـاریش بڕیـاری دڵڕەقـی دەدات.. بەم پێیەش هەستی ژنانەیی ئاوارە دەکرێ و لـەوساوە مێینەیی و ژنانــەیی دوو هەڕەشەی گەورەن بەسەر جیهانەوە.

هەستی ژنانەیی شتێ نییە ئەوانیتر لە تاقە ژنێ چاوەڕێی بکەن، بەڵکو لەوەش زیاتر ئەوەیە کە تاقە ژن و مێیینە لە خۆیدا هەستیپێدەکات و حەزدەکا لەبۆ ئەوانیتری دەربڕێ و بەرجەستەی بکات..

کاتێ بە قەراخ چیمەنی حەوشەکەیدا بەرەو ناندێنەکەی دەڕۆیشتم، لە نکاو خۆمم لەبەردەم سێ پلیکانەدا بینییەوە، کە بەملاولایاندا ئینجانەی ڕەنگاوڕەنگ داندرابوون و گوڵ و گیای ناویان بەلێوارەکانیاندا شۆڕ ببوونەوە. ڕەنگی گوڵی ناو ئینجانەی سەر یەکەم پلیکانە، سپی سپیی بوو وەك بەفری بەیانیان.. ئەو کە ئێستاکە بۆخۆی بە کراسێکی مەخمەڵییەوە لەناو دەرگاکەدا، بە پێخواسیی وەستابوو، گوتی: (ئەوە نیشانەی پێشوازییە.. وەرە سەرەوە..). ئەو قسەیە کلیلی ئەوەی دایە دەستم کە هەوڵبدەم لە مانای ڕەنگی گوڵەکانیی دیکەش تێبگەم.. لەوە دەچوو ئەو بیرکردنەوەکانمی لە نیگا و سیمامدا خوێندبێتەوە و بیەوێ قسەکانی خۆمم بیر بهێنێتەوە. گوتی: (فەنتازیای خۆت بەکار بهێنە، واتە ئازاد بە لەوەی چۆن ڕەنگی گوڵەکان مانا دەکەیت).

گوتم: {کەواتە ئەم ڕەنگە هەنارییەیان، (بە ئاماژەدانم بۆ ئینجانەکانی سەر دووەمین پلیکانە)، نیشانەی عەشقە!}.

پەنجەیەکی خستبووە سەر لێوی و لەکاتێکدا چاوی ڕاستی هێنایەوە یەك و بزەیەك گرتی، گوتی: (شەیتانیت! بۆی چوویت، بەڵام عەشق دەبێ دانە بکرێ.. ڕەمزەکانی خۆشەویستی زۆرن، هەروەکچۆن جۆرەکانی خۆشەویستیش جیاوازن..).

پێمگوت: (بەڵام من واهەستدەکەم تەماتە ڕەمزی خواردنی عاشقانەیە..)

گوتی: (لەبەر ئەوەی تۆ پێتوایە تەماتە دەتوانێ تۆڕی خانەکانی لەش و پێستمان لە هەڵوەشانەوە ڕزگار بکات و یەکێکە لەو چارەسەرانەی بۆ تووشبوو بە نەخۆشیی شێرپەنجە بەکاردەهێنرێ؟!)

گوتم: (ئاخر عاشقبوون لەم وڵاتەی ئێمەدا جۆرێکی شێرپەنجەیە و ئێمە لە عاشقبوونەوە دووچاری هەڵوەشانەوەیەك دەبین کە هیچ دەرمانێ چارەی ناکات و

پێویستە بۆ پتەوکردنەوەی تۆڕەکانی خانەی دڵ و بەستنەوەی دڵەکان پێکەوە، پەنا بۆ تەماتەی عەشق ببەین..)

قاقایەکی لێدا و مووچڕکەیەك بە لەشمدا هات، هەستمکرد بەجۆرێ تەماشام دەکات، وەکئەوەی من شتێ بم بۆ خواردن. بۆنی خواردنیش ئەو هەستەی پتر لەلام بەهێز دەکرد..

چاوم کەوتەوە سەر قاچ و قوولە ڕووتەکانی، بەڵام ئەمجارەیان ڕەنگی شینی بۆیەی نینۆکی پەنجەی قاچەکانی سەرنجیان ڕاکێشام. بۆ ساتێك هەستمکرد، لەچاوی ئەو تیمساحانە دەچن، کە لەژێر ئاوەوە، خۆیان ماتداوە بۆ ئەوەی لە پڕ هەڵتلووشن و قووتت بدەن.. هێواش هێواش چاوم لەسەر پەنجەی قاچەکانی گواستەوە و بەسەر خشتە مەڕمەڕەکاندا، کە قەتاری شارە مێروولەیەکی زەردیان بەسەردا دەڕۆیشت، نیگام گواستەوە سەر سێیەمین پلیکانە، کە لەملاولایەوە دوو ئینجانەی لەسەر بوو، لەهەر کامێکیاندا گوڵێکی دەمەشێر ڕووا بوو. لە شوێنی خۆم وەستام و خەریك بوو هەنگاو بۆ دواوە هەڵبێنمەوە، کە هەردوو دەستەکانی بۆ درێژ کردم و گوتی: (مەترسە.. ناتخۆن..) و پاشان دایەوە قاقای پێکەنین و وەکئەوەی بیەوێ ڕامکێشێتە ژوورەوە، بەرەو لای خۆی کێشی کردم.. لەهەمان کاتیشدا بۆخۆی پاشەوپاش لە دەرگاکە چووە ژوورەوەو ڕێگاکەی بۆ من چۆڵکرد.. لەبەرئەوەی نەمدەویست پێبنێم بە قەتارەی مێروولە زەردەکاندا، تەماشای قاچی خۆمم کرد و بینیم مێروولەکان بەقەراخ دەرگاکەدا، لەکاتێکدا هەریەکەیان شتێکی بەدەمەوە گرتووە، دەچنە سەرەوە.. کاتێ وردتر سەرنجمدایە لێواری دەرگاکە بینیم بە لاشیپانەکەیەوە، وێنەی مارێکی لوولخواردوو، خەمبار و لەهەمان کاتیشدا چاوتیژ، سەرنجی ڕاکێشام.. پێشئەوەی هەنگاو بۆ ژوورەوە بنێم، دیتم مارەکە خۆی ڕاپسکاند و لەکاتێکدا مێروولەکان بەسەر لاشەیدا قەتارەیان بەستبوو، ئەویش کەوتە جووڵە و چوو لەناو تاقێکدا کە بەلای چەپی دەرگاکەوە بوو، پەنگی خواردەوە. دواجار تەماشامکرد، تاقەکە هاتەوە یەك و سەروو کەللەی تیمساحێ پەیدابوو، کە بەچاوە مەستەکانی

تەماشای دەکردم.. لەمکاتەدا جارێکی دیکە، زرینگ و هووڕی گواره و ترینگەی ئەو بازنە و ملیوانکانە و هاشەی ئەو پەڕۆ ڕەنگاو ڕەنگانەم بیستەوە، کە بە لقی درەختەکەوە هەڵواسرابوون..

ئەو جوانتر و ئارامتر بوو لەهەر کاتێ، کراسە مەخمەڵییەکەی دەیبردیتە ناو جیهانێکی پڕخەونەوە. لە هۆڵەکەدا، مافوورێکی توورکیی نەرم ڕاخرابوو، کە لەناوەڕاستیدا گوڵێکی سووری پێوە بوو. لەسەر گوڵەکە مێزێکی گەورە داندرابوو، کە دیار بوو لەداری گوێز، دروستکرابوو. سەر مێزەکە شتێکی دیکەی نەدەگرت..

گوتم: (زۆر ماندوو بوویت..)

یەکەمجار خواردنە سەرەکییەکە سەرنجی ڕاکێشام کە لەناو بەلەمێکدا لەشێوەی پارچە کولیچەی گەورەدا خۆیان دەنواند. بەڵام ئەو پەرداخەکانی نیوەکرد لە شەراب و فەرموی لێکردم. لەکاتی نۆشکردندا دیققەتیمدا: پەنجەکانی بەشێوەیەکی ئەوتۆ باوەشیان بە پەرداخەکەدا کردبوو، حەزتدەکرد شووشەبایت و ڕۆحت بچووبایە ناو پەرداخێکەوە تا بۆ هەمیشە هەستت بە ئارامیی کردبا..

لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەم وڵاتە هەرگیز نیشتیمانی ژن نەبووە.. لەم وڵاتەدا ئەو هەموو زبڵ و شووشەی بەتاڵ و پاکەت و قنچکە جگەرەیە لە پیاو قەبووڵ دەکرێ، بەڵام ژن بە خواردنەوەی قوومێ شەراب خوێنی خۆی حەڵاڵدەکا.. بەدەستی خۆی دانەیەکی لە کولیچەکان خستە سەر پێشدەستییەکەی بەردەمم و فەرمووی کردم.

گوتم: ئەمە چ بۆنێکە لەم خواردنەوە دێت و چۆنت دروستکردووە؟. گوتی: جارێ تامیکە بزانە بە دڵتە؟ بە چەتاڵەکە پارچەیەکم لێکردەوە و ئەویش لەم کاتەدا دوو قاپ زەڵاتەی تێکرد، یەکێکیانی لای منەوە و ئەوەی دیکەیشی لای خۆیەوە دانا.. لێیم دووبارە کردەوە: چۆنت دروستکردووە؟ گوتی: دەمویست خواردنێ بێت تەعبیر لە مێینەیی بکات..

گوتم: تابلێی خواردنێکی خۆشە.. بەتایبەتی لەگەڵ ئەم زەڵاتەیەدا.

پاشان بۆی باسکردم کە دروستکردنیشی زۆر ئاسانە. ئەو سەرەتا کەمێ قیمە لەگەڵ پیاز و جۆرەکانی سەوزەدا دەجنێ و سووریان دەکاتەوە، بەڵام شویتی زیاتر تێدەکات، کە پاشان بۆنێکی زۆر خۆشی دابووە خواردنەکە.. دوائیەوە، چەند پارچەیەك هەویری ئامادە (*Superfresh*) لە فرێزەر دەهێنێتە دەرەوە و لێدەگەڕێ خاو ببنەوە. ئەو دەیگوت: (حەزمکرد کەمێ هەویرەکە بە لەپی دەست بشێلم تاکو زیاتر پانببێتەوە).. میهرەبانی دەستەکانی بە خواردنەکەوە دیار بوو. گوتیشی: (حەزمدەکرد، لەو زنجیرەیەدا کە باسی نانت کردبوو، نووسیبات: لە دنیای کۆندا، یەکەم قوربانی کە مرۆڤ دەیبەخشێتە یەزدان نان بووە. ئەو نانەی کە هەویرەکەی بە دەستی ژن شێلدراوە!).

گوتم: من ئەوەم نەدەزانی..

گوتی: زۆرجاران فەرامۆشکردن لە گەمژەییەوە نایەت..

گوتم: مەبەستت چییە؟!

قومێکی دیکەی لە شەرابەکە دا و گوتی: ژن زەحمەتی شێلانی هەویرەکەیان کێشا، پیاویش دەیویست شانازییەکەی بۆخۆی بێت..

بەدەم جوینی پارووێکی ترەوە، گوتم: دەتەوێ بڵێی یەکەم دزی پیاو کردوویەتی؟!

گوتی: ناڵێم دزی، بەڵام ئەوەی نانەکەی دروستکرد ژن بوو، کەچی پیاو بەناوی خۆیەوە قوربانییەکەی پێشکەش بە یەزدان کرد.

بۆ ئەوەی کەمێ دڵخۆشیی خۆم بدەمەوە، گوتم: (ئاخر یەکەم گوناه پیاوکردی و دەبوو هەر ئەویش داوای بەخشین بکات..).

قاقایەکی لێدا و بەردەوام بوو لە باسکردنی شێوەی دروستکردنی خواردنەکەی. وەك ئەو دەیگوت لەکاتی سووربوونەوەی قیمە و سەوزەکاندا خەریکی زەڵاتەکەی بووە. بەبێئەوەی بۆ جنینی پێکهاتەکانی، چەقۆی بەکار هێنابێ.. بەبڕوای ئەو تامی زەڵاتە لەو سیحرەدایە کە ژن لە ڕێگەی پەنجەکانییەوە تێکەڵ بە خواردنەکانی دەکات. مچووڕکەیەك بەسەرتاپای لەشمدا هات و هانام بۆ شەرابەکە برد. ئەو سوور بوو

لەسەر ئەوەی تەماتە و خەیار و کاهوو، کەلەم و نەعنا و بیبەر و هەر سەوزەیەکی دیکە، لەوە ناسکترن کە بۆ جنینیان لە زەلاتەدا، چەقۆ بەکار بهێنین.. وابزانم بە شەیتانانە گوتم:

(لەبەرئەوەی بەلای تۆوە چەقۆش داهێنانێکی پیاوانەیە لەبواری توندوتیژیدا؟)

لەوەلامدا گوتی: (زیاتر لەبەرئەوەی زۆر وردکردنی ئەو شتانەی زەلاتەیان لێدروستدەکەین، چێژەکەیان لەدەست دەدا..). دیسانەوە هەستم بە گەمژەیی خۆم کرد..

لێم پرسی دوایئەوەی قیمە و سەوزەکانت سوورکردنەوە و زەلاتەکەت دروستکرد چیتکرد؟ گوتی ئیتر هەموو شتێ ئاسانە، تێکەڵەی قیمە و سەوزەکان بە کەوچك دەکەیتە ناو هەویرەکەوە و لە شێوەی یاپراخ، یان شەکللەمەدا دەیپێچیتەوە. پاشان لەتاوەیەکدا، کە کەمێ رۆنی تێدایە پارچە خواردنە شەکللەمەییەکان دادەنێی و ئاگرێکی کەمی دەدەیتێ بۆئەوەی بە هێواشی ئەمدیوە و دیوی هەویرەکە ئاڵ ببێ.. دوایئەوەش لەسەر بەلەمێ چەند دانە دەستەسڕی کلینکس دادەنێی و خواردنەکەیان دەخەیتە سەر. دەستەسڕەکان بۆ ئەوەن چەورایی خواردنەکە بمژن..

** **

تا ئەوکاتە سێ پارچەم لەو خواردنە بە زەلاتە و پەرداخێ شەرابەوە، خواردبوو. هیچ هەستم بە نارەحەتی نەدەکرد. لەوە دەچوو پێکەوەدانیشتن لەگەڵ ژندا، رەهەندە هەرە قووڵ و چێژبەخشەکەی خواردنی ژنانەبێت. نە دانیشتن لەگەڵ ئەمیان و نە خواردنی ئەویان ماندووت ناکەن و پەشیمانت ناکەنەوە.. **هەرپیاوێك لە ژیانی خۆیدا، ئەگەر بوار بەخۆی نەدات بەهەمان شێوەی لەگەڵ هاورەگەزەکانی خۆیدا دادەنیشێ و گفتوگۆیان لەگەڵ دەکا، لەگەڵ ژنیشدا نەبێتە هاوسفرە و هاودەنگ، بەرلەوەی بمرێ، خۆی کوشتووە.** مۆنتینی گوتویەتی: (ئەگەر رۆح لە دانیشتن لەگەڵ ژندا بەهەمان ئەندازەی پیاو سوودمەند نەدەبوو، ئەوە هەستە جەستەییەکان، کە لەکاتی دانیشتن لەگەڵ ژناندا زیاتر هەستیارن، دەبوونە هۆی ئەوەی پلەی دانیشتن لەگەڵ

ژندا بگەیەننە هەمان ئاست و پلەی دانیشتن لەگەڵ پیاودا). مۆنتنی بەم گوتەیەیدا بەئاشکرا پلەی دانیشتنی پیاو و پیاگ، لەسەرووی دانیشتنی پیاو و ژنەوە دادەنێ، کەچی کەمێ دوایئەوە، وەکئەوەی لەم قسەیەی ژێوان بوویێتەوە، دەنووسێ: (هەرچەندە بە دیتنی من دانیشتن لەگەڵ پیاودا هەرگیز ناگات بە قولاپەپێی دانیشتن لەگەڵ ژندا..). لەمەش سەیرتر ئەوەیە، مۆنتینی لە درێژەی قسەکانیدا وەکئەوەی بیەوێ یەکسانییەك لەنێوان ستایشکردنی ئەو دوو دانیشتنەدا بەدیی بهێنێ، بەڵام بەسوودی ژن، دەنووسێ: (سەرقاڵکردنی هەموو فیکر و زیکری خۆت بە ژنەوە و شەیدایانە و بەبێ خۆ جڵەوکردن و بێسنوورانە هەڵەوگیربوون پێیانەوە، شێتییە. وەلێ، لەلایەکیتریشەوە، بەبێ خۆشەویستی و هەڵەوگیربوونی سۆزدارانە، وەکئەوەی هونەرمەندانی شانۆ بۆ نواندنی ڕۆڵەکانیان پێیهەڵدەستن و بێجگە لە قسەکردن هیچیتریان مەبەست نیە، هەرچەندە دەبێتە هۆی بێسەرئێشەیی، بەڵام ئەوە کارێکی ترسەنۆکانە و گەلحۆیانەیە..)..

مۆنتنی، بە پێچەوانەی ئێمەی خەڵکی ڕۆژگاری مۆدێرن و بانگەشەی یەکسانخوازییەوە، لەکاتی ئەم قسانەدا هیچ جیاکارەیەك لەنێوان جۆری ژنەکاندا ناخاتە ڕوو، وەکئەوەی ئێمە لە ئەمڕۆی ژیان و هزرینی خۆماندا پێوەرگەلێك بەکار دەهێنین و لەڕێگەیانەوە نایەکسانییەك دروستدەکەین. بۆنموونە مۆنتنی ناڵێت: تەنیا ژنە جوانەکان، یان لاواز و قەدباریکەکان، یان وردیلە و ئێسك سووکەکان، شایانی ئەوەن ببینە هاوسفرە و لەگەڵیان دابنیشین. چونکە وەکئەو دەڵێت: (هیچ ژنێ نیە، سەروسەکووتیشی هەرچۆنێ بێت، خۆی بە خۆشەویست و مەحبووب دانەنێ و نەیەوێ بەهۆی گەنجایەتی، ڕووخۆشی و ڕەفتاری جوانەوە، دولبەرئاسا نەیەتە بەرچاو، ئەمەش لەبەرئەوەی بەگشتی ژمارەی ژنە ناشیرینەکان زۆرتر نین لە ژمارەی ژنە بەسەروسەکوتەکان..). ئەم قسەیەی مۆنتینی بەوەشدا ڕاستە، کە دەبینین ژنان لەناوخۆشیاندا و لە ژیانی کۆمەڵایەتیاندا، هەرگیز ڕەهەندی جوانی ناکەنە پێوەر بۆئەوەی هاوڕێیەتی لەگەڵ یەکتردا ببەستن. هەرگیز دەستەخوشکەکان لەبەرئەوەی

بەقەدەر یەکتر جوانن، نابنە هاوەڵی یەکدی.. هێندەی ئەوەی ژنان لە ناخی خۆیاندا میهرەبانی، ڕەفتار و گوفتاری جوان و نەرم و نیان، سەرنجی ئەوان بەلای یەکتردا ڕادەکێشێ و هەر ئەو خەسڵەتانەش ئەوان لەیەکتر نزیکدەخاتەوە و جوانترین نمونەی پەیوەندیی هاوڕێیەتی لە نێوان خۆیاندا بەرجەستە دەکەن.. وەك مۆنتێنیش گوتویەتی: (ئەگەر ژنانێکیش دەبینین کە فڕوفێڵ دەکەن، لەبەر ئەوەیە پیاویان کردۆتە سەرمەشقی خۆیان.. فڕوفێڵی ژنان دەگەڕێتەوە بۆ فێڵباز، نەك بۆ ئەوان). ئەوان، تەنانەت ئەگەر شەرابیشیان لەگەڵ بخۆینەوە و بەتەنیاش سەردانیان بکەین و لەناو پارك و شەقامەکانیشدا پیاسەیان لەگەڵ بکەین و دەعوەتیشیان بکەین بۆ خواردنەگەیەك، بەوە نابنە قەحپە و سۆزانی، وەکئەوەی کۆمەڵگای ئێمە ناویان دەبات.. بۆیە دەکرێ ئەو قسە باوە کوردییە هەڵگێڕینەوە کە دەڵێت (لە پشت هەر پیاوێکی گەورەوە ژنێکی مەزن) هەیە و بڵێین: زۆر چاکە، بەڵام (لە پشت هەر ژنێکیشەوە کە ئێمە بەچاوی سووك و قەحپە و سۆزانی تەماشای دەکەین، پیاوێکی قەحپە و سووكوسەلیم هەیە).. بەم پێیەش هەمیشە ژمارەی پیاوە قەحپەکان زیاترە لە ژمارەی ژنە سۆزانییەکان..

ئەو بەو هەموو میهرەبانیی و هێمنی و سیحرە مێیینەییەی خۆیەوە، لە دەرگاکەوە بەڕێی کردم، کە ئیدی قەراخەکانی بە جۆرەها گوڵی ڕازەوە خۆیان داپۆشیبوو. مێرووولەکان لەوێ نەمابوون، تاق و مار و تیمساحەکە ببوونە گۆزەیەکی تەڕ.. کەواتە بیرمکردەوە: دەبێ لە چوونەخوارەوەشمدا بە پلیکانەکاندا، تەفسیرێکی دیکەی گوڵەکان بکەم: دەمە شێرەکان هێز و وورەیان پێدەبەخشیم، گوڵە ڕەنگ هەناریەکان چێژ و تەبایی و گوڵە سپییەکانیش داوەتیاندەکردم بۆ ئەزموونکردنێکی دیکەی ژیان، کە ژن دەیخستە بەردەمم.. ئەزموونێکی سپی سپی، وەك نیشانە بۆ پێشوازیکردنی ژیان لێم.. پێموابێ ئیدی لەوە تێگەیشتم کە دەبێ مرۆڤ سەرەتا بچێتە ناو دنیای ژنەوە، پاشان ژن ڕێگای ژیانت پیشانبدات..

درەختەکە لەشوێنی خۆی دەشنایەوە، بەو هەموو ڕەنگانەوە، بەو هەموو دەنگانەوە خۆی دابووە دەست باوەشی هەوایەکی فێنکی شەوێکی درەنگ و مەست.. ئیعتیراف

دەکەم: من بەهەوای (خواردنی ژنەوە) چووبوومە ماڵەکەیەوە، بەڵام ئەو فێریکردم، کە چێژ ئەوەتا لە (خواردنی ژنانە)دا.. بۆیە جارێکی دیکەش هەستم بە گەمژەیی خۆمکرد! هەستمکرد داگیرکاری یەکەم لەم وڵاتەدا ئەو پیاوە گەورانەن کە باخچە و سەیرانگا و خواردنگە و مەلەوانگە و سەر سووچ و سەر شۆستە و بازاڕ و شوێنەگشتییەکانیان داگیرکردوون و بەچاوە تێرنەخۆرەکانیانەوە، بە نیگا شەهوەتریژەکانیانەوە، لەکاتێکدا خەریکی سمێڵ جوین و دەستێکیان لە گونیاندایە، بە زمانە دڕە توانج ئامێزەکانیان هەزاران کچ و ژنی ئەم وڵاتەیان لە هاتنەدەرەوە، لە چوونە باخچە و دانیشتن لە سێبەری درەختێکدا لە (باخی گشتیی پیاوان)، مەحرووم کردووە.. بۆیە زۆرجار بیردەکەمەوە، زەکەری پیاو لە وڵاتی ئێمەدا چیدی لەناو لنگیدا نەماوە، بەڵکو هاتۆتە چاوییەوە.. هەربۆیەشە لە هیچ شارێکی ئەم وڵاتە (زۆر دیموکراسیی و ئازادیخوازە)دا، یەك وێنەی (لەیلا فەریقی) نەماوە قیریان پێدا نەکردبێ، قیر بەهەموو ئەو پانتاییانەدا کە ژنانەیی و مێیینەی ئەو هونەرمەندەیان لێدەبارێ، لەکاتێکدا پیاو نەماوە لەم وڵاتەدا دەستپەڕی پێوە لێنەدابێ..

# خواردنیی (نابینا)

***(کوێر) و (نابینا):***

تۆ وای دابنێ نابینـایی و کـوێری وێسـتگە و ئـەنجامێکی ژیانـە هـەمووومان ئـەزموونی دەکەین و کردومانە بەبێ ئەوەی هەستمان پێکردبێ. تەنیا ئەم گریمانەیە بەسە بۆئەوەی بەکۆی بیرکردنەوەکانماندا لە ئاست نابینادا بچینەوە. ئەوکاتـەش نـەك ژیـان، بـەڵکو کۆی خواردنەکانیش تاموچـێژێکی دیکـەیان دەبـوو، ئـازیزم. هـەر بـەم بۆنەیەشـەوە دەمەوێ بزانیت کە هەر هەوڵدانێکت بۆ خـۆ بـەدوورگرتن لـەو وێسـتگەیە و لـەو ئەزموونە، چاوپۆشینە لە بەشێکی گەورەی ژیان!

من نازانم تۆ چی لەم قسانەی من تێگەیشـتیت، بۆیـە هاوکـات بـەوەی حـەز دەکـەم جارێکی دیکەش ئەو دوو ڕستەیە بخوێنیتەوە، منـیش هەوڵـدەدەم زیـاتر مەبەسـتەکەی خۆمت بۆ ڕوونبکەمەوە، بەبێئەوەی مەبەستم بێ بڵێم: من باشتر لەتۆ دەبینم. چـونکە ئەوانەی هەمیشە تەماشا دەکەن مەرج نییە ببینن، هەروەکچۆن ئەوانەی چاویان کـوێر بووە و ناتوانن تەماشا بکەن مەرج نییە نەتوانن ببینن. لێرەشەوە ئێمە لە زمانی خۆماندا کێشـەیەکمان هەیـە لـە ناونـانی کەسـانێکدا، کـە چـاویان وەك چـاوی مرۆڤێکـی (سرووشتی)، نابینێ و بەوانە دەڵـێین (نابینـا)، یـان (کـوێر)، هەڵبـەت لـەنێوان دوو کەوانەدا.. بەڵام زەحمەت نەبێ با ئالێرەدا بوەستین و هەڵەیەك ڕاستبکەینەوە، کە لـەو دوو ڕستەیەی سەرەوەدا کردم و هەموومان ڕۆژانە ئەو هەڵانە دەکەین.

مەبەستمان لە دەستەواژەی (چاوی مرۆڤی سرووشتی)چییە؟ ئەگـەر ئێمـەی چاوسـاخ پێمانوایە لە (نابیناکان) سرووشتی تر و مـرۆڤترین، ئـەوە خـودی ئـەو بڕوایـە و هـەر

بڕوابوونێکی دیکەی لەو بابەتە کە فەزڵی ئێمە بدات بەسەر نابیناکانـدا، بەڵگەیـەکی باشی (نابینایی) ئێمە دەردەخات و نیشـانەی ئەوەیـە ئێمـە (تەماشـا) دەکـەین، وەلـێ (نارِوانین)، چاومان کار دەکات، بەڵام نابینێ، سەرنج دەدەین بـەڵام نیگامـان خاڵییـە لەو بابەتەی کە سەرنجماندەوەتێ و تەماشامانکردووە.. بۆیە هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نییە دڵنیامان کاتەوە لەوەی ئێمەی چاوساخ لە مرۆڤێکی بە زگماك نابینا سرووشـتیی ترین، لەبەرئەوەی گوایە ئەو شتانەی ئێمە تەماشـایان دەکـەین، ئـەو نایانبینـێ.. ئـەم تێڕوانینە تەنیا هەڵەی ئەو کەسانەیە کە لەڕوانگەی دوالیزمی (ساخ) و (نەخۆش)ـەوە سەیری دنیا دەکەن و بەو پێیەش هەرکەسێ وەکو خۆیان بێت بە مرۆڤێکی سرووشتی، ساخ و بێخەوشی دەزانن و ئەوەی لـە خۆشـیان نەچـوو بـە (ناسرووشـتی، وەحشـی، نەخۆش و مەترسیدار)ی لەقەڵەم دەدەن.

بیرۆکەی فاشیزم، بەشێوەیەکی متبوو لەناو ئەم تێڕوانینەدا و زۆر لـەپێش سـەرهەڵدانی فاشیزمەوە وەك ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی، ئامادەییەکی بەرچاوی هەیە و بۆی هەیە لـە هەلومەرجێکی پێویستدا هەمان بیرۆکە خۆی لەهـەر بۆنەیەکـدا مانیفێسـت بکـات.. فاشیزم بە یەك بەڵگە دەرکەوتەیـەکی سیاسـییە و بـە سـەدان بەڵگـە سەرچـاوەیەکی ئۆنتۆلۆژیکی هەیە کە پەیوەستە بە بـوونی بوونەوەرێکـەوە بـەناوی: مرۆڤـی سـاخ و بێخەوش..

ئێمە لە کۆمەڵگای خۆماندا چۆن مامەڵەی چەمکی نابینا و کوێرمانکردووە و ئایا لـە واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتی ئێمەدا کوێر و نابیناکـان لـە چ ڕۆژگارێکـدا ژیـان بەسـەر دەبەن؟ بێگومان حاڵ و گوزەرانی ئەوان لە کۆمەڵگای ئێمەدا باشتر نییە لە گوزەرانی ئەوان لەهەر کۆمەڵگایـەکی دی، کەتیایـدا چاوسـاخ بـۆ کوێرەکـان بیردەکاتـەوە و بڕیاریان بۆ دەدات.. واتە ئەوان لەهەر کوێیەك بن، مـادام مرۆڤـی سرووشـتی خـۆی دەخاتە بری ئەوان و نوێنەرایەتیان دەکات و لەجیاتی ئەوان بڕیار دەدات، بارودۆخیان باشتر نییە لەو بارمتانەی کە بەدەسـت عەقڵییـەتی چاوسـاخەکانەوە گیریـانخواردووە. عەیبی هەرە گەورەی چاوساخ و مرۆڤی سرووشتی لەئاست نابیناکاندا، هەر نییـەتێکی

باشیشی هەبێ، ئەوەیە کە ناتوانێ دەرکی دنیای ئەوان بکات و لە دنیای خۆیەوە، لە بەرژەوەندی خۆیەوە و لە هوشیاریی خۆیەوە دەڕوانێتە دنیای ئەوان و پێویستییەکانی ئەوان.. ئەمە هەڵوێستی مرۆڤی ساخیشە لەبەرامبەر بەتەمەنەکان، کەمئەندامان و تەنانەت منداڵانیشدا. عەیبی ئەم مرۆڤە و نەخۆشییە هەرە سەرەکییەکەی ئەوەیە کە هوشیاریی بەرامبەر بەو گرووپە مرۆییە کۆمەڵایەتیانە، هوشیارییەکی (*باڵاخوازانەی سەپاوی ناکامڵە*). هوشیاریی ئێمە بەرامبەر بەوانەی بە نابینا و کوێر ناویان دەبەین، لە بینایی و چاوساخیی خۆمانەوە هاتووە، بەڵام ئێمە دەزانین کە چاوی ئێمە و ئیدراکی ئێمە سەبارەت بە تێگەیشتن لە شتە زۆر سادەکانیش پڕن لە هەڵە و کەموکوڕی. سەرچاوەی ئەو هوشیارییە، باڵاخوازانەیە، چونکە مرۆڤی چاوساخ خۆی لە نابینا پێبەرزترە. هوشیارییەکی سەپاوە، چونکە چاوساخ پێیوایە باشتر دەتوانێ بۆ نابیناکان بیربکاتەوە و بڕیاریان بۆ بدات و چاوساخییان بۆبکات. ناکامڵیشە، چونکە ئەزموون ئەوەی سەلماندووە کە تێگەیشتنی ئێمە بۆ جیهانی دەوروبەر و دنیای کوێرەکان هیچ وردبینانەتر نییە و پڕە لە هەڵەی کوشندە و ئاکامی خراپ..

ئەزموونی مێژوویی ئێمە لە تێڕوانینیدا بۆ نابیناکان زیاتر لەوەی بینینی ئەوان بووبێ، تەماشاکردنیان بووە. ئێمە هوشیاریی خۆمان لە ئاست ئەواندا لەسەر بنەمای تەماشاکردنەوە دامەزراندووە نەك بینینیانەوە، ئێمە کوێرەکانمان وەك نابینا و حافزی مزگەوتنشین پۆلێنکردووە، لەسەر سۆشتە و ڕاڕەوەکان وەك سواڵکەر هاتوونەتە بەرچاومان، لەسەر شەقامەکان بەخۆیان و گۆچانەکانیانەوە سەرنجمانداون، وەك باوەپیارە و نەنك لە ماڵێکدا پێکەوە ژیاوین و بۆی هەیە جارێ لەجاران لەناو پاسدا پرسیارێکیان لێکردبین و هتد. بەڵام وێنەی باوی ئەوان لە زەینی ئێمەدا وێنەی ئەو مرۆڤە دەستوپێ سپییەیە کە ڕۆژانی هەینی لە مبەراوبەری دەرگای مزگەوتی گەورەدا ڕیز دەبن بۆ ئەوەی خێریان پێبکەین.. هەموو ئەم پۆلێنکردن و سەرنجدان و تەماشاکردن و وێناکردنانە، نیشانەی نەبوونی هوشیاری و ڕۆشنبیریی ئێمەی چاوساخە، ئێمەی مرۆڤی تەندروست و خۆبەشتزانە لەئاست ئەو مرۆڤانەدا کە جیهان

لە ڕوانگەی خۆیانەوە ئەزموونەکەن.. ئێمە بەو هەڵوێستەمان لە ئاست ئەواندا هیچمان نەسەلماندووە لە نابینایی و نەبینینی خۆمان زیاتر. ئێمە هیچمان نەویستووە لە سەپاندنی دەسەلاتی بالاخوازانەی خۆمان زیاتر بەسەر ئەواندا، کە بەهۆیەوە نەزانیی خۆشمان شاردۆتەوە.. سەیر لەوەدایە کە نەزانی پێکهاتەیەکی شاراوەی فاشیزمە. لە ئەورووپا بە ڕەگەزپەرستەکان و ئەوانەی ڕقیان لە پەنابەران دەبێتەوە، هەرچی دەڵێی بڵێ، قەبووڵی دەکەن، تەنیا مەڵێ: ئێوە نەزانن.. نەزانی هاندەری شاراوەی ڕق لێبوونەوە و خۆبەگەورەزانیی و ئەوانیتر بە هیچزانییە، کە بەردەوام پێویستی بە چەپاندن هەیە. بۆیە فاشییەکان هەرتەنیا ئەوکەسانە نین کە نیشانەی فاشیزم لە قۆڵ و ناوچەوان و لاملی خۆیان هەڵدەکۆڵن و هاواردەکەن: (بژی هیتلەر)، بەڵکو ئەوانەشن کە وزەی زۆر بەکار دەهێنن بۆ چەپاندنی ئەو ڕقەی بەرامبەر بە مرۆڤ و بوونەوەری زیندوو و کۆی ژیان، لەدڵیاندایە. مرۆڤی فاشی، بەو حوکمەی نەزانە، خۆبەکەمزانە و کاتێ دەڕوانێتە ناخی خۆی لە ڕق و ئیرەیی زیاتر هیچی تێدا نییە، لەهەر پلەوپایە و پۆستێکدا بێت ئەو نەزانی و ڕقەی لێئاشکرا دەبێت.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کە دەمانەوێ بەهۆی ڕووناکایی یاسایی و مافی مرۆڤەوە، کەمێ خۆمان لەو تاریکایی و نابیناییە مێژوویییەی تیایدا دەژین، ڕزگار بکەین، پێویستە ئەو ڕووناکاییە هێندە بەهێز بێت کە بەهۆیەوە هەم نابینایی خۆمان و هەم تایبەتمەندیی ئەوانەش ببینین کە ناومان ناون (کوێر و نابینا). چونکە تەنیا بەهۆی دەرککردنی تایبەتمەندیی جیهانی ئەوانەوەیە کە جیهانی چاوساخان دەتوانێ خۆی ڕوونتر بکاتەوە و دەست لەو ستەمکارییە هەڵبگرێ کە ئایدیۆلۆژیای فاشیزمی متبوو، مرۆڤی سرووشتی و مرۆڤی کامڵ، بەهۆیەوە توانیویەتی دنیامان لێتاریك بکات.. کەواتە دەمەوێ بڵێم: بۆ هیچ ساتەوەختێك کۆمەڵگای ئێمە بەدەرنەبووە لەو ئەندامانەی کە وەکو ئەوانیتر تەماشا ناکەن و نابینن. کۆمەڵگایەکمان نییە تیایدا کوێرەکان و نابیناکان نەبینینەوە، هیچ شارستانیەتێکیش نییە لەمێژووی شکۆمەندیی خۆیدا، بەدەربووبێ لەو کەسانەی کە بینیویانە بەبێ ئەوەی وەکو ئێمە تەماشایان کردبێ. بۆیە بیرۆکەی کۆمەڵگای

تەندروست، کۆمەڵگای هوشیار، کۆمەڵگای کراوە، کۆمەڵگای ڕۆشنگەر و مەدەنی، ئەگەر بەمانای کۆمەڵگای مرۆڤە چاوساخەکان بێت، هەر لە بنەماوە بوونی نەبووە و نابێ. هەمیشە ڕۆشنگەریی و مەدەنییەتی کۆمەڵگایەك پەیوەستە بەو ڕەهەندەی بینینیشەوە کە دەتوانێ لە ڕێگەیەوە وێنای ئەو شتانە بکات کە چاوی ساخ، زانستی پێشکەوتوو، عەقڵی ڕۆشنگەر و مرۆڤی مەدەنی، نایانبینێ.. ئێمە لە قۆناغەکانی ژیانی ڕابردوومان‌دا، مامەڵەیەکی پەراوێزئاسامان لەگەڵ ئەوانەدا کردووە کە وەك (نابینا) پۆلێنمانکردوون. لەو مامەڵەیەدا، نابیناکانمان لەوەدا پێناسە و بچووککردوونەتەوە کە هیچ نابینن و ناتوانن هەست بەو شتانە بکەن کە ئێمە لە بەردەم ئەواندا دەیکەین. ئێمە تێگەیشتنێکی فەسلەجی ڕووتمان بۆ چەمکی نابینا هەیە و لەو تێگەیشتنەشدا چاوی ساخمان کردۆتە پێوەر بۆ حوکمدان، کوێریی ئێمە، فەسلەجی نییە، بەڵکو عەقڵییە!

***هەندێ بیرەوەری لەگەڵ نابینادا:***

من لەدوای هەژدەساڵیمەوە چاوم کز بوون، بەڵام هەرگیز نابینا نەبووم، لە بنەماڵەکەشماندا کەسمان نییە بە زگماك نابینا بووبێ، لەگەڵ نابیناکانیش نەژیاوم، هێندە هەیە جاروبار خواردنم لەگەڵ خواردوون، لەگەڵ نێرینە و مێینە و لەگەڵ جەوان و بەتەمەنیان و لەگەڵ کورد و غەیرەکوردیاندا.. بۆیە ئەگەر لەمبارەیەوە قسان دەکەم، سەرچاوەی قسەکانم لەو ئەزموونەوەیە کە بەفیرۆم نەداوە، نەك لە بەهرەیەکەوە کە بە زگماك خودا پێمی بەخشیبێ، ئەگەرچی دەزانم نابینایی وێستگەیەك و ئاکامێکی ژیانە و هەموومان لە سەردەمێکدا ئەزموونی دەکەین.. دەتوانم بڵێم شتگەلێ لەبارەی نابیناکانەوە دەزانم و لێیانەوە فێربووم، کە لە هەردوو کتێبی (***دنیای شتەبچووکەکان و نەتەوەوحەکایەت***)دا سوودم لێوەرگرتوون و سەبارەت بە جیهانی ئەوان قسەم کردووە. بۆنموونە دەزانم پیاوی نابینا حەزی لە چ جۆرە جل وبەرگێکە و فەنتازیا بە چ جۆرە ژنێکەوە لێدەدات و بەچیدا دەزانێت ئەوە ئەو ژنەیە، کە بیری لێدەکاتەوە!.

دەزانم ژنی نابینای کەمتەمەن خەون بە کامجۆرەی پیاوەوە دەبینێ و چ بۆنێ: (بۆنی لەش، بۆنی هەناسە و بۆنی پۆشاك)ی بەلاوە خۆشە..

یەکەمجار لە ماڵی خۆمان، لە جەژنێکدا بوو باوکم پیاوێکی نابینای هێنابۆوە ماڵ و پێکەوە نانمانخوارد. لەدەیەی هەشتاکاندا، دەیەی نابیناکوژانی بەعس. ئەو دەیەی لەبیرچوونەوەی بەمانای (نابیناییەکی) کوشندەیە لە ژیانی هەمووماندا. ئەو ئەزموونەم لە یادوەرییەکی زۆر دووری خۆمدا پاراستووە کە هەندێ دیمەنی، لێڵی و تەمێك دایانپۆشیوە. ئەوەی لەو پیاوەدا بەدیمکرد و هەرگیز فێری نەبووم، بەهێواشیی خواردن و خواردنەوەی ئاو بوو لەپاش دوایین پاروو.. نانخواردنی بەپەلە شتێکە نامۆ بە دنیای نابینا، نابینایی ڕێگرە لەبەردەم خێراییدا، چجای بەخێرایی نانخواردن.. پاشان خواردنەوەی ئاو، یان دۆی تۆراخاوی و قەزوانـدار و ماستاوی کولکن، شتێ کە (مستەر ڕیچ) لەگەشتەکەیدا بۆ کوردستانی سەدەی هەژدەیەم، یەکجار دەیخواتەوە و ئیدی دەمی بۆ ناباتەوە، ئەو چێژە بوو کە ئەو پیاوە نابینایە فێریکردم و دوای ئەوەش کە پەرداخەکەی دانایەوە لەبەرخۆیەوە پێیگوتم، کە: (بۆی تێکەمەوە)!. پەرداخێکی دیکەم بۆ تێکردەوە و بەهێواشی لە لێوەکانی نزیکخستەوە و ئەویشی بەهێواشی هەڵدا. ئەمجارەیان باشتر گوێم بۆ خووڕەی چوونەخوارەوەی دۆکە، بە گەروویدا، گرت.. لە دەنگی ئاوێکی بە خووڕ دەچوو کە لەدوورەوە بەڕێوەبێت و بیەوێ لەم نزیکانە ئارام بگرێ.. بەدوایئەوەدا دەستەسرێکی لە بن پشتێنەکەی دەرهێنا و هەندێ دۆعای کرد و پێیگوتم کە سینییەکە لابەم. بە هیوای ئەوەی جارێکی دیکە گوێم لە خووڕەی چوونەخوارەوە بێت،گوتم: (ئەی پەرداخێکی تر دۆ ناخۆیتەوە؟). کە پەرداخەکەی بە لێویەوەنا، خۆمم لەشێوەی گەشتیاری ناو بەلەمێکی بچکۆلانە دەبینی کە چۆن شەپۆلێکی بەخووڕ بەناو توونێلەئەشکەوتێکدا هەڵیگرتووە و لە کۆتاییدا، بەبێئەوەی بەخۆم بزانم ئەوا گەیشتوومەتە سەر لێواری تاڤگەیەك، کە گەڕانەوە بۆ دواوە مەحاڵە.. هاکا بە شەتاو بەردەبمە خوارەوە بۆ ناو گۆمێك و.. شڵپەم دێ..

بۆ دووەمینجار لە دانمارك و لەو ماڵەدا کە پێنج ساڵی یەکەمی ژیانی تاراوگەییم تێدا بردەسەر، خانمێکی نابینام ناسی. ئەو لە خانەی نابینایان دەژیا، بەڵام بۆ جەژنی کریسمس هاتبوو لەگەڵ ئەو ماڵەدا جەژن بکات، کە من هەم کرێچی و هەم بەشێوەیەکی سێمبوولیك ببوومە کوڕیان و ئەو خانمەش دەبووە پووری دوو کوڕەکەیان.. لەدوای ئەوەی بەیەکتریان ناساندین، بینیم، چوو لەسەر گۆشەی قەنەفەکە، لەلای پەنجەرەکەوە دانیشت و شیشی گۆرەوی چنینەکەی لە جانتاکەی دەرهێناو کەوتە گۆرەوی چنین. گۆرەوی ڕەنگاوڕەنگ و گەرم لە کاموا. یەکەم پرسیاری لە من ئەوەبوو کە گوتی: *(Hvor kommer du fra?)*، واتە لەکوێوە هاتوویت، بەمانای (خەڵکی کام وڵاتیت؟) کاتێ بەدوای دەنگەکەیدا و لەناو هەراوزەنای هەردوو کوڕەکەی خاوەنماڵ لەسەر تەماشاکردنی ئەو دیاریانەی بۆیان هاتبوون، سەرم هەڵبڕی بۆئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە ئاسانە بدەمەوە، بینیم چاوی بڕیوەتە سیمام و چاوەڕوانی وەڵامە. وەلێ، وەڵامەکەم پڕاوپڕ نەبوو، چونکە بەلای ئەوەوە کوردستان *وڵات* نەبوو. بۆئەوەی وەڵامێکی دڵنیاکەری بدەینەوە، (دانیاڵ)ی خاوەنماڵ کە لەبەشی میکانیکی فڕۆکەوانی ئەندازیار بوو، کتێبی (ئەنسکلۆپیدیای جیهان)ی هێناو لاپەڕەی (کوردەکان)ی کردەوە و بۆی خوێندەوە. تائەوکاتە هیچ کەسێکم نەبینیبوو بەو دیقەتەوە گوێ بۆ شتێ بگرێ کە پەیوەندیی هەبوو بە کوردستان و کوردەکانەوە. لە گۆرەوی چنین وەستا و ملی بەولایەدا لارکردەوە کە دەنگی (دانیاڵ) زانیاری لەسەر کورد بۆ دەخستەڕوو. ئەو دەیویست چیدی لەوبارەیەوە بە نەزان لەقەڵەم نەدرێ، نەیدەویست فاشیزم لە بیرکردنەوەیدا خۆی بشارێتەوە، ئەو چاوی نەبوو، بەڵام دەیبینی.

ئەو خانمە لەوە دوا، هەموو ساڵێ لە جەژنی کریسمسدا جووتێ گۆرەوی ڕەنگاوڕەنگی بۆ دەناردم و لەو مانگی بەفر و تەنیایی و تاراوگەییەدا، بەو (نابیناییەی خۆییەوە)، چرایەکی خۆشەویستی لە ناخمدا هەڵدەکرد..

دوای ئەوانە و خوێندنەوەی هەندێ لە بەرهەمەکانی (بۆرخیس)، باوکی نابیناکانی جیهان، فیلمی (بۆنی ژن)م بینی کە تیایدا، (ئال پاچینۆ) وەلامی زۆرێك لەو پرسیارانەی دامەوە کە منی چاوساخ، بەلام نابینا عەودالّیان بووم و نەمدەزانین. ئەو نمونەی نابینایەکی توورەی پێناساندم، کە سەرچاوەی توورەبوونەکەی، نەك هەر تێکشکانە تایبەتی و دەروونییەکانی خۆی نەبوون، بەلّکو ئەو گەمژەییەی چاوساخان بوو کەئەو بەرگەی نەدەگرت. ئەو نمونەی نابینایەکی هوشیار و نارازیی پێناساندم کە دنیا و ژیانی زۆر جوانتر لە ئێمە دەبینی و چێژی لێوەردەگرت، نابینایەك، کە لەکارکەوتنی چاوەکانی ناچاریان نەدەکرد تەسلیمی مەرجی دنیای چاوساخان ببێت. نابینایەك، کە دەیویست بە سەربەرزی و کەرامەتەوە بژی و چاوساخ نەکاتە سەرگەورەی خۆی..

دواجار، لە پایتەختێکی گەورەی جیهانی سێیەم، لە هوتێلێکدا، خانمێکی نابینام ناسی کە دەیویست بزانێ ئاخۆ هیچ چارەیەکی هەیە بۆ چاکبوونەوە، چونکە ئەو لە منداڵییەوە چاوی لە ڕووداوێکدا لەدەستدەدات و ئەگەری چاکبوونەوە بۆ ئەو ئومێدێك بوو. ئەوەی لەو خانمەوە فێری بووم، نەشاردنەوەی نابیناییەکەی بوو، سەربەرزی و تەماشاکردنی ئەو بوو بۆ تۆ کاتێ قسەی بۆ دەکردی. هەستیاریی و ڕاستگۆییەکەی بوو کاتێ دەیگوت: (ڕەنگە کەس نەتوانێ و لە ڕووی زانستیشەوە ئیمکانی نییە چاوم چاکبێتەوە)، بەلام ئەو بەدوای نەشتەرگەرییەکدا عەودالّ بوو کە چاوەکەی کەمێ (سرووشتیانە) بنوێنێ. دلّم نەدەهات پێیبلّێم: (هیچ شتێ نییە مرۆڤ دەستکاریی بکات و سرووشتیانە بنوێنێ)، لەگەلّ ئەوەشدا لێیتێدەگەیشتم: ئەو لە ولاتێکدا دەژیا هێندەی ژمارەی پەنجەکانی دەست گولّفرۆشی تێدا نییە، هەموو شتێ ئەوەندە پلاستیکی و دەستکردە، کە وەك شتێکی سرووشتی بنوێنێ.. ئەو کورد بوو، کچ بوو، لەشارێکی مۆدێرنیزەبووی لە خۆڕازیی ڕوالّەتگەرادا دەژیا و دەیویست چیدی لەسەر ئەوەی چاوی لەدەستداوە، نەچەوسێنرێتەوە و هاوتەمەنەکانی و

هاوپیشەکانی لە شوێنی کار و سەرشەقامەکان، لچولێوی لێهەڵنەقرچێنن و فیزی بەسەردا لێنەدەن..

### مۆدێرنیتە و نابینا:

ئەزموونەکانی پاشترم، بینینی ئەو نابیناکراوانەی وڵاتی خۆمان بوون کە بە ئاشکرا جێدەستی بەعسییەکان و جەنگەکانی دیکەیان پێوەدیارن. نابیناکراوەکانی ئەنفال، نابیناکراوانی کیمیایی باران، نابیناکراوانی ژوورەکانی سزا و ئەشکەنجەدانی شەڕە ناوخۆییەکان، نابیناکراوانی شەڕی خێڵ و عەشیرەت و هتد.. ئەمجارەیان نابینا تاکەکەسێ نەبوو، بەڵکو ببوونە گرووپێکی کۆمەڵایەتی دیار.. هێندە هەیە سەردەمی ئەمڕۆ بەهۆی ئەو ڕۆحە دژە مرۆییەی لەخۆیدا شاردویێتییەوە، بۆ نابیناکان زۆر تاریکترە وەك لەسەردەمەکانی پێشووتر. لەسەردەمەکانی پێشووتردا، نابینایی لە پەیوەست بە ئیرادەی یەزدانەوە تەماشای دەکراو ئەوە بەس بوو تاکو هەموو توانایی و ئەندامەکانی دیکەی کەسی نابینا لەکار بخرێن و نابینا بەخۆی و گۆچانێکەوە کونجی عوزلەت و تەنیایی ناو ماڵی خوا، بگرێ.. لەسەردەمی ئێستادا نابیناکان تەسلیمی ئەم قەدەرە نابن، ئەوان نایانەوێ بەهۆی لەکارکەوتنی ئەندامی بینینەوە، کۆی ئەندامەکانی دیکەی جەستەیان ناچار بە پاسیڤێتی و پووکانەوە بکرێن. ئەوان ئێستا بەرامبەر بەخۆیان و تواناکانیان هوشیار ترن. وەلێ سەردەمی ئێستا لەگەڵ نابیناکان دڵڕەقترە، بەمانای (دڵکوێرترە) لە جاران. مۆدێرنیتە بەو دیوەدا کە هوشیارییەکی پتر سەبارەت بە نابینایی هێناوەتە ئاراوە و تەکنەلۆژیایەکی خستۆتە گەڕ بۆ خزمەتکردن بە نابیناکان، هێشتا زۆر شت هەیە نەیتوانیوە بیبینێ. نابینایی سەردەمی مۆدێرنیتە سەبارەت بە نابیناکان، لەو (خێرایی)یەدایە کە بە ژیانی بەخشیوە و ئەمەش دژی جەوهەری نابینایییە. نابینا لە سەردەمی پێشمۆدێرندا، ژیانێکی هەیە بە ئیقاعێکی لەسەرخۆی مەندەوە، بەڵام نابینا لەسەردەمی مۆدێرن و پۆستمۆدێرندا لەژێر گووشاری خێراییەکدایە، کە ئەو پتر بە ژیانی خۆی نامۆ دەکات و ئەمەش لەگەڵ ئەو

هوشیارییەی لەسەر خۆی بەدەستی هێناوە، وێکنایەتەوە و ناکۆکە. شەقام و لارێ و ژینگەی قەرەباڵغی ئەمڕۆ بۆ نابیناکان، پڕمەترسیترە لە شوێنە لاتەریکەکانی جاران.. جاران نابینا بەپێی خۆی و بە هاوکاریی گۆچانەکەی دەستی دەگەیشتە شوێنی مەبەست، کەچی لە ئێستادا ئەو هەستدەکات چوونە شوێنە گشتییەکان، ڕۆیشتن بەسەر شەقامەکاندا پڕ مەترسییە، دەستی میهرەبانی و چاوساخان کەمبۆتەوە، خێرایی، بەلادا تێپەڕین و شان لەشان کوتان و توندوتیژی زیادیکردووە.. چاڵ و چۆڵەکان و دارتێلەکان و پتر بوون و تەماعی ئابووریش وایکردووە دووکانداراکان مێزێکی گەورە لەبەردەمی دووکانەکانیاندا دابنێن، کە بۆ نابینا ڕێگرێکی گەورەیە.. ئەمڕۆ ئەوەندەی نیشانەکانی ڕێنماییکردنی چاوساخان زیادیکردووە، ئەوەندە نیشانەی ڕێنماییکردنی نابیناکان نابینین.. بۆیە نابیناکان کەمتر لە باخچە و شەقامەکان، لە پارك و شوێنە گشتییەکان، لە چێشتخانە و خواردنگەکان، لە چایخانە و قاوەخانەکان، لە سەیرانگە و ناو خەڵکدا، بەدیار دەکەون. لەوەدەچێ کۆمەڵگای ئێمە نەیەوێ بیر لە فەزایەك بکاتەوە بۆ نابیناکان، کۆمەڵگای ئێمە ئەوەندەی سەرسامە بە دڕندەیی مۆدێرن، ئەوەندە سەرسام و ئاگا نییە بە مرۆڤدۆستی و خۆشەویستی بۆ هاوچەشن کە بەشێکی گرنگی بیرکردنەوەی مۆدێرنن. ئەو کۆمەڵگایانەی (مۆدێرنیتە) وەکو ئەتەکییەت و ڕواڵەتگەرایی نوێ، وەکو(پێرفێکشنیزم و سنۆبیزم) و (مۆدگەرایی)، تێدەگەن، ڕێگە نادەن نابیناکان، قەڵەوەکان، ناشیرینەکان، هەژارەکان و شێتەکان بەهەمان شێوە سوود لە فەزای گشتی وەربگرن، کە مرۆڤی پێرفێکت و لووتبەرز خۆی تێدا نومایش دەکات. ئەمجۆرە کۆمەڵگایە توانای نابیناکان بەکەم دەگرێ، هەلی کارکردن و دامەزراندیان ناخاتە بەردەم، بواری خۆ سەلماندن و پیشاندانی مەهارەتەکانیان بۆ دابین ناکات. لەوڵاتی ئێمەدا ئاسانکاری لە بواری خوێندنەوە و هونەر و پیشەدا بۆ نابیناکان زۆر بەکەمی هەیە. هونەرمەندێکی نابینا، پیشەگەرێکی نابینا، خوێنەرێکی نابینا، زۆر بە زەحمەتتر دەتوانێ ڕێگرەکان بشکێنێ و وەك ئەوانیتری چاوساخ لە میدیا و شوێنە گشتییەکاندا بواری خۆ ئاشکراکردنی بۆ بڕەخسێ..، هەر

ئەم کەمایەسیانەشن کە جارێکی دیکە دەیسەلمێنن ئێمەی مرۆڤی مۆدێرن، بەچاوی ساخەوە زۆر شت هەیە تەماشایان دەکەین، بەڵام هەرگیز نایانبینین!

### خواردنی نابینا:

ئایا هەرگیز بیرت کردۆتەوە: ئەگەر نابینا بویتایە حەزت لە چ جۆرە خواردنێك دەکرد؟ من بۆخۆم لەگەڵ نابینایەکدا دەزانم کێشەی نابیناکان ئەوە نییە کە ناتوانن وەکو ئەوانیتر ببینن، بەڵکو ئەوەیە کە ئەوانیتر نەتوانن نابینا بەوجۆرەی کە هەیە ببینن. دەزانم ئەوان بەگشتی مرۆڤی نەرمخوون، زەین ڕوونن، قسەخۆشن، دڵناسك و هەستیار و دەنگخۆش و پڕبەهرە و زیرەك و تەنانەت نەوسن و بەمشوومۆڵیشن، بەڵام ماوەیەکی زۆری پێچوو تا تێبگەم ئەوان حەزیان لەچجۆرە خواردنێکە؟ کێشەی هەرە گەورە بۆ کەسێ خواردنی نابیناکان دروستبکات ئەوەیە، کە نابینا وێڕای چلێسییەکەیشی، مرۆڤێکی ئەوەندە قانیعە، کە زۆرینەی خواردنەکان دەخوات و هەرگیز لەسەر خواردن لەگەڵ نابینادا تووشی کێشە نابین، هەر لەبەرئەوەش زەحمەتە بزانین ئەوان چی ناخۆن.. لەبەرئەوە بیرمکردەوە پێویستە خواردنێکی تایبەت بۆ نابیناکان دروستبکەم، کە خۆراکەکانی هێندەی جیهانە دەوڵەمەندەکەی ئەوان ڕەنگاوڕەنگ و خواردنیشی ئاسان و سادەبێت و لە بۆنیشدا با بۆخۆیان بڕیار بدەن، دڵنیام ئەوان بە بۆن و تامەکەیشیدا، زۆرجوانتر لە ئێمەی چاوساخ، ڕەنگەکەی دەبینن. هەوڵبدە لەکاتی لێنانی ئەم خواردنەدا ئەوپەڕی هێواش بیت، چونکە ئەو خواردنەی بەهێواشی لێنرابێت بۆنابینا چێژی زیاترە. ڕۆلاّن بارت، ڕۆژگارێ لە کتێبی (چێژی دەق)دا نووسیبووی: ئەو دەقەی بە چێژەوە نووسرابێت، بۆ ئەو کەسەش دەیخوێنێتەوە چێژبەخشە. دەکرێ قسەکەی بارت بۆ خواردنی نابیناکانیش کارابێت: نابینا خودی خواردنەکە نابینێ، بەڵام لەڕێگەی بۆن و تاموچێژەکەیەوە، بەهۆی ئەو هالاّوەی لێی بەرز دەبێتەوە و هتد، تەفسیری جۆری خواردنەکە دەکات، بەهەمان

شێوەی کە خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەدا کۆدی نووسینەکە دەکاتەوە و ئاماژەکانی تەفسیر دەکات.

## ***شێوەی دروستکردن:***

پێش هەموو شتێ کاسێتێکی (تایەر تۆفیق)ی بخەرە سەر، تا ئاوازی مەقام و بەستەکانی، رێگری لەهەر جۆرە پەلەکردنێکت بکەن.. سەرەتا پێویستە لیترێ ئاو بکەینە قابلەمەیەکەوە و دوو مشت نیسك لەگەڵ کەوچکێ رۆنی تێبکە. کەمێ تێکی بدە و ئاگرێکی ئاسایی بۆ دابگیرسێنە و لێبگەرێ تاکو کەفێکی سپی دەکات. واتە پێشئەوەی بێتە کووڵ، پرِی پەرداخێك مەعکەرۆنی ورد، شێوە قردێلەیی تێبکە و بەهێواشی تێکەڵیهەڵدە. پاشان (ماجی)یەك بهێنە و لەنێوان پەنجە گەورە و دۆشاو مژەدا بیپروێنە تاکو ورد دەبێت و ئەویش بکەرە ناو قابلەمەکەوە. بەردەوام بە لە تێکەڵهەڵدانی و لێگەرێ کووڵ بێت و ئەمجا سەرەکەی لەسەر دابنێ و ئاگرەکەی کزتر بکە. پاشان پەتاتەیەك بهێنە و دوای پاککردن و شتنەوەی، بە وردی بیجنە و ئامادەی بکە، تا یەکدوو گێزەر لە رەندە دەدەیت، پەتاتەکەیشی بکەرە ناو و جارێکی دیکە تێکەڵیهەڵدەوە سەرەکەی لەسەر دابنێوە. ئەگەر زانیت زۆرخەستبۆتەوە، دەتوانیت پەرداخێ ئاوی گەرمی تێبکەیت. رەنگە ئێستا کاسێتەکەش گەیشتبێتە سەر بەستەی (***زوڵفت بە قەدتدا کە پەرێشان و بڵاوە، ئەمرۆ لە منی شێفتە ئاڵۆز و بەداوە***)، بۆیە هەوڵدە چەند پارچە (حێل)ێکی وردکراو، کەمێ پیازی سەوزی ووشککراو، کەرەوز و تەماتەیەکی وردجنراو ئامادە بکە و پێشئەوەی بگاتە بەستەی (***عومرێکی درێژە بە خەیاڵی سەری زوڵفت/ سەوداو و پەرێشانم و، سەودایەکی خاوە***)، هەموو ئەوانەی تێبکە و تێکەڵی هەڵدە و دواجار گێزەرە لە رەندەدراوەکەیشی بکە بەسەردا و ئاگرەکەی لێبکوژێنەوە. لێگەرێ هەموو ئەوانە بەشێوەیەکی سرووشتی تامی خۆیان بدەنەوە و تامی یەکتر بگرن. هەتا سارد دەبێتەوە، دەتوانیت چەند پارچە سەموونێ، یان هەر جۆرە نانێکی دیکە ئامادە بکەیت و

سووپەکەش بکەینە قاپی قووڵەوە، بەمەرجێ نەهێڵی لەکاتی تێکردندا بە لێواری قاپەکاندا بڕژێ. ئێستا خواردنێ ئامادەی نۆشکردنە لە بۆندا ناوازە، لە تامدا بێوێنە و لە دیمەندا..؟، ئەمەیان لێدەگەڕێین بۆ کەسانێ کە شایانی ئەوەن ئەم خواردنەیان بەناوەوە بێت، چونکە ئەوان بەبێ ئەوەی تەماشا بکەن، لە ئێمە جوانتر دەبینن و حوکم دەدەن..

# خواردنی پێشمەرگانە

***(نانەڕەق) خواردنی شاهانەی پێشمەرگە:***

**خواردنی** پێشمەرگانە، بەپلەی یەکەم (نانەڕەقـە). مێـژووی نانـەڕەق لـە ولاّتـی ئێمەدا، حەکایەتێکی سەرنجڕاکێش و پڕە لە شتی سەیر و سەمەرە. نان بۆ ڕەق دەبـێ؟ لەبەر ئەوەی لەکاتی خۆیدا ناخوورێ. بۆچی؟ چـونکە نـانی تـازە دەکـرێ و ئـەویتر کۆندەبێ. ئەمە لە کوێ ڕوودەدات؟ لەو ماڵ و خێزانانەدا کە خۆشگوزەران دەژیـن. باشە نان کە ڕەقدەبێ، کێ دەیخوات؟ بێگومان ئەوانەی ناتوانن بـە ئاسـانی نـان پەیـدا بکەن. لە کامجۆری کۆمەڵگادا؟ لەو کۆمەڵگایانەدا کە نایەکسـانی ئامـادەیی هەیـە و سەردەستە و ژێردەستەکان، هەژاران و دەوڵەمەندەکان دووجۆر ئاستی ژیـان دەژیـن. بۆچی نانـەڕەق دەبێتـە نـانی پێشـمەرگە؟ چـونکە دروسـتبوونی پێشـمەرگە ئـەنجامی سیاسەتێکی نایەکسانییە کە مرۆڤەکانی کۆمەڵگایەك دەکاتـە کۆیلـە و پێشـمەرگەش دەرکەوتـەی ویژدانێکـە لەبەرامبـەر ئـەو ژیانـەدا دەڵـێ: (نـەء)، لێرەشـەوە، ئـەو نانەڕەقخواردنی ئازادانەی پێچـاترە وەك لـە قـەڵخواردن لـەسـەر سـفرەی ملکەچـی! ئەمەش بەمانای ئەوە نییە پێشمەرگە هیچیتر ناخوات، بەمانای ئەوە نییە دەیانجار ئـاوی گۆشتیان بەنانەوە تێنەگوشیوە، نان و دۆیـان نـەخواردووە، بـەرازیان ڕاونـەکردووە و دەیان خواردنی تریش، وەلێ بەمانای ئەوەیە لە تەنگانەی پێشمەرگایەتیدا، تـەنیا نـان، نانی ڕەق فریای دەکەوت..

لەم زنجیرەیەدا ڕووی قسەم بەپلەی یەکەم لە دۆست و هاوڕێ بیانییەکانی کورد و ئەو ژەنراڵ و ڕۆژنامەنووس و خۆرهەڵاتناس و کوردناسانەیە، کە دێنە ئەم وڵاتەوە و ماتەریاڵ بۆ کتێب و وتارەکانیان کۆدەکەنەوە و تیۆرە لەسەر ئێمە دادەتاشن و فیشەکەکانیان بەناوی بەرقەرارکردنی دیموکراسییەتەوە، لەجەستەی مرۆڤی ئێمەدا خاڵیی دەکەنەوە. بەپلەی دووەمیش ڕووی قسەم لەو نەرمخوو و نایلۆن تەبیعەت و مرۆڤە ئایدیالیستە سەرچەورانەیە کە لەسەر مۆدێل، ئەوەی ئەمڕۆ بەباشتر دەزانن و ئەوەی دوێنێ بە کۆن و بەکار نەهاتوو لەقەڵەم دەدەن. ئەم دوو گرووپە هەردووکیان پێویستیان بەوە هەیە دایان بنێی و خواردنی پێشمەرگانەیان دەرخوارد بدەیت، تاکو باشتر لە ئێمە، وەکو میللەتێك کە پێشمەرگایەتی بۆتە شێوازێکی ژیانی، تێبگەن! بەبێ خواردنی پێشمەرگانە لە مانای ئەو ژیانە تێناگەین کە تیایدا مرۆڤ دەخوات، بۆ ئەوەی خۆی بکاتە قوربانی.. ئەوە تەنیا کورد و نەتەوە هاوشێوەکانێتی کە دەتوانێ مانا بە خواردن بدات لە پێش مەرگدا..

لە جەوهەری خۆیدا پێشمەرگە، بەمانا کوردییەکەی، مرۆڤێکە عارف و بەدوای ئازادیدا ڕێگای مەرگ هەڵدەبژێرێ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و بۆ بەرگریکردن لە خۆی، چەك و تفەنگ دەکاتە هۆکاری بەرەنگاربوونەوەی. هاوڕێ و هاوپەیمان و دۆستە ئەورووپاییەکانمان ناتوانن لە گرتنەبەری ئەم ڕێگایە بۆ گەیشتن بە ئازادی تێبگەن. ئەم تێنەگەیشتنە سەرچاوەی درێغیکردنی ئەوانە لەبەرامبەر کێشەی ئێمەی کورد و هۆکاری زۆرینەی بێمتمانەییەکانی ئێمەیە بە ئەوان، هەروەها بەڵگەی ئەوەش دەخاتە ڕوو کە ئەوان ئەو بەشە لە مێژووی خۆیان لەبیرکردووە کە ناچاربوون بەهەمان هۆکار بەرگریی لەخۆیان بکەن. ناعەدالەتی دۆستەکانمان و هاوپەیمانەکانمان و ئەو هەڵانەی بەرامبەرمان لە نەزانییەوە دەیانکەن، بەتایبەتی هاوپەیمانە ئەمەریکییە چاویلکە ڕەشە جەستە بە تفەنگ داپۆشراوەکانمان، (نەك عەدالەترەفتارەکانمان)، هەر تەنیا نیشانەی (نەزانیی) ئەوان بەرامبەر کێشەکانی ئێمە لە قووڵاییە مێژوویی و کەلتوورییەکانی خۆیدا نین، هەروەکو چۆن تەنیا گوێڕایەڵیکردنی ئەوانیش نییە بۆ ئەو

تۆمەتانــەی دووژمنــەکانمان دەیدەنــە پــاڵ نەتــەوەی ئێمــە، بــەڵکو نیشــانەی (خــۆگێلکردن)ــە لــەو تراژیدیانــەی بــەهۆی کەمتەرخەمییــەکانی ئەوانــەوە، ئێمــە باجەکەیمانداوە. ***هەڵکردن لەگەڵ ئەو دۆست و هاوپەیمانانەی نەزانن، زۆر ئاسانترە لە هەڵکردن لەگەڵ ئەوانەیان کە خۆیان لەئاستێدا گێل دەکەن***. دروستبوونی پێشمەرگە و بوونی پێشمەرگایەتی بە شێوازی ژیان بۆ میللـەتی ئێمـە بەدرێـژایی چـەندین دەیـە، بەڵگەی ئەوەیە کە دۆستەکانی ئێمە لـە مێـژووی هاوچـەرخماندا هەمیشـە خۆیـان لـە ئاست کێشەکانی ئێمەدا گێلکردووە، نەك نەزان بوون.. پێشمەرگایەتی قۆناغێکە لـە ژیانی ئەندامانی میللـەتێك کـە ناچـاربوون مـەرگ بکەنـە ڕێگایـەك بـۆ گەیشـتن بـە ئاستێکی ژیان، کە تیایدا نانەڕەقخواردن، ژەمی هەرە سەرەکیی بووە. بۆیە ئەوانەی کە لە لوتبەرزییانەوە، یان لـە نەشـارەزاییانەوە و لـە مۆدێلبازییـەوە، دەیانـەوێ وشـەی (پێشــــمەرگە) و کەســــایەتی پێشــــمەرگە لــــە (توندوتیژییــــەکی خۆویســــتانە)دا بچووکبکەنەوە، پێویستە دەعوەتیان بکەین بۆ ئەوەی ژەمێ نانەڕەق بخۆن، تـاکو لـەوە تێبگەن کاتێ مرۆڤ بیەوێ ژیانی خۆی بکڕێتەوە، ناچارە تا سەر ئاستی گەڕانـەوەی بـۆ قۆناغی وەحشیگەری بڕوات..

کەواتە پێشمەرگایەتی لـە ژیانی میللــەتی ئێمــەدا قۆنـاغێکی دابڕانـە لـە کۆمـەڵگای مرۆیی لـە پێناوی بەرگریکردن لـە کەرامەتی مرۆییانەی مرۆڤدا، کە چـیدی کۆمـەڵگا توانای نەبوو بەرگریی لێبکات. پێشمەرگە ئەو (وەحشییە هەستیارەیە)، کـە دڕنـدەیی کۆمــەڵگا و سیســتەمی سیاســی لــە ئاســت مرۆڤایــەتی خــۆی و هاوچەشــنەکانیدا پێقەبوولنەدەکرا و ناچار بوو مەرگی خۆی بخاتە بارمتـەی ژیانێکـەوە، کـە یـەکێ لـە ئیمتیازەکانی بریتیبوو لـە دوورکەوتنەوە لـە دڕندەیی و بەربەریەتی ستەمکارانە. ئەو بەم بڕیارەی بۆوە (وەحشی)، بووە هاوەڵی دار و بەرد و مارومێروو، لـە سـێکس و نـوێنی نەرم و نازی سفرە و ئەتەکیـەتی شـار و مووچـە و مانـەوە لـە هوتێـل و فیزلێـدان و سابوونی لۆکس و هەرجۆرە ژیـانێکی مرۆییانـە، دوور کەتـەوە، بـەڵام هەسـتیاریی و دەروەستیی خۆی لەئاست خۆی و ژیـانی هاوبەشـدا، لەدەسـت نـەدا. بـەم مانایـەش

بەشێکی زۆری ئەندامانی میللەتی ئێمە لە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونی خۆیاندا، ڕۆژگارێ پێشمەرگە بوون و ژیانێکی (وەحشیانە) ژیاون بە هەستێکی مرۆییانەوە، هەروەکو چۆن ئێستاش لە سێ بەشی دیکەی وڵاتی ئێمەدا ژمارەیەکی زۆر لەو وەحشییە نانەڕەقخۆرانە بە چیاکانەوەن!

ئایا چییە ئەو هاندەرەی وا لە گەنجێکی ئێمە دەکات خوێندن و خۆشەویستی و بەرژەوەندی و شەقامی قیر و کافتریاکان و باخچەکان جێبهێڵێت و ئەوێ کێوان کەوێ و شەق لەبەردوداران هەڵدات و لەنێو دووپشك و مار و گەرمای هاوین و کرێوەی زستانێدا، ژیان بەسەر بەرێ؟ ئایا ئەمە حوکمێکی غەریزەییە و ناتوانن خۆیانی لێرزگار بکەن؟ ئایا ئەمە نۆستالیژیای ئەوانە بۆ میراتی باوباپیرە سەرەتاییە و ئەشکەوتنشینەکانیان؟ ئایا ئەمە نابینایی و ڕقی ئەوانە بەرامبەر بەو هەموو نیعمەتانەی خودا و سیستەمی سیاسی و جیهانگیری بۆی دەستەبەر کردوون؟ ئایا ئەمە ڕاکردنە لە ئازادی و دیموکراسییەت و بەهەشتی ئەمەریکی؟ ئایا تەنیا بە وردبوونەوەمان لەو ئایدیۆلۆژیایەی حیزبەکەی خستوێتیە مێشکییەوە و بۆی هەیە زۆر هەڵە و ناواقیعیش بێت، دەتوانین لەو هاندەرە تێبگەین؟ ئایا تەنیا هەڵگرتنی بیروڕای کۆمۆنیستانە، دیموکراتانە، لیبراڵیانە و نەتەوەپەرستانە و جودایخوازانە بەسن بۆ ئەوەی مرۆڤێ مەرگی خۆی بکاتە ڕێگایەك بۆ ئەوەی بگات بە شێوازێکی پەسەندی ژیان؟

بەبڕوای من هاندەری ئایدیۆلۆژی و حزبی هەرگیز بەس نەبووە بۆ هەڵبژاردنی ئەو شێوازە ژیانە. مرۆڤی ئێمە لەپێش دروستبوونی حزب و سەرهەڵدانی ئایدیۆلۆژیاشدا، ژیانێکی پێشمەرگانە ژیاوە. من ئەم قسەیە دەکەم و دەزانم کە مرۆڤ دەتوانێ خۆی لەگەڵ هەر جۆرە ژیانێك بگونجێنێ و ڕابهێنێ، وەلێ خۆڕاهێنان لەگەڵ ژیانی پێشمەرگایەتی هاندەری قووڵتر و ئۆنتۆلۆژیکتری لە پشتە وەك لە شوێنکەوتەیی بۆ ئایدیۆلۆژیا و مەرامێکی سیاسیی ڕووت. ڕەنگە تەنیا لەو ڕۆژگارە ڕەشانەدا کە پێشمەرگەی دوو لایەن و سەر بە دوو مەرامی جیاواز پێکدا دەدەن، هاندەری ئایدیۆلۆژی و حیزبایەتی و ئینتیمای ناوچەیی و خێڵایەتی، تاقە هاندەر بووبێ، دەنا

ئەوان لەکاتی پێکدادانیشیاندا هاندەرێکی سەرەکیتری هاوبەشیان هەبووە بۆ بوونە پێشمەرگە، کە پەیوەستبووە بە عەودالیی ئەوانەوە بەدوای ژیانێکی ڕێزلێگیراوی مرۆییانەدا بۆ میللەتەکەیان..

ئایا بیرکردنەوە لەم هاندەرە سەرەکییە بەس نییە بۆ ئەو ڕۆژنامەنووس و دۆست و هاوپەیمانانەی کە دەیانەوێ وشەی ***پێشمەرگە*** یەکسان بکەن بە (تیرۆریست، میلیشیا و یاخی و هتد) تۆزێ بەخۆیاندا بچنەوە؟ ئایا تێگەیشتن لەم هاندەرە بەس نییە بۆ ئەوەی خودی ئەو پێشمەرگانەی دوێنێ لەسایەی هاندەری ئایدیۆلۆژی و حیزبایەتیدا شەڕیان لەگەڵ یەکتر دەکرد و لە ئەمڕۆشدا هەر لەسایەی ئەو ئایدیۆلۆژیایانەدا لەگەڵ یەکتر ناکۆکن، بەوەی بیری خۆیانی بهێننەوە کە شەڕی سەرەکی ئەوان شەڕ بوو لەسەر بەدەستهێنانی جۆرێکی دیکەی ژیان، ئەمڕۆ ئاسانتر لەگەڵ یەکتردا ئاشت ببنەوە؟ ئایا تێگەیشتن لەم مانایەی (پێشمەرگە بوون)، هاندەرێ نییە بۆ ئێمە و نەوەی نوێ، کە لە مانای وشەی پێشمەرگەدا، عەودالبوونێك بەدوای ژیانێکی پڕکەرامەتانەی مرۆییدا ببینینەوە؟ ژیانێ کە تیایدا نانەڕەق و تریت و جاروبار دۆخواردنەوە، ژەمە شاهانەکانی پێکدەهێنا؟!

***(کۆجیتۆ)ی پێشمەرگە:***

من کاتێ باسی پێشمەرگە وەك مرۆڤێك و باسی پێشمەرگایەتی وەك شێوازێك بۆ ژیان دەکەم، بە هیچ شێوەیەك ئەو چاویلکە ڕەشپۆش و سمێڵتاشراو و مووکێش بەدەستانەم نایەتەوە یاد کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دەمانچەکانیان بە لاڕانیانەوە هەڵدەواسن و لەهیچ شوێنێ ڕەچاوی ئەخلاقی ژیانی هاوبەش ناکەن و بەهیچ شێوەیەکیش ڕێزی ڕێنماییەکانی ترافیك ناگرن و (مووشەکەل مەتبەخ) نەبێ نایخۆن و دەیانەوێ لەناو (مۆنیکا) جامڕەشەکانی گزیرەوە، فیزی ئەمەریکیانەمان بەسەردا لێبدەن لەبەر ئەوەی حیمایەی سەرۆکی کۆلارە و سەرۆکی کۆلان و سەرۆکی ڕەش و سەرۆکی کەشتی و سەرۆکی پەشمن.. ئەمانەم بیرناکەوێتەوە، چونکە زۆرینەی ئەمانە ئەو خشڵ و پلپڵە و

مەكیاجەیان لێوەربگریتەوە، نەك هەر توانای بەرگریكردنیان نامێنێ، بەڵكو لەسێەری خۆشیان ڕادەكەن، هەروەكو چۆن لە خوێندن و خۆپێگەیاندن و هەر ئیلتیزامێكی دیكەی هاوبەش ڕایانكردووە و تەنانەت بەبێ توندوتیژی ناتوانن پرسیارێ بكەن و وەڵامی پرسیارێكیش بدەنەوە كە ئاراستەیاندەكرێ..

پێشمەرگە، چ بەدیوە فەرامۆشكراوەكەی لە ژیانی ئەمڕۆی ئێمەدا، كە دەمانەوێ بەهۆی بڕینەوەی مووچە بۆیان، بێدەنگیان بكەین و پێیان بڵێین: (*ڕۆڵی ئێوە بەسەر چووە و ئێستا ژیان ژیانی شارە و مۆدێلتان نەماوە*)، و چ بەو دیوەدا كە لەبەشەكانی دیكەی وڵاتی ئێمەدا بەهەزارانیان، لە كچ و لە كوڕ، لە باوك و دایك، لە پیر و جەوان، هەتا ئێستاش بەو چیایانەوەن و خەریكین لەژێر كاریگەری دووژمن و هاوپەیمانەكانماندا ناویان دەزڕێنین، *مرۆڤێكە بوونی تاكەكەسیانەی خۆی لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ڕێگای مەرگەوە، دەكاتە بوونێكی بابەتیانە لە پێناوی ژیانی هاوبەشدا.* بۆی هەیە پێشمەرگە لە ئاستی تاكەكەسیدا، ڕەق و توندوتیژ بێت، پیس و چەپەڵ بێت، بۆی هەیە نەخوێندەوار و بێباك بێت، بۆی هەیە كەمئەزموون و ناڕەواكار بێت، عەشایەر و كرێكار بێت، بەڵام (پێشمەرگایەتی) ئەو هیچ نەبووە و هیچ نییە جگە لە هەڵگێڕانەوەی مانای بوون، لە (بوونێكەوە بۆخۆی و لەپێناوی تاكەس)دا، بۆ (بوونێ لە پێناوی ئەوانیتر)دا. پێشمەرگە باندێكی تیرۆریستی نەبووە و نییە، پێشمەرگە ئەو مرۆڤە بێكار و لەوڵاتی خۆیدا پەراوێزخراوە نییە، كە ئەخلاقی مارینزی ئەمەریكی فێری كردبێ: (*عێراقییەكان و مسوڵمانەكان ناشارستانین و بابڕۆین بیانكوژین، بەهەمانشێوەی كە تەعەدامان لە سۆماڵی و كوبابیەكان كرد*)!. پێشمەرگە هەرگیز ئەو (عەسكەرە عێراقی) و (پاسدارە ئێرانی) و (جەندرمە توركییە) نەبووە و نییە، كە دوای خوێندنی زانكۆ لە بواری مرۆڤناسی و كۆمەڵناسی و فەلسەفەدا، هێشتا ئەوەندە لەڕووی عەقڵییەوە گوناه بێت، كە ئامادەبێت بچێت ئەو (*كوردە جوداخوازانەی دەیانەوێ وڵاتمان لێتێكبدەن*) و جیابنەوە، بكوژن و بە هیلیكۆپتەری ڕووسی و ئەڵمانی و فەرەنسی و ئەمەریكی خواردنی پاكەتییان بەسەردا دابەشبكرێ..

(پێشمەرگە)، ئەو بوونەوەرە خوێندەوار و نەخوێندەوارەیە و هەبووە، کە بەر لە تەواوکردنی زانکۆ، بەر لەوەی دەزگیرانەکەی بۆ بگوێزرێتەوە، بەر لەوەی باوکی لە زیندان ئازاد بکرێ، بەرلەوەی لەبازاڕەوە بگاتەوە ماڵ، پێشئەوەی بەیانیان وەکو هەر مرۆڤێکی ئەم سەرزەوییە خەبەری بێتەوە و ڕیشی بتاشێ، چاوی کلرێژکات، باوەشی بە منداڵەکەیدا بکات، بەر لەوەی زەوییەکەی بەتەواوی بکێڵێ، بەرلەوەی گەنمەکەی بدروێتەوە و پێڵاوەکانی بەتەواوی لەپێکات و تەنانەت دەست بە نانخواردن بکات و بەتەواویش تێربخوات، یان منداڵەکەی شیربدات، ناچار بووە بڕیارێکی بوونخوازانە بدات و لە نێوان ژیانی کۆیلەیی و بە ئازادی ژیاندا، ئەوەی دوایییان هەڵبژێرێ. ئەم بڕیارە هەرچەندە بۆی هەیە کەمتر عەقڵانی و زیاتر عەفەوی بێت، هەرچەندە لە ڕوانگەی ناتوندوتیژییەوە، توندوتیژانەیە و هەرچەندە بڕیارێکە مەرگ دەخاتە سەنتەرەوە نەك ژیان، کەچی تا سەر ئێسقان بڕیارێکی ئۆنتۆلۆژیکیانەی بوونخوازانەیە و لەگەڵ سرووشتی مرۆڤدا، وەك بوونەوەرێکی خاوەن هەستیاری و بە ویژدان و لە خۆتێگەیشتوو، هیچ ناکۆکییەکی نییە. مرۆڤ ئەگەر هەستەوەر نەدەبوو، ئەگەر ویژدانی نەدەبوو بۆ جیاکردنەوەی ڕەوایی لە ناڕەوایی و ئەگەر هووشیاریی نەدەبوو بەرامبەر بەخۆی و لە خۆی تێنەدەگەیشت، هەرگیز لەوەی غەریزە و سرووشت بۆیان دەستنیشانکردووە، لاینەدەدا و بۆخۆی وەکو هەر بوونەوەر و ئاژەڵێکی دیکە، دەلەوەڕی و دەژیا و زاووزێ دەکرد، بەڵام مێژوویەکی لەپاش خۆی بەجێنەدەهێشت. پێشمەرگە بە مانایەك لە ماناکان، لەدایکبوونی مرۆڤێکی نوێی کوردستانیە، کە کۆجیتۆی خۆی لە (*پێشمەرگایەتییەوە*) وەك شێوازێك بۆ ژیان و بوون، بەدەستدەهێنێ: (***من پێشمەرگەم، کەواتە هەم***!).

مانای ئەم کۆجیتۆیە ئەوەیە: من ژیانی ژێردەستەیی پەسەند ناکەم و دەبێ ژیانێك بژیم کە تیایدا ئازاد بم، بۆیە لەپێناوی ئەو ئازادییەدا دەبێ قوربانیی بە هەموو ئەو ئیمتیازاتانە بدەم، (لەوانەش ئاساییشی ژیانی خۆم)، کە ژیانی کۆیلایەتی و ژێردەستەیی بۆم دەستەبەر دەکەن، تەنانەت ئەگەر ئەو قوربانییە بوونی خۆشم بێت. (پێش مەرگ

کەوتن) و (بوونی پێشمەرگانە) و (پێشمەرگایەتیکردن)، تۆران و ڕاکردن نییە لە ژیان و باوەشکردنەوەش نییە بۆ مەرگ، بەڵکو ڕەتکردنەوەی هەرجۆرە ژیانێکە، کە تیایدا مرۆڤی هەستەوەر لەگەڵ هەست و ویژدان و هووشیاریی خۆیدا، لەگەڵ سرووشتی مرۆڤانەی خۆیدا، دەکەوێتە ناکۆکییەوە.. من نامەوێ ڕەوایەتی بەهیچ جۆرە کارێکی ناشایستە و توندوتیژی و هەڵەیەك بدەم، کە ژیانی پێشمەرگایەتی بەسەر پێشمەرگەیدا دەسەپێنێ، وەلێ هیچ فەلسەفەیەکیش ناناسم مرۆڤ وەك بوونەوەرێك پێناسە بکات، کە بتوانێ ناکۆك بێت لەگەڵ سرووشتی مرۆڤانەی خۆیدا، بۆنموونە (ژێردەستەیی و ستەمکاری و تەعەدا قەبووڵکات) و هیچ توندوتیژی و هەڵەیەکیشی لێنەوەشێتەوە. ***شێوازەژیانێك کە نانەڕەق دەکاتە ژەمی سەرەکیت، ناچاریشت دەکات بۆ بەرگریکردن لەمانەوەی خۆت وەك مرۆڤ، هەندێجار بە ڕەقییش ڕەفتار بنوێنی..***

***نەوەی نانەڕەق:***

ئەمڕۆ لە سەراپای وڵاتی ئێمەدا پێشمەرگە هەیە: پێشمەرگەی دێرین، پێشمەرگەی بریندار، پێشمەرگەی ناڕازی، پێشمەرگەی تۆراو، پێشمەرگەی پەنابەر، پێشمەرگەی دەروونپشێو، پێشمەرگەی بێخەو، دەستکوورت، بێدەرەتان و پێشمەرگەی تووڕە و تەنانەت هی پەشێمان و ژمارەیەکی زۆریش پێشمەرگە، کە هێشتا بە شاخانەوەن، کە تاکو سوپای یەکێ لە وڵاتانی دراوسێمان بە هاوکاریی هاوپەیمانە ئەمەریکاییە عەینەك ڕەشەکانمان و خودای نەخواستە گەمژەیی خۆمانەوە، هێرشیان نەکەنە سەر و شەهیدیان نەکەن و نەیانکوژن، ئێمە هیچ لەبارەیانەوە نابیستین! هۆکاری ئەم لەبیرچوونەوەیە ئەوەیە کە چیدی ئەو هەڵبژاردەیەی ئەمڕۆ لە وڵاتی ئێمەدا، دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە، بیریان چۆتەوە ڕۆژگارێ، ئەوانیش بۆ خۆنواندنیش بوایە، نانەڕەقیان دەخوارد. ئەگەرچی کاتێ تەماشای بەر زگ و تەنگەیان دەکەی، بۆت دەردەکەێ بەشێکی زۆری ئەوان لە ڕۆژگاری پێشمەرگایەتیشەوە هەر لە خەمی خۆیاندا بوون. بۆ ئەو نەوەیەش کە بەری خوێنی پێشمەرگە دەخۆن، ژیانی

پێشمەرگایەتی ناناسن و پێشمەرگەیان لەلا کراوەتە (*چەکدارێکی ڕۆژگاری کۆن، کە ئیدی لەگەڵ ژیانی شاردا ناگونجێن!*) هەروەها بۆ ئەو دیپلۆمات و ڕۆژنامەنووس و کوردناس و چاودێرە سیاسی و ژەنراڵانەی دێنە وڵاتەکەمان و پێشمەرگەیان لێبۆتە (باندی تیرۆریستی و میلیشیا)، پێویستە بەدەم نانەڕەقخواردنەوە، چەند ڕوونکردنەوەیەك بدەین:

***یەکەم***: پێشمەرگە و بڕیاری پێشمەرگایەتیکردن پێشئەوەی بڕیارێکی تایبەت و شەخسیی تاکەکەس بێت، بڕیارێکی بوونخوازانە و ئۆنتۆلۆژیکیانەیە و پەیوەستە بە بوونی مرۆڤەوە کە هوشیارە بەرامبەر بەخۆی، کە هەستدەکات و ئیرادەی هەیە. لەهەر شوێنکاتێکدا ئەم مرۆڤە هەستیکرد کەرامەتی مرۆڤانەی لەمەترسیدایە، پێشمەرگایەتی وەك شێوازە ژیانێك، هەڵدەبژێرێ. بەم مانایەش سەرکوتکردن و بە میلیشیا و تیرۆریست لەقەڵەمدانی خەباتی پێشمەرگایەتی، تەنیا دەلالەت لە خۆگێلکردنی ئەوانە دەکات کە پێیانوایە دەتوانن مافی بەرگریی لەخۆکردن و کەرامەتپاراستن، لە مرۆڤ قەدەغە بکەن. ئەمڕۆ ئاڵای ئەم خۆگێلکردنە بەدەست سوپای ئەمەریکاوەیە، کە بەبێ حسابکردن بۆ ماناکانی پێشمەرگایەتی، گڵۆپی سەوز هەڵدەکات بۆ ئەوەی سوپای دەوڵەتە تۆتالیتار و مرۆڤکوژەکان، پێشمەرگەکان بکوژن، وەلێ پێشمەرگایەتیان پێ لەناو نابرێ.

***دووەم***: بڕیاری پێشمەرگایەتیکردن پەیوەست نییە بە ڕاددەی ڕۆشنبیری و خوێندەواری مرۆڤەوە، بەڵکو پەیوەستە بە لە خۆتێگەیشتنی بوونەوەرێکی هەستیار و خاوەن کەرامەتەوە، کە هەرکات هەستیکرد زەمینەکانی ژیانی ئەو لەگەڵ ناخی خۆیدا ناکۆکن، بڕیار دەدات هەلومەرجەکانی ژیانی خۆی بگۆڕێ، تەنانەت ئەگەر بە هەڵبژاردنی ڕێگای مەرگیش بێت و نانەڕەقیش ژەمە هەرە خۆشەکەی بێت.

***سێیەم***: بڕیاری بوون بە پێشمەرگە و پێشمەرگایەتیکردن، لەبەرئەوەی بڕیارێکی بوونخوازانەی ئۆنتۆلۆژیکیە، واتە ئەوە سرووشتی ڕەگەزی مرۆڤە، مرۆڤ ناچار دەکات بەو بڕیارە، ئەوە بڕیارێکی پێشئایدیۆلۆژیانەیە (*pre ideological*). بڕیاری

پێشئایدیۆلۆژیانە بڕیارێکە پەیوەستە بە سرووشتی مرۆڤی ستەملێکراوەوە، نەك بە بوونەوەرێکەوە، کە لە ڕێگەی حزب و ڕێکخراوێکی تایبەتەوە و بەهۆی ئایدیۆلۆژیایەکی دەستنیشانکراوەوە، ئەنگیزەی ئەو بڕیارە لە مرۆڤدا بچێنرێ تاکو ببێتە پێشمەرگە. پێشمەرگایەتی وەك شێوازێك بۆ ژیان، پەیوەست نییە بە بوونی ئایدیۆلۆژیای حیزبەوە، تاکو لەگەڵ نەمانی ئەو حیزبە و دەستەمۆبوونی سەرکردەکانی، پێشمەرگایەتی کۆتایی پێبێت. لە وڵاتی ئێمەدا پێشمەرگایەتی هەرگیز پەیوەست و پابەندیش نەبووە بە بوونی ئایدیۆلۆژیای حزبەکانەوە، زۆرینەی پێشمەرگەکان ئەسڵەن بۆیان گرنگ نەبووە حزبەکانیان چۆن بیردەکەنەوە و لێشیان تێنەگەیشتوون، ئەوەندەی ئەوان پابەندبوون بە ویژدانی هەستیارانە و خاوەن ئیرادەی شهوودیانەی خۆیانەوە.

***چوارەم***: بەم پێیەش کاتێ حزبەکان لە ئایدیۆلۆژییەکانیان پەشیمان دەبنەوە و سەرکردەکان وەك مووچەخۆر پێگەی خۆیان وەردەگرن، بەمانای ئەوە نییە پێشمەرگەکانی دوێنێ ڕۆڵیان نامێنێ و ئەوانەی وان بە چیاکانەوە دەبێ بکوژرێن، یان ناچار بە تەسلیمبوونەوە بکرێن و وەك (باندی تیرۆریستی) مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ.. بۆی هەیە هێزگەلێ بتوانن تاکە پێشمەرگە دەستەمۆ بکەن، لە ڕێگەی مووچە بۆ برینەوە و زەوی بەسەردا دابەشکردنەوە، بێدەنگیان بکەن، لەڕووی ئیمتیازاتەوە، لەگەڵ جاش و خیانەتکاران هاوسەنگیان بکەن، لە بەندیخانەکانیان قاییم بکەن، بەپێی یاسای دژەتیرۆری پەرلەمان، سزایان بدەن و زەمینەسازی بکرێ بۆ ئەوەی هاوپەیمانان لێیان بدەن، وەلێ هیچکامێ لەمانە ناتوانن مرۆڤ لە ***پێشمەرگایەتیکردن*** وەك شێوازە ژیانێك و لە سرووشتی پێشمەرگانەی خۆی ژێوان بکەنەوە. چونکە لەگەڵ کوشتن و لێدان لە هەر تاکە پێشمەرگەیەك، نەك هەر ئەندامێك لە ئەندامانی ئەو لایەنەی ناویان لە لیستی ڕەشدایە، کەمدەبێتەوە، بەڵکو ئەندامی خێزانێکی ئەم میللەتەش کە مافی مەدەنی و ئینسانی خۆی هەیە، لەناو دەچێ. بۆیە ئەوانەی خەیاڵی پێشمەرگەکوشتنیان لەپێناوی هەر شتێکدا، چۆتە سەرەوە، پێویستە بزانن کە بەو

کارەیان ڕۆحی پێشمەرگایەتی پەرەپێدەدەن، ئـەمجارەیان لـە ئاسـتێکی فـراوانتردا: تـۆ دەتوانیـت پێشـمەرگەکانی (کۆمەڵـە و دیمـوکرات و پ.ک.ک) و هێزەکـانی تـری دەرەوەی کۆمەڵگا و دەسەڵات، بەتاوانی ئەوەی (تیرۆریست و تاوانبـارن) بکوژیـت، دەتوانیـت پێشـمەرگەکانی دوێنێـی پـارتی و یـەکێتی و لایەنـە چـەپەکان، گـەنجان و ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسە ناڕازییەکان، لەناو هەزاربەهەزاری ئەتەکیەتی ژیـانی شـاردا سەمەندۆك بکەیت و وایان لێبکەیت لـە ڕابـردووی خۆیـان پەشـیمان ببنـەوە، بـەڵام ناتوانیت یادوەری ئەوان وەك ئەندامانی نەتەوەیەك لـە بیری خێزان و خوشـك و بـرا و هاوڕێ و هاوپۆلـەکانیاندا بسڕیتەوە. قەناعەت پێکردنی میللـەتێك بـەوەی: (ئەوانـەی لــەو چیایانە شـوێن لایـەن و حـزب و گرووپـی سیاسـیی کـەوتوون، تاوانبـارن و دەیـانکوژم)، کـەمێ ئاسـانترە، وەلــێ هەوڵـدان بـۆ ئـەوەی میللــەتێك ئەوانـە وەك ئەندامانی خۆی و خێزانەکانی ئەم کۆمەڵگایە لــەبیر بباتــەوە، یـان بـە گەمـژە زانینـی خەڵکە، یاخود دەلالـەتە لـەسەر خۆگێلکردن و گەمژەیی تۆ..

پێنجەم: بۆیە من پێشنیارێکم بۆ هەموو ئەوانە هەیە کە دەیانەوێ پێشمەرگایەتی لــەناو بچێ، پێویستە پێشتر بیر لـە لـەناوبردنی نانەڕەق بکەنەوە. ئـەم پێشنیارەشـم زیـاتر بـۆ هاوڕێ ئەمەریکاییەکانمانە، بۆ ئەوانەی کە کەس نازانێ کەی هەموومان بەتاوانێك لــە تاوانە بۆ داتاشراوەکان دەخەنە لیستی ڕەشەوە و بەهاوکاری کـام سـووپای دڕنـدەی ژەنراڵـە ڕەگەزپەرستەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش، هێرشمان دەکەنە سـەر. دەمـەوێ بەو هاوپەیمانانەمان بڵێم: برادەران، ئێوە پێشئەوەی خۆتان تەییار بکەن بۆ هێرشـکردنە سەر ئەو مرۆڤانەی هەر ناوێکیان هەیە، تکایە هەڵمەتێ بکەن بۆ لـەناوبردنی نانـەڕەق، وەك ژەمــەخۆراك! چــونکە هــەتا نانــەڕەق هــەبێ، مــرۆڤ لــەم وڵاتــەدا بــیر لــە پێشــمەرگایەتیکردن دەکاتــەوە. نانـەڕەق وەك ڕەمـزی ناعەدالــەتی و سـتەمکاری و نایەکسانی، چونکە هەتا ناعەدالـەتی هەبێ، نانەڕەقخۆران زیاد دەبن. دەکرێ جارێکیتر بپرسین: بۆچی نانەڕەق دەبێتە نانی پێشمەرگە؟ چونکە دروستبوونی پێشمەرگە ئەنجامی سیاسەتێکی نایەکسانییە کە مرۆڤەکانی کۆمەڵگایەك دەکاتـە کۆیلـە و پێشـمەرگەش

دەرکەوتەی ویژدانێکە لەبەرامبەر ئەو ژیانەدا دەڵێ: (نەء)، لێرەشەوە، ئەو نانەڕەقخواردنی ئازادانەی پێچاترە وەك لە قەلخواردن لەسەر خوانی ملکەچی!

## ***خواردنی نانەڕەق:***

بەوجۆرەی لە زنجیرەی ***خواردنی عاشقانە***دا نووسیم: ڕەمزەکانی خۆشەویستی زۆرن، هەروەکچۆن جۆرەکانی خۆشەویستیش جیاوازن، ئاواش دەتوانین بڵێین: پێشمەرگەکان جۆراوجۆرن، بەڵام (پێشمەرگایەتی) هەر یەکجۆری هەیە بەناوی جیاوازەوە: لەسەردەمێکدا و لە ڕوانگەیەکەوە، پێشمەرگایەتی قارەمانی و قووربانیدان و تێکۆشانە، بەبێ هیچ سەرمایەیەك، گەورەترین سەرمایەی ڕەمزییە.. لە سەردەم و ڕوانگەیەکی ترەوە، پێشمەرگایەتی یاخیگەری و مەترسیداری و باندبازی و دەستەگەریی تیرۆریستانە و میلیشیاگەرییە و پێویستە لەناو ببرێت، چونکە ڕێگرە لەبەردەم دیموکراسییەت و سەقامگیری و ئاشتیدا.. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، پێشمەرگە ناتوانێ ئەوە نەبێ کە سرووشتی مرۆڤانەی خۆی بۆی دیاریکردووە: بوونەوەرێ کە نارەزایەتی دەربڕین لەبەرامبەر ناعەدالەتی و ستەمکاری و بێکەرامەتکردنی مرۆڤدا، ناچاری دەکات بڕیارێ بدات، بەرێگای مەرگدا بەدوای ژیانێکی شایستەی مرۆڤانەدا بۆخۆی و ئەوانیتر بگەڕێ، کە نانەڕەقخواردن ژەمە هەرە خۆشەکەیەتی.

دوائەوانەش پێویستە بزانین کە، نانەڕەقیش بە زۆر شێوە دەخورێ و وەرن با بەیادی پێشمەرگەوە، هەندێکیان تاقیبکەینەوە: هەندێك پێیانخۆشە نانەڕەق تا سنووری ئاڵبوون سووربکەنەوە و بە ڕووتی بیخۆن. کەسانێك بە ئاوی سازگارەوە دەیخەرمێنن. هەندێکی دی نانەڕەق و ماستاو، یان دۆی سارد پێکەوە دەخۆن و کاتێ تامی دۆیەکە لەناو دەمدا دەچێتە سەر نانەڕەقەکە و نەرمیدەکاتەوە، فێنکایەتییەکی خۆش هەستپێدەکەیت. ئاوی گۆشت، یان فڕوجاویش بەنانی ڕەقەوە چێژی تایبەتی خۆی هەیە، بەتایبەتی کە ئاوی گۆشت و فڕوجاوەکە گەرمبێ و زوو نانەکە بخووسێنێ..

ئەمە جگەلەوەی هەموو جۆری سووپ و شۆرباکان، پەلّپینە بەترش، سوویی جۆ، سوویی وردەبرنج، ترخێنە، شێلم بەترش و ماشێنە، بە نانی ڕەقەوە زۆر خۆشن.. چ ئەوەی تێیانبگووشین و چ بەوجۆرەی نانەکە لەپێشدا بخرمێنین و پاشان شۆرباکان بە لرفەوە، هەڵقوورێنن..

ئەگەر تاکو ئێستا لە ئەنجامی ئەو قسانەوە، ئاو نەزاوەتە دەمت و ئەملاولای زمانت لیکی نەکردووە و هەرگیز پێشمەرگایەتیشت نەکردووە، پێشنیار دەکەم جارێکیش لە ژیانتدا، هەر دوای خوێندنەوەی ئەم وتارە: بیسمیلا بکەو تەماتەیەکی سوورکراوە ئامادە بکە و بە ترشیی لیمۆ و ئاوی زەیتوون و ترشیاتەوە، نانەڕەقێکی پێوە بخۆ..!

## نان، ئەی زەوادی خودا..

بێ گوێدانە قرقێنە،

لەگەڵ توورردا دایکرمێنی، با سکت (با) بکا!

بە خەیارەوە بیکەیتە بابۆڵە،

لەبەردەمی تووڕەترین مودیرناحییەدا

بیپروێنە تا خاوبێتەوە..

لەبەردەمی مەلادا پڕ بە نانەشانەیەك سوێندبخۆ:

(بەم زەوادە قەسەم، ئەو کچەم لێمارە نەکەیت

یا هەڵیدەگرم، یان خۆم دەکوژم، یانیش تۆ..).

لە سوڵحی نێوان دوو عەشیرەتدا

مشتێ نانەڕەق

بخەرە گیرفانتەوە و خەمت نەبێ..

لە ژووری سێدارەشدابی،

بە ئەمری نانەڕەق بەردەبی..

بچۆرە ئاساییش و بڵێ:

(کوڕەکەم بەردەن،

با لەلای نانەڕەق

واسیتەی بۆنەکەم!)

زۆر سەیرن ئەم پۆلیسانە!
لەگیرفانی پەیامنێرەکاندا
نانەڕەق دەدۆزنەوە و نایانگرن!
ئەو ڕۆژە (ڕەحمان غەریب)م دی
گوتم: لە کوێ (ڕەحمان)، (غەریب) بووە؟
پێکەنی و پەلکێ نانەڕەقی بۆ هەڵدام و
پێشئەوەی بیگرمەوە،
بە ئاسمانەوە بوو بە مانشێت..
ئەو ڕۆژە لە چەمچەماڵ
ڤۆلتییەی نانەواخانەیەك
ئەوەندە بەرز بوو
گوتم لەوانەیە شارێك گڕتێبەردا..
گونکێ هەویرم بەدەست منداڵێکی
(شۆڕش)ـەوە بینی، بەر لە کردنەوە
هەڵمی لێبەرز دەبۆوە.
چاوم لێبوو لە (سموود)
ساجێ بەبێ ئاگر، بەبێ پشکۆ
سوور بۆتەوە

له (کفری) تیرۆکێ ڕفێیەی کردۆتە پەرچەم

له جیاتی بنێشت و فینگەر

نانەڕەقیان دەجوو، کچانی (وارماوا)..

بەو گەرمای هاوینە قەسەم

دوو پنەم لە نانەواخانەیەکی سلێمانیدا بینی

ڕووت و قووت، جیماعیان دەکرد!

لەولا ترەوە گوێم لێبوو

دووژن دەیانگوت: ووی.. حەیامان چوو..

لەسەر جادەی سەهۆڵەکە،

پڕ بە گەرووی کوورەیەکی داغ،

خەڵك هاواریان دەکرد: کوانێ ئاو..

لە کوێیە کارەبا؟

لەمکاتەشدا لە هۆڵی دیالۆگ، بەبۆنەی نازانم چییەوە

لەفەیان دابەشدەکرد..

بەم چاوانەی خۆم

کۆڵەووژێکم بینی لەدەرگای ماڵانی دەدا

تا خەویان بزڕێ و بێدار ببنەوە..

فەردەیەك ئاردم لەسەری (کێوەڕەش) بینی،
خۆی بەبا دەدا،
بۆ بەیانی خەڵکی ڕانیە هەموو دەپژمین..
لە قەڵادزێوە هاتبوون بزانن داخۆ ئەو تەمە چییە؟
لەبەندەرێڕا دیتبوویان ئاردی تەحالوفە
ئیمانیان لە کەللەیدا نەمابوو
بە جوێندانێ گەڕابوونەوە: (هەی لە تڕانی بەم)!
لە بناری سیوەیل کەلانەیەك بە گووپی پڕەوە
ئەوەندەی پیاز خواردبوو، قرقێنەی لێدەدا.
خەڵکی سەر قوونەبانی مزگەوتێ پێیاندەگوت:
بەناو چاڵوچۆڵی جادەکەیدا پیاسەیەك بکەی،
بەرت دەدا..

من نازانم بۆچی ئیتر شلکێنە لە وڵاتی ئێمەدا ناخورێ؟
خۆزگە کابینەیەك دەهات پشتی شەککرللەمەی دەگرت!
خۆزگە پەرلەمان لەسەر پاقلاوە کۆدەبوونەوە
کوا ئەو ڕۆژەی کۆنفرانسێ بۆ کولێرەبەکاکڵ دەبەسرا؟
دڵنیام ژیان شیرینتر دەبوو..

ئەم هەموو پسکیتە ئێرانییەمان خوارد و
زمانێ فێر نەبووین وەك شەکر..
ئەو هەموو کێکە تورکیانەمان بە کۆنی خواردن و
کەمێ لەلایان شیرین نەبووین..
هەر کە لە(برایم خەلیل) دەپەڕینەوە، لەسەر سەر
دەمانخوولێننەوە،
(زەریاب) دەڵێ: (بابە،
بۆتی لە ئیبلاهیم کەلیل،
خوول، خوول، دەمانخونێلنەوە؟!)..

چوومە شەقراوێ،
دوکانەکانی نانەقەیسی پڕپڕبوون لە قەیسی
ئەو هەموو ژنە بە سووراو و سپیاوەوە،
بە ئاڵتوون و کاوبۆ و مانتۆوە، لەشارانەوە هاتبوون
لەبەردەمی پیرەمێردێکدا دەپاڕانەوە:
(مامە.. قەیسی، نان، نانی قەیسی.. نان)..
مام قەیسی لووتی بەسەر ئەژنۆیدا داژەنی بوو
گوونی بە ناو لنگانیدا شۆڕ ببوونەوە..

مێردەکانیشیان لەناو ئۆتۆمبیلەکاندا
چین چین، عارەقیان دەردەدا،.. لە گەرمان..

ڕۆژێك (ناوساجی)م بینی دەچووە هەندەران
گوتی: تازە بڕوام بە ساج و سێپا نەماوە
سەموونخانەی ئۆتۆماتیکی ئەم وڵاتەیان ناخۆشکرد.
گوتم: بەرد لەجێی خۆی سەنگینە
گوتی: نانیش بەسەر ساجەوە..

لە (تیمار)، کچێ چقڵێ چووبوو بە پەنجەیدا
من چووم لەداخان هەرچی پووشە بیسووتێنم
کەچی حەکیمێ هات، بە گونکێ هەویر تیماریکرد،
بۆ بەیانی کیژە لەسەر پێی خۆی دەڕۆیی
ئیتر حکومەتی ئەولا، بڕیاریدا:
مادام سیوەیلییەکان لەسەر دوو پێ دەڕۆن
جادەیان بۆچییە؟!

کابینەی کۆسرەت ڕەسووڵ هات و جادە نەهات

کابینەی دکتۆر بەرهەم هات و

کارەبای مولیدە هات و جادە نەهات

کابینەی عومەر فەتاح هات و جادە نەهات و هیچ نەهات..

عومەر فەتاح بیری چۆتەوە بۆخۆی هاتۆتە باریّی بچووك

لە حەفتاکاندا،

پرۆژەی ئاوی ئەو گوندەی دامەزراندووە

ئیتر لەوساوە خەڵکی چاوەڕێن..

لە حەفتاکانەوە تا عومەر فەتاح چاوەڕێن و جادە نەهات

بۆ لەوەدواش هیچ ئومێدیان نەماوە..

بۆیە کچەکەی تیمار هەستایەوە سەرپێ

چونکە دەیزانی ماریش پێوەیدا، فریای خەستەخانە ناکەوێ

(گۆران)یش کاتێ کیژەی بینی، لە شیعرێکدا نووسیی:

(کلاّو لار، گورجی کەو ڕەفتار

حەزەر ناکەی ئەڕۆی.. ئۆغر)؟!

(ڕەسووڵ دوونان)م بەسوار کەرێکەوە بینی
پێیگوتم: ئەوانەی سواری مۆنیکا دەبن،
دوو ژنیش دەهێنن و هیچیان پێناخووریٚ،
هیچیان پێناکریٚ
منیش بە ژنێکەوە دوونان دەکەم بە پاروو!..

ئەم وڵاتە ئەوکاتە خۆشە
کە نانەواچییەکان هەستبکەن (نان خەڵق دەکەن)،
نەك دەیفرۆشن..
خەڵقکردن، کارێکی خوداییە..
ئەوەی کاری خودا دووبارەکاتەوە،
مەزنە..

ئەم وڵاتە ئەوکاتە خۆشە کە ژەمیٚ بریتیبیٚ: لە نان و شووتی
تریٚ بە کولێرەوە، پاشایەتی نایگاتیٚ..
یەکجار سەموونی گەرم و مۆتا بخۆی وابزانە ئاغای..
لەم شارەدا خنکام بەبۆنی کەباب
لەوشارانەی تر، مردم بەبۆنی تککە

لەهەر کۆڵانێکدا سیی و جگەرفرۆشێ..
لەهەر کوچەیەکدا سەروپێخانەیەك..
بەو بەیانییەزووانە ڕیخۆڵە چ تامێکی هەیە؟؟
لوولاق بە ئەژنۆی مانگاوە جوانە
نەك بە دەمی خەڵکەوە..

شارێ نەبوو تیایدا پەلکێ کاهوو
پەنیری کردبێتە سەرین و
لە ناو سەموونێکدا ئارامیی گرتبێ..!
چێشتخانەیەك نەبوو بابۆڵەیەکم بداتێ بە جامێ دۆوە
پڕ بێ لە تۆراخ..
ئەوەی بمرێ و تۆراخی نەخواردبێ زوو بۆن دەکا
ئەوەی بمرێ و قەزوانی نەخواردبێ، دەیکەنە بنێشت..

خودایە ئەگەر مردم و زیندووتکردمەوە،
بمکەیتە قەزوان
خودایە لە ژێر ددانی کچێکدا بتەقم و ئیمانم بەیتێ
دەنکە مێووژ لە گەردنییەوە دیار بێ..

هەناسەی بۆنی ڕەیحانەی لێبێ
نەك بۆنی ڕەفز..

خەڵکینە لەمەودوا برمەتان خوارد، نانتان بیرکەوێتەوە
برمە، رۆحی تەنکی نانە بە ئاردی سفر..
لەمەودوا پاقلاوەتان خوارد
لوقمەقازیتان خوارد، سەڵاوات بنێرن بۆ گونکی هەویر
هەویر ئێمەی ڕزگار کرد
هەویر نەبایە ئێستا نانێکی تیری، بە دەفتەرێ بوو
ئارد نەبایە ئێستا حکومەتێکت دەکڕی بە پوولێ
پاروویەکت بە هەموو ژیانت دەستنەدەکەوت..
هەویر نەبایە، شارەوانی لە جیاتی زەوی،
گونکە هەویری دابەشدەکرد..
وەی لەوەی ئازابێ و گونکێ هەویری بەرکەوێ!
وەی لەوەی زیرەك بێ و دەنگی بگاتە ئەنجومەنی وەزیران،
بۆ وەرگرتنی تەشتێ هەویر..

ولاتی من ڕۆژگارێ بە گەنمەوە دەشنایەوە
ئێستا پووش، دڕك، دڕوو، ئەو ناوەیان داپۆشیوە..
نیشتیمانی من ڕۆژگارێ بە جۆوە بالای بەرز بوو
ئێستا بالای گەندەڵیم بەرزترە لە چیای سورکێو

وەردێکم بینی بە شەماڵی دەگوت:
(بیری گوڵەجۆ دەکەم،
بیری قژە بۆرە درێژەکانی
بیری قەدی، بیری ڕەنگی،
بیری ڕۆحی، کاتێ پڕت دەکات لە مەستی
لە ئێوارەیەکی خەماویدا..

بیری گوڵە گەنم دەکەم
ئەو گوڵەی هەمیشە ڕوو لە یەزدانە
تاکو بەباراندا پڕیکات لە ڕەحمەتی خۆی..
توخودا بە وەزارەتی کشتوکاڵ بڵێن:
مشتێ گەنم بەسە بۆ سەوزکردنی ژیان لە دەشتی بێتوێن
لەوێچێ جۆ بەسە بۆ مەستبوونەوەی دەشتی شارەزوور

بیریان دەکەم
بیری ڕەحمەتی خودا لە گەنمدا و
بیری مەستیی جووتیارێ لە سەر خەرمان..).

من سەرم سووڕماوە لەوەی میللەتێ
لەسەر دەفتەرنفووسی نووسرابێ:
ڕەنگی چاو: نرجسی
ڕەنگی پێست: حنطی،
چۆن بەهاری بیردەچێتەوە؟
چۆن گەنمی بیر دەچێتەوە؟!
لەسەر ئاڵاکەی..

پەروەردگارا،
وەسییەت بێ ئەگەر مردم کولێرە بەڕۆنێ
لەسەر گۆڕەکەم دانێن..
با کێلی سەر قەبرم لە کولێرەی پیاڵەسوو بێ.
تکایە بچنە سنە، شاری مەستوورە،
سەنگەکیم بۆ بهێنن بەقەدەر دەرگای (دارالاحسان)..

ڕووخسارم بە نانی تەنکیی هەورامی داپۆشن
با لە قەبرەکەمەوە، مەولەوی دیار بێ..
لە بابۆڵەکانی پیرەمێرد، دانەیەك بخەنە گیرفانمەوە..
هەناسەشم پڕکەن لە بێدەنگیی مامڵێ..

لە ڕەواندووزەوە، ئەستوورکە تەندووریێ بهێنن
بۆنی خەونەکانی (حوسێن حوزنی) لێبێ..
ئەو پیاوە خەونی بینی، خودایە.. خەونی جوان
خەون بەقەد تاڵە ڕیشە نەرمەکەی
خەونی بۆنخۆش وەکو نانی تەندووری
گەرم وەکو گێڕانەوەی بەسەرهاتەکان
پڕ ماجەرا، وەك (مێژووی میرانی سۆران)..

هەرچی ڕەشکەیە لە دەوورم بینێژن
هەرچی شمڵییە بەسەرما بیرێژن..
دڵنیام لەبەر بۆنی کونجی، خودا دەمبەخشێ..
ئەم وڵاتە کە پڕ بووە لە دارووجان
دڵنیام قەراخ پردی سیراط پڕە لە هەرزن

**مشتێ هەرزن دەدەم بە گایەك و پێیدەڵێم:**

**ئا توخوا بمپەڕێنەوە بۆ ئەوبەر**

**گوڵە گەنمێ دەبەخشمە کرێکارێکی عەرەب و دەڵێم:**

**کاتم نییە باوەشێنت کەم، برا**

**ئەمە بەرەوە بۆ سەحرا، با پڕبێ لە بای شەماڵ..**

**دەنکە جۆیەك بەسە بۆ ڕازییکردنی فریشتەکان**

**لەوپەڕی ئاوایی..**

**من بە دەنکە جۆدا باڵای کچم بیر دەکەوێتەوە..**

**بە دەنکە ساچمەشدا باڵی کۆتر**

**بە ئەڵغامیشدا: زلی بێ هونەر..**

**تووخودا تابووتەکەم پڕکەن لەئاردی سفر**

**با بەناسکی و بە سپێتی بچمەوە بەهەشت!**

**بووخچەیەك لە بان سەرما پڕکەن لە پەنجەکێش**

**دەیبەم بۆ منداڵێکی (قەیتوول) لە دۆزەخی ئەنفال..**

**بەبێ نان، بەبێ ئارد، بەبێ کولێرە و شلکێنە سەفەر ناکەم**

**دوو پێم ناچێتە ئەوێ بەبێ نان و چا**

بووخچەی شوانێکم بدەنێ و مێگەلی وڵاتێ بکەنە بەرم
بەڵام بەبێ نانەڕەق بچمە هەر بەهەشتێکەوە
گەندەڵی دەکەم..

ئەی نان،
ئەی زەوادی خودا لەناو ئەم زەلکاوەدا
دواجار لەم دنیایەدا هەڵدەوەریێ..
بەڵام لەو دنیا، دڵنیام
بە پێڵوو هەڵتدەگرینەوە..

دواجار دەوڵەتێ هەیە لەسەر تۆ بێتە دەنگ
خودایەك هەیە لە تۆدا، بێدەنگ،
دواجار دەستێ هەیە لەگەڵ تۆدا میهرەبان..

# خواردنیی پەنابەران

**متمانە، پەناهێنان و میوانداری:**

**ئەزموونی** مرۆڤ لە ژیانی خۆیدا، ئەزموونێکی پەنابەریانەیە. ئێمە لەو ماوەیەدا کە دەژین و لەو ژیانەدا کە ئەزموونی دەکەین، هیچ نین لە پەنابەرێك زیاتر. پەنابەرێك کە گرنگ نییە لە کوێوە هاتووە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە پەنای بۆ کوێ و بۆ کێ هێناوە. مرۆڤ بەوەی پەنا دەبات، ناسنامەی پەنابۆهێنراو دەخاتە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی گرنگ: ئایا ئەوەی پەنامان بۆ بردووە، دەتوانێت لە ئاستی داڵدەدەرێکدا هەڵسوکەوت بکات و وەڵامگۆی ئەو متمانەیە بێت، کە پێیکراوە؟، یاخود ئەویش بەڵگەیەکی دیکەمان لەسەر ناکۆکی گوفتار و ڕەفتار لەلای مرۆڤ، دەخاتە بەردەست؟

دایك و باوکێ کاتێ بڕیاری دروستکردنی منداڵێك دەدەن، هەر تەنیا ئامادەیی خۆیان پیشان نەداوە بۆ زیادکردنی پەنابەرێکی دیکە بۆ سەر ژمارەی پەنابەرانی دنیا، بەڵکو بەو بڕیارەیان گوتوشیانە کە بۆخۆیان یەکەم کەسانێك دەبن، داڵدەی ئەو پەنابەرە بچکۆلەیە دەدەن. گوتویانە: ئەوان شایانی ئەوەن متمانەیان پێبکرێ، گوتویانە: ئێمە جیهانی خۆمان لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بەشدەکەین، کە پێشتر لە ژیانماندا نەبووە. گوتویانە: ئێمە هیچ پێشمەرجێکمان نییە سەبارەت بەو مرۆڤەی داڵدەی دەدەین، بۆمان گرنگ نییە بە زگماك مرۆڤێکی ساخە، یان نەخۆش، بۆمان گرنگ نییە

لەخۆمان دەچێ، یان لە کەسانێکی دی، مـەرجمان نییـە کـە ڕەنگـی پێسـتی، ڕەنگـی چاوی، بەرزیی بالای، شێوەی دەستوپەنجەی و هتد، دەبێت وەك هی خۆمان وابێت.. دالدەدەر، هەر پێشمەرجێکی لەوبابەتەی لە قوژبنێکی خەیالـدانی خۆشـیدا هـەبێت، ڕۆژگارێ پێگەی خۆی دەگۆڕێتەوە بە ستەمکار و پێگەی پەنابەریش دەکاتە کۆیلـە و ستەملێکراو. ئەوانەی بڕیاردەدەن دالدەی کەسـانێکی دیکـە بـدەن و ژیـانی خۆیـانی لەگەڵ بەش بکەن، لە متمانەیەکەوە ئەمکارە دەکـەن کـە پێمانـدەڵێت: ژیـان ئـەوە دەهێنێ تیایدا بژین، ئەوە دەهێنێ تیایدا دالدەی یـەکتر بـدەین و ئـەوەش دەهێنـێ کـە متمانە بە ژیانێك بکەین، کە جێگەی هەموومانی تێدا دەبێتەوە.

بەهەمان شێوەی دایك و باوك، کاتێ وڵات و حکومەتێکیش بەگەڕانەوەی بۆ ئیرادەی میللـەتی خۆی، یان بە بەکارهێنانی ئەو متمانەیـەی میللـەتەکـەی پێیبەخشـیوە، بڕیـار دەدات دەرگا لەسەر کەسانێك ئـاوەڵا بکـات کـە شـایانی ئـەوەن ژیـانی خۆمانیـان لەگەڵدا بەش بکەین، نەك هەر گوتویەتی ئەم وڵاتە جێگـەی خـەڵکانێکی دیکەیشـی تێدا دەبێتەوە و ئەم خاکە بەتەنیا هـی ئێمـە نییـە، بـەڵکو گوتوشـیەتی: پێویسـتە ئـەو خەڵکانە متمانەی ئەوەمان پێبکەن، ژیانی ئەوان لەم وڵاتەدا بەدوور دەبێـت لـە هـەر ستەمکارییەك کە یادگاری ناخۆش بخاتەوە بیریـان کـە لـە وڵاتـی خۆیانـدا بەسـەریان هاتووە. وڵاتێك، یان حکومەتێك، یاخود میللـەتێك، یانەکو کەسێك، کە دەرگای ماڵ و وڵات و کۆمەڵگای خۆی بۆ دالدەدانی ئەوانیتر خسـتۆتە سـەر پشـت، نـەك هـەر پیشانیداوە، بوونی کەسانی دیکە لـەم وڵاتـەدا، بـوونێکی ئاسـوودە دەبێـت، بـەڵکو مـژدەی ئەوەیشـی پێـداون کـە ئێـرە شـوێنی مانـەوە و پاراسـتنی ئەمنییـەتی ئەوانـە. لێرەشەوە، لە پشت هەر دەرگا کردنەوەیەکی لەو بابەتەوە، خەڵکی نیشتەجێی وڵات و هەرێمگەلێکی دیکەیشی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، هانداوە تاکو لە شوێنی خۆیـان هەڵکەندرێن و بێنە ئێـرە.. بـەمجۆرەش لـە بنـەمادا پـەناهێنان و متمانـە بـۆ هەمیشـە بەستراون بە یەکترەوە: هیچ هێزێك لە دنیادا نییە وا لە تەنانەت کۆرپەیـەکی سـاواش بکات، بێتە باوەشمانەوە، ئەگەرەکو متمانەی بە نیگا و باوەش بۆگرتنـەوەمان نـەبێت و

فەزای دالّدەدانی ئێمە لە سیما و ڕووخسارماندا بەدی نەکات. هیچ کەسێ هانا بۆ وڵات و حکومەت و میللەتێکی دیکە نابات، ئەگەر دڵنیا نەبێت لەوەی دالّدەی دەدرێ. یەزدان کە باوکە ئادەم و دایکە حەوای لە بەهەشتەوە هەناردە خواریّ بۆسەر زەوی، هیچی نەگوت لەوە زیاتر کە فەرمووی: زەوی شوێنێکی دڵنیایە بۆ ژیان و بەمەش دڵنیایی و متمانەی لەلای مرۆڤ پێکەوە گرێدا. متمانە بە گوتە و متمانە بە شوێن: متمانەی مرۆڤ بە یەزدان وەك دالّدەدەر و متمانەی مرۆڤ بە زەوی وەك شوێنی بۆ نیشتەجێبوون. ئەو مرۆڤەی دەرگای ماڵەکەی بەسەر کەسانێکدا ئاوەڵا دەکات و بۆخۆی کەمێ دەکشێتەوە دواوە و بە ڕووی خۆشەوە فەرموویان لێدەکات، گوتویەتی: کە ئەم شوێنە شوێنی هەموومانە و بوونی ئێمە لەم ماڵەدا و لەکەنار یەکتردا، فراوانییەك بەمانای (بوون) دەبەخشێ و دەیکاتە (پێکەوەبوون). پێکەوەبوون لەم مانایەدا، بەواتای بوونی ئێمە و هەڵکردنمان لەگەڵ خۆمان و لەگەڵ ئەوانیتریش. هەڵکردنمان لەگەڵ خۆمان، واتە چاوپۆشین و ڕەتکردنی هەرجۆرە ناکۆکی و دژ و نارازیبوون و پێناخۆشبوونێك لە خودی خۆماندا سەبارەت بە ژیانمان لەگەڵ ئەوانیتر. هەر جۆرە پێناخۆشبوونێك سەبارەت بە بوونی ئەوانیتر لەکەنار خۆماندا، بۆخۆی دەبێتە هۆی تەسکبوونەوەی بواری ژیان و بوونی خۆمان و دووچاربوونمان بەو ناکۆکییە کوشندەیەی کە بە دەم شتێکمان پێدەڵێت و بە ڕەفتاریش شتێ خۆی دەردەبڕێ. بۆیە پێویستە مرۆڤ سەرەتا لەگەڵ خودی خۆیدا هەڵبکات ئەمجا دەتوانێ متمانە بە ئەوانیتر ببەخشێ بۆئەوەی پەنای بۆ بهێنن. ژاك دریدا نووسیویەتی: میوانداریکردن بۆخۆی کەلتوورێکە و تا ئەو شوێنەی پەیوەستە بە (ئیتیۆس)ـەوە، واتە پەیوەستە بە نیشتەجێبوون، ماڵی حەوانەوەی تایبەت، شوێنی نیشتەجێبوونی خێزان، واتە پەیوەستە بە بوونی ئێمە لەگەڵ ئەوانیتردا و پەیوەندیی ئێمە بە ئەوانیتر و بێگانەکانەوە، وەك پەیوەندیی خۆمانی لێدێت بە خۆمانەوە، ئەوە لەم حاڵەتانەدا میوانداریکردن خودی ئەخلاقە. واتە ئەخلاق هاوشانی ئەزموونی میوانداریکردنە. بەم پێیەش لەلای دریدا، ئەخلاق سەرچاوەیەکی دیکەی نییە لەو

ڕەفتارە زیاتر کە ئێمە لە چوارچێوەی میوانداریکردنی ئەوانیتردا، دەینوێنین. ئەو، لە شوێنێکی دیکەدا دەنووسێ: کاتێ کەسێك لە سەر قەراخی دەرگا وماڵەکەی خۆیدا ڕاوەستاوە و بە ڕوویەکی خۆشەوە بەخێرهاتن لە میوان و بێگانەیەك دەکات، بەمانای ئەوەیە (لێرە کەسێ لە ماڵەوەیە.. کەواتە شوێنێکی کردۆتە هی خۆی بۆ ئەوەی بتوانێ بەخێرهاتنی ئەویتری لێوە بکات. یاخود لەوەش زیاتر: بەخێرهاتنی ئەویتر دەکات تاکو شوێنێ بکاتە هی خۆی..). بەلای دریداوە، بیرکردنەوە لە میوانداریيەك کە تیایدا خاوەنماڵ بە ڕووی خۆش و بزەی سەرلێوەوە بەخێرهاتنی میوانەکانی نەکات، میوانداریی نیە. ئەو دەڵێ: (جیاکردنەوەی کەلتووری میواندۆستی لە کەلتووری پێکەنین و ڕووخۆشی، کارێکی ئاسان نییە).

ئەوە ڕاستە کە مرۆڤ لە قەراخ دەرگای ماڵ و شوێنەکەی خۆیدا پێشوازیمان لێدەکات و بەڕوومانەوە پێدەکەنێ، وەلێ بە هیچ شێوەیەك مەسەلەی ڕووخۆشی پەیوەست نییە بەوەی مرۆڤ لەو شوێنەدایە بۆیە بەڕووی خۆشەوە پێشوازی لە میوانەکانی دەکات. سەرچاوەی ڕووخۆشییەکە لەوەوە نەهاتووە کە شوێنێ، یان ماڵێ هەیە بۆ پێشوازیکردن لە میوانەکان، بەڵکو پەیوەستە بە هەڵکردنی کەسەکەوە لەگەڵ ئەوانیتر، پەیوەستە بە نەبوونی ناکۆکی و دژایەتییەوە لە ناخی کەسەکەدا بەرامبەر بەوانەی پەنای بۆدەهێنن و پەیوەستیشە بە لەخۆتێگەیشتنی (خود)ەوە کە توانای جێکردنەوەی ئەوانیتری هەیە لە خۆیدا و پەیوەستیشە بە فراوانکردنی پانتایی ژیان و بوونی پێشوازیکەرەوە لەڕێگەی ئامادەکردن و قەبوولکردنی بوونی ئەوانیترەوە لەکەنار خۆیدا. کەواتە سەرچاوەی خۆشحاڵیی میواندۆست، ناخ و دڵی خۆیەتی، ڕووناکایی ناوەوەی خۆیەتی کە لە نیگایدا دەبێتە بریقەی ئیشتیاق و چاوەڕوانی و لە لێوەکانیدا دەبێتە بزە و خەندە و وشەی جوان و زۆرجاریش لە سیمایدا ئەو ئیشتیاق و خۆشییەی بینینی بەرامبەر، دەبێتە دڵپڕی و فرمێسکی خۆشیی و گریانی بێدەنگ.. دریدا بۆخۆی ئەمجۆرە میواندۆستییە لە لەلای میللەتێکی دێرینەی وەك توپینامبا (*Tupinamba*)، لە ئەمەریکای خواروو، بە نمونە دەهێنێتەوە و باس لەوە دەکا، کە

چۆن لەکاتی هاتنی بێگانەیەکدا بۆ شوێنی حەوانەوەیان، لە خۆشییاندا دەست بە گریان دەکەن. کوردیش ئەو میللەتەیە کە زۆرجار گریانەکانی لە خۆشییەوەن، نەك لە دڵتەنگییەوە، لە هاتنەدی چاوەڕوانییەکی ناچاوەڕوانکراوەوە، نەك لە تێنەگەیشتن لەمانای خۆشییەوە: کوردەکان لەم ڕۆژانەدا، کە دەبینین جەللادی نەتەوەییان دادگایی دەکرێ، لە خۆشیاندا دەگرین، ئەگەرچی بۆی هەیە بەرگریکەرەکەی سەدام، ئەو گریانەی کورد وەك (پێناخۆشبوونی ئەوان بە سزادانی سەرۆکی پێشووی کۆماری عێراق)، تەفسیر بکات!

## میوانداری و ئەخلاقی داڵدەدەرانە:

ئەخلاقی داڵدەدەرانە، خودی ئەخلاقە و میوانداریی ئەو پانتاییە مرۆییەیە کە ئەم ئەخلاقەی تێدا بەرجەستە دەبێت. ئەخلاقی داڵدەدەرانە لەسەر بنەمای هاوچەشندۆستی و ئەویترویستی بێمەرجەوە دروستدەبێت و بەڵگەیە لەسەر گەشەی شارستانیانەی ئەو ژینگەیەی کە ئەم ئەخلاقە بەرز دەنرخێنێ. زۆرن ئەو میللەت و نەتەوانەی ڕۆژگارێکی زۆریان بەدەست نەبوونی ئەم ئەخلاقەوە، لەبەردەم کەمپەکانی پەنابەری و سنووری وڵاتانی دیکەدا، لە چاوەڕوانیدا تێپەڕاندووە، وەلێ کاتێ خۆیان بوونە خاوەن وڵات و دەرگا و سنوور، نەیانتوانیوە میواندۆستانە و داڵدەدەرانە ڕەفتار بنوێنن. لە دنیای ئەمڕۆدا ئەخلاقی داڵدەدەرانە لەژێر هەڕەشەی دوو لایەنی سەرەکیدایە. یەکەم بەیاساییکردنی مەراسیمی میواندۆستی و دووەم هەڵاوسانی خۆپەرستی و ئیگۆیزم. ئەوەی یەکەمیان پەیوەستە بە پابەندبوونی ژیانی مرۆییەوە بە عەقڵانییەتی مۆدێرن و ئەوەی دووەمیشیان ئاشکراکەری بەهێزیی ڕەهەندی غەریزەییانەی ژیانی مرۆڤە لەناو هەناوی مۆدێرنیتەدا. ژیانی ئەمڕۆ، مەترسییەکانی ژیانی ئەمڕۆ، کەلتوورە نێوانمرۆییەکان، لەوانەش کەلتووری میواندۆستی و پێشوازیکردنی بێمەرج لە ئەوانیتر، گشتیان لە بەردەم هەڕەشەی شێلگیرانەدان. ئەمڕۆ پێشوازیکەران بەهەمان شێوەی جاران، لەبەردەمی ماڵەکانیان و شوێنی

حەوانەوە و لەکەنار دەرگای حەوشەکانیانەوە، پێشوازی لە بێگانە و میوانەکانیان دەکەن، وەلێ ئەو بزە و ڕووخۆشییەی جارانیان نەماوە. لانیکەم ئەگەر بەڕووی خۆشیشەوە پێشوازییان لێبکەن، سەرچاوەی ڕووخۆشییەکەیان بە دەگمەن لە ناخ و دڵیانەوەیە. ئەوان بەدەم شتێ دەڵێن و شتێکی دیکە لە ناخ و دڵیاندایە. وەکئەوەی چیدی پەیوەندیی نێوان دەمارەکانی ناخ و لێو، مێشك و زمان، بیرکردنەوە و دەربڕین، وەکو جاران گەرم و گوڕ نەمابێت.

مرۆڤ لە دنیای ئەمڕۆدا تادێت لە جیهانە تایبەتییەکەی خۆیدا دەژی و بەخۆیدا ڕۆدەچێ و لە ئەوانیتر دوور دەکەوێتەوە. تادێت کوانووی پێکەوەبوونەکان کوێر دەبنەوە و ئاپارتمان و شووقەکانی تەنیایی زیاد دەکەن. ژیانی ئەمڕۆ بەجۆرێکە مرۆڤ دەوڵەمەندیی خۆی، هەیبەتی خۆی و پێویستیی ڕۆحیی و مەعنەویانەی خۆی دەکاتە بارمتەی شتە ماتەریالییەکان. چیدی ماڵ بە میوانەکانی و وڵات بە بێگانە و پەنابەراکانییەوە شانازی ناکات. هەلومەرجی میوانداری و داڵدەدانی پەنابەران، تەنانەت ئەوانەیان کە هاوزمان و هاوڕەگەزیشن، بە حەددێك دراوەتە دەست یاسا و بەعەقڵانیکردن، کە مرۆڤ وا هەستبکات هیچ پەیوەندییەکیان بەوەوە نەماوە. مرۆڤی ئێمە بەرەو شێوازە ژیانێك دەچێ کە تیایدا میواندۆستی دەبێتە شتێکی تایبەت بە وەزارەتی گەشتوگوزار و هوتێل و سەیرانگاکان.. پەیوەندیی ئێمە بە میوان و بێگانەکانەوە خەریکە دەچێتە ئاستێکی نزم و تەنانەت ڕقبوونەوەش لە میوان. مرۆڤی ئێمە ئێواران بەرەو ماڵێکی چۆڵ دەڕواتەوە کە چیدی هیچ حەکایەتێکی تێدا ناگێڕدرێتەوە. ئەو دەبێتە خاوەنی شوێن، خاوەنی شوققە و خاوەن ماڵ، بەڵام وەستانی لەکەنار دەرگاکەیدا مانای پێشوازیکردن لە میوان و بێگانان ناگەیەنێ. ئەو لەمەودوا بۆی هەیە دەرگامان لێبکاتەوە، بەڵام ئەو خەندەیەی دەیهێنێتە سەر لێوەکانی، سەرچاوەکەی ناخ و دڵێکی ڕووناك نییە.. ئێمە بەرەو کۆمەڵگا و شێوازەژیانێك دەڕۆین، کە تەنانەت ئەوانەی ڕۆژگارێ لێرە و لەم ماڵە و لەم خێزانەشدا لەگەڵمان بوون، هەستبکەن دوای گەڕانەوەیان لە سەفەر و لە هەندەران، وەك بێگانە و

نەناسراو مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ. ئەوانمان لە دڵی خۆماندا کردۆتە دەرێ و داومانەتە دەست یاسا و لایەنی بەر پرس.. میواندۆستی و کەلتووری پێشوازیکردن لەو شوێنەدا لە ئەخلاق جیادەبێتەوە، کە تەسلیمی بەیاساییکردن دەکرێ و یاسا سنوور بۆ شێوازی پێشوازیکردن و داڵدەدانی بێگانە و میوانەکان دادەنێ..

بەودیویتردا، ئیگۆییزم و خۆویستی، هیچ بوارێك بۆ کەلتووری پێشوازیکردن و بوون لەگەڵ ئەوانیتر ناهێڵێتەوە. ئیگۆییزم لە بنەمادا دەستگرتنێکی توونده بە هەموو ئەو شتانەوە کە تایبەتن بەخۆمان و ئامادەکردنی هەموو شتێکە لەدەرەوەی ئەوانیتر. بۆیە مرۆڤی ئیگۆییست لە پێناوی شتە تایبەتییەکانی خۆیدا، خۆی دەدۆڕێنێ و خۆی لە ڕێگەی شتەکانییەوە دەپەرستێ و بەوجۆرەش لەگەڵ لەدەستدانی خۆی، ئەوانیتریش لەدەست دەدات. ئەو، بە پێچەوانەی میواندۆستەوە، تادێت جیهانی خۆی و مەودای بوونی خۆی لەگەڵ ئەوانیتردا بەرتەسکدەکاتەوە، بەجۆرێ وەك ئەو بوونەوەرە سەرتاییەی لێدێت کە لەناو جەنگەڵێکدا، هەم بۆخۆی لە ئەوانیتر دەترسێ و هەم ئەوانیتریش سڵی لێدەکەنەوە. لە میواندۆستیدا ئەویترویستی و هاوچەشندۆستی، ژیانی ئێمە دەوڵەمەند دەکەن و دوورماندەخەنەوە لە ناعەقڵانییەت و ڕەگەزپەرستی و ئەتنۆسەنتەریزم و ئەتنۆکەلتووریزمی کوێرانە، لەکاتێکدا ئیگۆییزم، ملکەچ و زەلیلی غەریزە ناعەقڵانییەکانمان دەکات و یەکسانمان دەکاتەوە بەو ئاژەڵانەی کە لەهەر کاتێکدا بۆی هەیە غەریزە پاڵمان پێوە بنێ بۆ پەلاماردان و خواردنی ئەویتر.

لە جیهانی ئەمڕۆدا، ئەو ناکۆکییەی کەوتۆتە ئەخلاقی داڵدەدەرانەی ئێمەوە، بۆتە هۆی ئەوەی داڵدەدانی بەدرۆ بالادەست بێت. واتە تۆ دەرگا لە میوان و بێگانان دەکەیتەوە، هانیدەدەی لە شوێنی خۆی هەڵکەندرێ و وادەی پێدەدەی بێتە ولات و شار وماڵی خۆتەوە. بەلام ناتوانیت ئاسوودەی بکەیت. پێتوایە بێگانەکان شار و پارکی شاریان قەڵەبالغ و پیسکردووە. کرێ خانوویان گرانکردووە، ڕێژەی تاوانکاری بەرزبۆتەوە، شەقامەکان تەسکبوونەوە و نەخۆشییەکان زیادیانکردووە. هاوڕێیەکی توێژەرم ئاگاداریکردمەوە کە لە ڕاپرسییەکدا، ڕێژەیەکی زۆری

هاوولاتیان، بەداخەوە ژمارەیەکی زۆر لە گەنجان، پێیانوایە (ئەم هەموو عەرەبەی دێنە کوردستانەوە، ژیانی ئێمەیان لاسەنگ کردووە) و پێویستە کۆمەڵێ مەرج لەبەردەم هاتنیاندا قووتبکرێتەوە. جێگەی سەرسوورمانە، میللەتێ هێشتا هەڵم لە قابلەمەی شۆڕش و ڕاپەڕینەکەی بەرزدەبێتەوە، کەچی لەگەرووی ڕەیزسیزم و نالێبووردەییەوە سەردەردەهێنێ.. ئەوە بەدبەختی میللەتێکە، میوان و بێگانەکانی بەسەرچاوەی کێشەکانی بزانێت و چاوی هەلومەرجە نالەبارەکانی ژیان نەبینێ و تەنیا تەماشای کۆمەڵێ مرۆڤ بکات کە بەتەنگ بانگەوازەکەی تۆوە هاتوون، کە گوایە دەتەوێ سنوور و پانتایی ژیانی خۆت بە پێشوازیکردن لە ئەوانیتر فراوان و دەوڵەمەند بکەیت و کەچی تەنیا بەوەی بەلاچاو، بەچاوی نزم، وەك لێقەوماو تەماشایان بکەیت، ولاتیان لێدەکەیتە دۆزەخ و ڕۆحی مرۆڤانەیان ئازار دەدەی.. میللەتێ، بۆخۆی لەهەر بارودۆخێکدا بێت، ئەو خۆشی و نیعمەت و چێژە نەبینێ کە لە ئامادەیی میوان و بێگانانی ولاتەکەیدا هەیە و ئەو هەلە نەقۆزێتەوە بۆ پێشوازی لێکردنیان، دەبێ دوای شاربەدەرکردن و تۆراندن و ڕاونانیان، بە چ پاساوێك شەرمەزارییەکانی خۆی داپۆشێ؟!

**خواردنی بێگانان:**

بەرلەوەی باسی خوارنێك بکەم کە تایبەتکردووە بە میوان و بێگانان، دەمەوێ چیرۆکێکتان لەسەر خۆم بۆ بگێڕمەوە کە لە سەرەتای ژیانی پەنابەرێتیمدا بەسەرمهات. ئەو نیوەڕۆ درەنگەی بۆ جاری سێیەم لە شارێکی دانمارکدا و لە ژووری ماڵێکدا سەقامگیر بووم، هەستم بە ماندوویی و برسێتییەکی زۆر دەکرد، هەمووی سێ مانگ بەسەر مانەوەمدا لەو ولاتە تێپەڕی نەکردبوو، کە پاشان ئەو ماوەیە بووە سیازدە ساڵ مانەوە و چواردەجار ماڵگواستنەوە. بڕیارمدا لە نزیکترین فرۆشگادا شتێ بکڕم و لە ماڵەوە دروستیبکەم. بۆ یەکەمجار لەدەرگای فرۆشگایەکی زۆر گەورە چوومە ژوورەوە، هەر لە سەر ڕەفەکانی سەرەتادا، قتوویەکی گۆشتم هەڵگرت،

کیسەیەك پیاز، خوێ، ڕۆن، دۆشاوی تەماتە، شەربەتێك و سەموونێكی درێژم پڕدایە و بەپەلە بەرەو كۆتایی فرۆشگاكە چووم بۆئەوەی پارەكەیان بدەم. لەماڵەوە و لە مەتبەخی خاوەنماڵدا كە بۆم هەبوو بەكاری بهێنم، بەدەم پارووگرتن لە سەموونەكە، كەوتمە پیازجنین و نەختێ ڕۆنم لە تاوەیەك كرد و تا پیازەكان قرچان، قتوویەكم لە قتووەكان هەڵپچڕی و گۆشتەكەی ناویم كردە ناو تاوەكەوە و سەرەكەیم لەسەر دانایەوە. تا بەخێرایی ئاوێكم بەخۆمدا كرد، بینیم ئاوی گۆشتەكە وشكی كردووە. پارچەیەك سەموونم بڕی و پەرداخێ شەربەتم تێكرد و كەوتمە خواردنی گۆشتە سووركراوەكەم. پێموایە لە شەشەمین پاروو، یان حەوتەمدا خاوەنماڵ هاتەوە كە خانمێك بوو، بیروڕای چەپ بوو، لە ناوەڕاستی سییەكانی تەمەنیدا و بەڕێوەبەری قوتابخانە بوو. هەر لەدەرگاوە تێیگەیاندم كە بۆنی خواردنەكەمی كردووە و كە هاتە مەتبەخەكەوە یەكسەر بەرەو قتووە هەڵپچڕاوەكە، كە هێشتاش لەسەر مێزی لای تەباخەكەوە بوو، چوو. هاواری كرد: {(ئۆ.. و.. غێڤار!)، واتە: ئۆی ڕێوار!} و قتووەكەی بەرەو لای من هێنا و بەدەم پێكەنینەوە و وەكئەوەی كەتنێكم كردبێ، بە پەنجەی سەرنجی بەرەو وێنەیەك ڕاكێشام كە لەسەر قتووەكە چاپكرابوو، بەبێ ئەوەی من پێشتر لێی ورد بووبێتمەوە، بینیم: وێنەی سەرە سەگێكە!

من زمانم نەدەزانی، شەرمن بووم، هەرگیز سۆپەرماركێت نەچووبووم، كەسم نەدەناسی، تەمەنم كەم بوو، ئەزموونی خواردن دروستكردنم نەبوو، لە وڵات و كەلتوورێكەوە نەچووبووم كە سەگ و پشیلەكانیان خواردنی تایبەتیان بدرێتێ. بەپەلە بووم، برسیی بووم و دەمویست پێش هاتنەوەی خاوەنماڵ خواردنەكەمم لێنابێ و مەتبەخەكەم چۆڵكردبێ.. بەهەرحاڵ من نمونەی پەنابەرێك بووم. تازە خەریك بوو لە وڵاتێكدا نیشتەجێ دەبوومەوە كە زۆر جیاوازبوو لە شوێنەكانی دیكەی جیهانی من، دەمویست لەداییك ببمەوە، بژێمەوە، لە دەرگام دابوو، دەرگایان لێكردبوومەوە و تازە لە ژوورەوە بووم، لەگەڵ ئەوان.. وەلێ ئازاد بووم، سەربەخۆ بووم، دەمتوانی بڕیار بدەم و تەنانەت خواردنی سەگەكانیش بخۆم بەبێئەوەی كەس ئەمەم بە حەرام و

تاوان و گوناهێك بۆ بنووسێ.. هەستكردن بە دڵنیاییەك بوو متمانەی منی بەو وڵاتە ئەوەندە پتەوكردبوو، كە بڕوام نەدەكرد هیچ شتێ هەبێ زیانی بۆ مرۆڤ هەبێ.. من داڵدە درابووم، میوانداری كرابووم، دڵنیاكرابوومەوە لەوەی دەتوانم ئاسوودە بم و بژیم..

بێگانەكان چاوەڕێی سفرەی ڕازاوە ناكەن، ئەوان هەرشتێ دەستیان بیگاتێ و بتوانن دروستیكەن، دەیخۆن. لێیانگەڕێ خواردنی سەگ و پشیلان بخۆن، بەڵام ئاسوودەییان مەشێوێنن، هەستی دڵنیابوون و ئارامبوونەوەیان مەڕاكێنن. ئەوان لێرە نین بۆ ئەوەی شتێكمان لێداگیر بكەن، بۆ خراپكردنی پارك و شەقامەكان نەهاتوون.. كچەكانمان هەڵناخەڵەتێنن، ئەوان دەزانن كە میوانن، لەشوێنێكی تر و وڵاتێكی دیكەوە هاتوون و ڕەچاوی تایبەتمەندییەكانی ئێمە دەكەن. ئەوان تەنیا بەرگەی ئەو نیگایانەی ئێمە ناگرن كە بەهۆیەوە بیریاندەخەینەوە، كە: ئەوان لە ئێمە نین. موحتاجن، بەزەییمان پێیاندا دێتەوە، خێرمان پێكردوون.. ئازاردانی ئەوان لەوەدا نابینمەوە كە شوێنیان نییە، شوققەیان نییە، خواردنی شیك و لەبار ناخۆن، ئازاردانی ئەوان لەوێوە دەستپێدەكات كە ئەو هەستەیان لەلا دروستبكەین، لانیكەم تا لێرەن، ئێرە بەماڵی خۆیان نەزانن. هەستبكەن ئەوان لێرە زیایە و پەراوێزین. ئەوان بەوە ئازار ناخۆن ئێمە لەودیو شووشەی چێشتخانەكانەوە ببینن و بۆخۆشیان لەو دیوەوە چاوەزەقەیان بێت، ئازاری ئەوان لەوێوە دەستپێدەكات كە تۆ وەهای پیشانبدەیت ئەو ناتوانێ لێت نزیكبێتەوە و پەنات بۆبهێنێ بۆ ئەوەی پرسیارێكی زۆر سادەت لێبكات: (ببوورە، مزگەوت لەم ناوەدا هەیە؟)

بۆ ئەوەی لە شوێنێكەوە دەستپێبكەین، بۆئەوەی كەمێ ئاسوودەیی ببەخشینە میوان و بێگانەكانمان و بۆئەوەی بیرمان نەچێتەوە كە ژیانی خۆشمان جۆرێكە لە پەنابەری و پەنابۆبردن و داڵدەدان، پێویستە بیر لە دروستكردنی خواردنێك بكەینەوە. خواردنێ، مەرج نییە خۆراكەكانی لە وڵاتی خۆماندا وەبەرهاتبن، بەڵام گرنگە شوێندەستی ئێمەی پێوەدیار بێ و تامی مەتبەخی میواندۆستانەی ئێمە بدات.

کەواتە لەماڵ بچۆرە دەرەوە و تا سەر سووچی کۆلانەکەتان بڕۆ کیسەیەك ماکەرۆنی، هەرجۆرێ بێت، بکڕە. ماکەرۆنی لە بنەمادا خواردنێکی ئیتالییە و ئەمڕۆ لە جیهاندا ناسراوە. بەتایبەتی لە دنیای پەنابەراندا زۆر بەکار دەهێنرێ و ڕەنگە یەکەمین خواردن کە پەنابەر فێری لێنانی دەبێت، ماکەرۆنی بێت. کاتێ تاکو ئاستی پێویست لەناو ئاو و دووسێ دڵۆپ ڕۆندا، کولاندت، لە سووزگی بدە با ئاوەکەی بچۆڕێتەوە. ئەگەر زانیت زۆر کولاوە، دەتوانیت ڕشێنێ ئاوی ساردی پێدا بکەیت بۆئەوەی پرۆسەی کولانەکە ڕابگرێ. لەهەمان کاتدا نزیکەی سێسەد گرام گوڵە قەرنابیتی سەوزت نیوە کولاو کردبێ و تەماتەیەك، کولەکەیەك، پەتاتەیەك و پیازێکت ورد جنیبێ و لەگەڵ هەندێ سەوزەی وشك و قارچکی جنراو، تێکەڵیان بکە و لێگەڕێ ئەوانیش کەمێ بە هەڵمی خۆیان نیوەپیشاو بن.. دەمەوێ خواردنی بەنابەران هەم تامی کۆی خواردنەکانی دیکە بدات و هەم ڕەنگدانەوەی جیهانی ڕەنگاوڕەنگی ئەوانیش بێت.. لە ڕاستیدا نامەوێ دەستنیشانی ئەو داوودەرمانانەت بۆ بکەم کە لەم خواردنەی دەکەیت، بەڵام لەگەڵ خوێ، یەکدوو بیبەری وردی تیژ، تامێکی نایاب و ئیشتیهاکەرەوەی دەداتێ.

ئێستا قاپێك بهێنە کە بەرگەی گەرمی بگرێ: هەوڵدە نیوەی وردەجنراوی تەماتە و کولەکە و پیاز و پەتاتە و سەوزە و قارچکەکە، بکەرە بنکی قاپەکەوە و بەسەرئەویشدا ماکەرۆنییەکەی تێبکە، کە هێشتا هالاوی لێهەڵدەستێ. نابێت هیچ گوشاری بخەیتە سەر و تێکەڵهەڵدانیشی ناوێ. پاشان نیوەکەی تری تێکەڵەکەی بەسەردا بکە و لێیگەڕێ با بۆخۆی لەسەر یەك بنیشێ.

لەملاوە قاپێك بهێنە، دوو کەوچك دۆشاوی تەماتە، کەمێ ئاو لیمۆ، کەمێ بەهارات، بیبەری سوور، یان ڕەش، نیوەی تۆزی سووپی سەوزەوات، کەوچکێ ڕووبی هەنار، دوو سێ کەوچکی چێشت ڕۆنی زەیتوون و پەرداخ ونیوێ ئاوی کوڵهاتووی تێبکە و بەجوانی تێکەڵیان بکە. (بۆت هەیە لە هەڵبژاردن و بەکارهێنانی ئەو شتانەی ناوم هێنان، ئازاد بیت..). دەتوانیت پێکیشەوە قووڵپێکیان پێبدەیت. تا ئەوانە تۆزێ پێکەوە

دەکوڵێن، تۆ گوڵـە قەرنابیتـەکان لـە قـاپی ماکەرۆنییەکـەدا دابنـێ و پاشـان تامـاوە کوڵهاتووەکەی بکە بەسەردا. سەری قاپەکە بنێرەوە و بیخەرە ناو تەباخەکەوە، یاخود ئاگرێکی کزکزی لەژێردا بکـەرەوە و لێیگـەڕێ بـا لـەگـەڵ دەمکێشـاندا، تاماوەکـە بچێژێ. پاش دە خوولـەك، خواردن ئامادەیە و دەتوانیت لـەگەڵ سـەموون و زەڵاتـە و زەیتوون و ترشیات نۆشی گیانی بکەیت.

**حەکایەتی ئەستێرەناسە دانمارکی و بازرگانە ئیتالییەکە:**

لـەسەردەمی عوسمانلیدا، کاتێ بازرگانـە ئیتالییـەکان ڕێگـەیان بـەرەو خۆرهـەڵات و شاری ئەستەمبووڵ کرایەوە، دایکیان چەند کیسەیەك ماکـەرۆنی و سـپایگێتی بـۆ لـە سندووقەکانیان دەهاویشت، بەو نیازەی لە تەنگانـەدا فریایـان کـەوێ و لـە برسـێتی ڕزگاریان بکات. دانمارکییەکانیش هـەتا ئێسـتاش، کاتـێ دەچـن بـۆ دەرەوەی وڵات، چەند دەستەیەك نانی ڕەش، نانی جۆ، لـەگەڵ خۆیان دەبـەن. بڕوایـان وایـە ئـەو نانـە ئارامی و هاوسەنگی ناوسکی ئەوان ڕادەگرێ و لـەهەندێ تەنگانەی وەکو سکچـوون دەیانپارێزێ. بەڵام ئەوان خاوەن یادوەرییەکی ناخۆشیشیشـن و لـە ئـەزموونی زانـای ئەستێرەناس (تۆکیۆبراه)ـەوە تۆقیـون. تۆکیـۆبراه ئەستێرەناسـێکی دانمـارکی بـووە و لـەسەر بانگهێشتنی پادشای ئیتالیا داوەتـی ئـەو وڵاتـە دەکـرێ تـاکو لـە مەراسـیمی بەکارهێنانی یەکەمجاری تەلـەسکۆپدا، بەشدار بێت. لـەوە دەچێ لـەسەر سفرەی پادشـا زۆری خواردبێ و تەنگاویش بووبێ، بەڵام لـەبەر ڕێزی گوێگرتن لـە وتـاری پادشـا و مەجلیسەکە، ددان بەخۆیدا دەگرێ و ناچێت دەستبەئاو بگەیەنێ. وەختـێ پادشـا لـە خوێندنەوەی وتارەکەی دەبێتەوە و فەرمووی زانا دەکات بۆ کردنەوەی مەراسیمەکە، تەماشا دەکەن لـە حەژمەت و ئـەنجامی دانبەخۆداگرتنـەوە، ئەسـتێرەناس لـە حـەوت ساڵان ڕاستبۆتەوە و ڕیخۆڵـەکانی تەقیون!

بەسەرهاتی بازرگانە ئیتالییەکە زۆر لەمە جیاوازە: حەکایەتەکە باسی یەکێ لەو بازرگانانە دەکات، کە بەبێ مۆڵەت ماوەیەك هاتۆتە قەڵەمرەوی عوسمانلییەوە و لە گەڕەکێکی تەنگەبەری ئەستەمبوولدا، دڵی خۆی لە گرۆی کچێکی چاومەستی توورکئەسمەر ناوە و هێندەی نەماوە عەبای ڤینیسیایی فرێدات و فێسی توورکی بکاتە سەر.. وەلێ گوێ قوولاخکەر و جاسووس و گوزارشگەران بەمەی دەزانن و دروست لەو مانگەشەوەدا، کە ئەو بۆ چەندەمینجار خەریکی لێنانی ماکەرۆنییە بۆ خۆشەویستەکەی، جەندرمە و هەواڵگر، زرمبەی لە دەرگای هەڵدەستێنن و بە باڵبەستوویی و بەبێ ئەوەی مۆڵەتی بدەن کەوشە قەیتاندارەکانیشی لەپێکات، دەیبەن. کاتێ کیژە دەگاتە شوێن وادەی خۆی، دەبینێ دەرگا لەسەر پشتە، قابلەمە لەسەر ئاگر داندراوە و شەراب لەوێندەرێ کراوەتە دۆلکەی دارینەوە و پێڵاوەکانی بازرگان لەوێدان و کەچی بۆخۆی دیار نییە. کیژە کە ئەو دیمەنەی دەبینێ، هەم دڵی بۆخۆی و هەم بۆ ئەو بازرگانە کاکۆڵ لوولەی پەنای بۆ وڵاتەکەی ئەو هێنابوو، گەرمدەبێ و بڕیار دەدات بەدەم چاوەڕوانییەوە، خواردنەکە دروستبکات. لەگەڵ ئەوەدا کە ماکەرۆنییەکە تێکەڵهەڵدەدات، جاروبار فرمێسکێکی کیژە دەکەوێتە قابلەمەکەوە و لەگەڵ هاڵاوی ماکەرۆنییەکەدا، لە پەنجەرەیڕا و بە ناو کۆڵانی تەنگەبەری شاردا، بۆن و بەرامەکەی دەگاتە سەرای سوڵتان. سوڵتان داوا دەکات، ئەو کابانەی بۆ بهێنن کە خواردنێکی وەهای دروستکردووە، بۆنەکەی ئەوی لە زیکری خودا خافڵکردووە! کیژەی بەخۆی و قابلەمەکەیەوە دەهێننە بەردەمی سوڵتان و ئەویش بەکاوەخۆ و لەگەڵ بارینی ئەسرینەکانیدا، بەسەرهاتی خۆی و کوڕە بازرگانی لەبۆ دەسەڵاتداری وڵاتێ، دەگێڕێتەوە. سوڵتان ئەوەندە مەستی ئەو حەکایەتەی دەبێ، بڕیار دەدات بازرگانەی لە گرتووخانەی ئازاد بکات و کیژەی لە سەرای خۆیدا بکاتە سەرتەباخ. دەڵێن لەوکاتەوە ماکەرۆنی و سپایگێتی بە دنیایدا بڵاوبوونەوە و تەنانەت ئەو قابلەمەیەش کە کیژە و کوڕەبازرگان، خاوەنماڵ و پەنابەر، پێشوازیکەر و میوان، خواردنیان تێدا لێدەنا، ماوەیەك لەلای مسگەرەکان دەستاودەست دەکات و دواجار

لە یەکێ لە مۆزەخانەکانی ئیتالیادا، پارێزراوە.. حەکایەتەکە ئەوەش زیاد دەکات و دەڵێ: هۆی زۆری بەرهەمهێنانی ماکەرۆنی و سپایگێتی لە ئیتالیا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قابلەمەیە کە بەردەوام وەك کانییەکی بەخوورٍ و سیحراوی، ماکەرۆنی و سپایگێتی لێوە دێتە دەرەوە..

# خواردنیی ڕێنماییکەر

لە فەنتازیای خواردندا، هەروەکچۆن لە فەلسەفەی ژیانـدا، بـەبێ ئاوڕدانـەوە لـە ڕۆڵی ڕێنمایی و ڕێنماییکەر، خواردنەکانمان پیادەسووتێن و ژیانەکەشمان دەشێوێ. ئەو کەسـەی خـۆی هەڵدەپاچـێ و بەروانکـە دەبەسـتێ بـۆ ئـەوەی خواردنێکمـان بـۆ دروستبکات، لـەگەڵ ئەو کەسەی ژیانێـك ژیـاوە و ئەزموونگـەلێکی کۆکردۆتـەوە، پێویستە قەدری ئەو ڕێنماییکەرانە بە زیندوویی ڕابگرێ کە نەیانهێشتووە چێشـتەکەی پیابسووتێ و ژیانەکەی لێبشێوێ..

(ڕێنماییکەر) بەکەسێ دەڵێن کە ئاراستە و ڕێنماییمان دەکـات، ڕێنمـایی هەڵبـژاردنی ڕێگای ڕاست و ئاراستەکردنمان بەرەو ئامانج و مەبەستی خۆمان. لە ئایین و کەلتوورە کۆنەکاندا ڕێنماییکەر، چ مرۆڤ بێت لـە شێوەی پێغەمبەرانـدا، یـان باڵنـدە و ئـاژەڵ و نیشانەکان، بوونەوەرێکە جێگەی متمانە. ئەوەی شارەزا نییە و نازانێ بـەرەو کـاملا و کوێ بڕوات، ئەوەی هێشتا بەتەواوی دنیا و خـۆی و دەوروبـەری ناناسـێ و چـاوی نەکراوەتەوە، پەنا بۆ ڕێنماییکەر دەبات، یاخود چاو لـە ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی ئەو دەکات. بەڵام مەرج نییە هەمیشە ڕێنماییکەر قازانج و بەرژەوەندی ئێمەی بوێ، بـۆی هەیە ڕێنماییکەر بیەوێ بە هەڵەماندا بەرێ و بۆی هەیە بیەوێ ڕێگامان لێئاڵۆز بکات و سەرمان لێتێکبدات. کاتێ قابیـل، هـابیلی بـرای دەکـوژێ، چـەندین ڕۆژ تـەرمی براکەی بە کۆڵەوەیە، چونکە نازانـێ چـیی لێبکـات، چـونکە ڕێنماییکـەرێکی نییـە. حەزرەتی (نووح) بۆ ئەوەی بزانێ لـە کوێدا وشکانی هەیـە، پێویسـتی بـە ڕێنماییکـەر

هەیە. حەکایەت و ئەفسانەکان پڕن لە ڕێنماییکەری باش و خراپ، هەندێکیان یارمەتی کوڕەی عاشق دەدەن تاکو لە بورجی قەڵادا، شازادەخانمی دزراو بدۆزێتەوە و بیباتەوە بۆ ماڵی پادشا، هەندێکیشیان تەسلیمی قسەی ڕێنماییکەری خراپ دەبن و ڕێگایان لێتێکدەچێ و هەندێکیشیان لەسەر قسەی ڕێنماییکەر کۆتایی بە ژیانی خۆیان دەهێنن: فەرهاد لە پێناوی شیریندا و مەم لە عەوداڵیی زیندا..!

لە دنیای مۆدێرندا، ڕێنماییکەران زۆرن، هەر لە فاڵگرەوە و قاوەگرەوەکانەوە، تا ئەوانەی جنۆکە لەسەر و لەشماندا دەردەکەن، بە تێپەڕین بە پاراسایکۆلۆژیست و یۆگی و تەرویجکارەکانی حیزب و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و فەیلەسووف و حەکیم و هاوڕێکانماندا.. وەلێ من لەم زنجیرەیەدا دەمەوێ هەندێ بیرۆکەی خۆم سەبارەت بە دیارترین ڕێنماییکەری مۆدێرنیتە، واتە مرووروەکان، بخەمە ڕوو. ئەرێ بەڕاست ئەگەر لە دنیای مۆدێرندا مروور وەك ڕێنمایکەرێ ئامادەیی نەدەبوو، چلۆن ژیانمان بەسەر دەبرد؟ ئەمە پرسیارێکە، کاتێ لە وەڵامدانەوەی نزیکدەبینەوە، کە لە دنیای کلاسیکەوە بەسەرهاتێ باس بکەین، کە پێماندەڵێ ئەگەر لەودەمەدا مروور هەبایە، گەورەترین تراژیدیای مرۆیی ڕووی نەدەدا.. بەداخەوە، یەزدان ئاسمان و زەوی و ڕووناکی و تاریکی خوڵقاند، ڕووناکی ناونا ڕۆژ و تاریکایی ناونا شەو، بەلام لەبیری چوو لەگەڵ موباحکردنی زاوزێی مرۆیەکاندا، مروووریش خەڵق بکات، چونکە دەبوو بزانێ لە هەر شوێنێ ڕێگاکان دەبنە دوو ڕێ و لەهەر ماڵێکدا حەشامات دروستبوو، پێویستیمان بە ڕێنماییکەر هەیە. تکایە بە وردی گوێ لەم بەسەرهاتە بگرە.

**بەسەرهاتی (ئۆدیب پاشا):**

یەکێ لە خاڵە گرنگەکانی نووسینی سۆفۆکلیس، گەورە تراژیدینووسی یۆنانی کۆن، ئەوەیە کە مرۆڤ لە ئاست چارەنووس و قەدەری خۆیدا، هیچ چارەیەکی نییە و ئامانجی ژیان هەر لەسەرەتاوە دیارە. سەبارەت بە ئۆدیبی پادشا، ئەم چارەنووسە لەپێش هاتنە دنیاو لەدایکبوونییەوە دەستنیشانکراوە: غەیبگۆی پەرستگای (دولفی)

خەبەر لەبۆ دایك و بابی ئۆدیبی دەهێنێ، کە: (سەروەرانم، منداڵێکتان دەبێ و ڕۆژگارێ دێ ئەو منداڵە سەری باوکی خۆی دەپەڕێنێ و دایکی خۆی مارە دەکاتەوە!). گوناه و تاوانێکی مەزن بەڕێگاوەیە و نابێ پادشا هەلوفرسەتێ لەدەستبدات. بۆیە پێبەجەرگی خۆدا دەنێن و لە پێناوی بەرگریکردن لە ڕوونەدانی گوناه و تاوان، بڕیار دەدەن هەر کە منداڵە هاتە دنیاوە، بیسپێرنە شوانان تاکو لە قەڵەمڕەوی پاشایەتی وەدەری نێن و لەوێندەرێ بیکوژن، یانژی بەرەڵڵای بکەن، باش لەبیرم نییە.. بەهەرحاڵ، ئەمە یەکەمین هەوڵدانی مرۆڤە بۆ گۆڕینی قەدەری ئاسمانی ئۆدیب. ئەوان دەیانەوێ بەلاّ و گوناهی لەخۆیان دوور بخەنەوە، لەکاتێکدا چارەنووس و قەدەر بڕیاریداوە ئۆدیب عەوداڵی قەدەر و چارەنووسی تراژیدیانەی خۆی بێت.. شوانەکان کۆرپەلەی دەبەن و هۆ لەو چیاو دۆڵانە دەیسپێرنە شوانی قەڵەمڕەوی پادشایەك، کە منداڵی نییە و هەتائێستێ وەچاغکوێرە. ئەمە دووەمین دەستێوەردانە بۆ گۆڕینی چارەنووسی ئۆدیب و ڕزگارکردنی. وەلێ چارەنووس بەدوای خۆ تەحقیقکردندا وێڵە: ئۆدیب بۆتە قارەمان و لە هیچ ناترسێ، ڕووبەڕووی ئەژدیهای حەوت سەر دەبێتەوە و ئەژدیها مەتەڵێکی لێدادەهێنێ، کە بە دیوێکدا، باس لە ئۆدیب خۆیدەکات: ئەوە چییە بەیانیان لەسەر چوار پێیان و نیوەڕوان لەسەر دووان و ئێوارانیش لەسەر سێ پێیان دەڕوات؟ ئەمە سێیەمین هەوڵدانە بۆ بەرگریکردن لە ڕوونەدانی چارەنووس، وەلێ چارەنووس لەڕێگەی ئۆدیبەوە بەردەوامە لە سەفەری وەدیهاتنی خۆی. وەلاّمەکە لەسەر زاری ئۆدیبەوە ئەمەیە: (مرۆڤ: لە منداڵیدا لەسەر دوو دەست و دوو پێ، لە تەمەنی لاوێتی و هەڵکشانی تەمەنیدا کە بڕوابەخۆبوونی زیاد دەبێ تەنیا لەسەر قاچەکانی خۆی ڕادەوەستێ و لە پیریشدا، وێڕای پێیەکانی گۆپاڵێکیش بە دەستەوە دەگرێ). ئەژدیها تەسلیم دەبێ و قارەمان هەنگاوێکی دیکەش لە گوناه و تاوانە چارەنووسسازەکەی نزیکدەکەوێتەوە: دروست لەوکاتەیدا کە پاسەوانان و پادشا لە ڕاوێ دەگەڕێنەوە، ئۆدیبیش دەگاتە هەمان سێ ڕێیان: ڕێگایەك بەرەو لای ڕاست، یەکێ بەرەو لای چەپ و ئەویتریش ڕاستە ڕێ. پرسیار

ئەوەیە کامیان دەپێشدا بپەڕنەوە؟ پادشا و دەستوپێوەندەکانی بڕۆن و قارەمان چاوەڕێ بێت، یاخود لە پێشدا قارەمان بڕوات و کاروانی پادشای ڕاوەستێن؟ هیچیان مل بۆ ئەویتر نادەن، شمشێر ڕادەکێشرێن، سوپا و قەراوڵ و دەستوپێوەند شەڕ لەسەر پادشای خۆیان دەکەن، پاڵەوانیش شەڕکەری چارەنووسی خۆیەتی. قەدەر دەیباتەوە: دەستوپێوەند یەك یەك دەکوژرێن، سەری پادشای دەپەڕێنرێ، پاشماوەیەك ئۆدیب بەرەو شاری (تیبە) دەڕوات و لە ڕۆژی (باز) هەڵدانێدا، باز لەسەر شانی وی دەنیشێتەوە! ئۆدیب دەبێتە پادشا و بەپێی نەریتی ئەودەم، ماڵ و سامانی پادشای مردوو، دەبێتە هی ئەو. شاژن دەبێتە هاوسەری پادشای تازە و وڵات لە تەنگژەی بێپادشایی ڕزگار دەبێ. وەچەی نوێ و کۆن دەبنە خوشك و برا، وڵات هەست بە دڵنیایی دەکا و شاژنیش بە ئارامی. وەلێ شار وردە وردە لە بەڵای تاعوونێوە دەگلێ و مەرگ سێبەر بەسەر ژیانێدا دەکات. غەیبگۆ دەچنە پەرستگا و کە دێنەوە پەست و ڕوو گرژ: ئەو پادشایەی لەسەر سێڕیانێ کوژراوە، (شا مینۆس)ی باوکی ئۆدیبی بووە، (جۆکاستەخان)، کە ئێستێ ژنی ئۆدیبی پادشایە، لە هەسڵدا دایکی خۆیەتی و منداڵەکانیش..، ئێوەبڵێن.. گوناه و تاوان ڕوویدا، وەلێ هێشتا چارەنووس بەکامی خۆی نەگەیشتووە، ئۆدیب بەدەستی خۆی چاوەکانی هەڵدەکۆڵێ و بەرەو ئەشکەوتی تەنیایی دەڕوات، لەوێدایە قۆناغی پیریی و گۆچان بەدەستی دەستپێدەکات و قەدەر بەکام دەگات.. ئۆدیب دەچێتەوە ناو تاریکایی، ئەوەی قەدەر بۆیدەستنیشان کردبوو..

**مروور وەك ڕێنمایکەری دنیای مۆدێرن:**

مروور وەك پیشە، کە ئێمە (پۆلیسی هاتووچۆ)یشی پێدەڵێین و ڕاستتر بوو پێمانگوتبا: (پۆلیسی ڕێنما، ڕێنماییکەر)، دیاردە و پیشەیەکی مۆدێرنە و سەرهەڵدانیشی بە پلەی یەکەم پەیوەستە بەو گۆڕانە گەورەیەوە لە بواری هۆکارەکانی هاتوچۆکردندا، کە لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازی لە ئەورووپادا هاتنە ئاراوە و لەوێدا بۆیەکەمجار هێزی بەگەڕخەری هۆیەکانی گواستنەوە، لە هێزی (با) و (پاڵەپەستۆی هەڵم) و (بازوو)ی

مرۆڤ و ئاژەڵەوە، گۆڕا بۆ هێزی (مەکینە). بێگومان وەك (پۆڵ ڤیریلیۆ)ش دەنووسێ: لەو گۆڕانەدا نابێت ڕۆڵی جەنگەکان و ئەو خێراییەمان بیر بچێ کە جەنگ پێویستی پێیەتی. بەپلەی دووەمیش سەرهەڵدانی ئەم ڕێنماییکەرە مۆدێرنە پەیوەستە بە قەرەباڵغی شاری مۆدێرنەوە، کە بێگومان لەسەر ئاستی (کات)، پێویستی بە ڕێکخستنەوەی بەردەوام و لەسەر ئاستی (شوێن)یش پێویستی بە دابەشکردنی بەردەوامی شوێن هەیە لەنێوان ئەو کەسانەی بۆ هەمیشە، یان بەکاتی لە شوێنێکدا کۆدەبنەوە. بەمجۆرەش کات لە دنیای مۆدێرندا، نەك کاتێکی سرووشتی نییە، بەڵکو کاتێکە دەبێ (ڕێکیبخەین) و (بیدۆزینەوە) و (دروستیبکەین)، بەهەمان شێوەش شوێن، جێگەیەکی سەقامگرتوو نییە بۆ هەمیشە لەوێدا بێت، بەڵکو شوێن لە دنیای مۆدێرندا بەردەوام (دابەشکراوە)، (دەستنیشانکراوە) و (ڕێژەییە) و ئەوەی ئەمڕۆ و لەم ساتەدا شوێنی ئێمەیە، لە سات و ڕۆژێکی دیکەدا بۆتە شوێنی کەسانێکی دیکە. پیشەی مرووڕەکان، لەسەر ئەم ڕێکخستنی کات و دابەشکردنی شوێنەوە دروستبووە بۆ ئەوەی ئێمەی ڕێبوار و نۆماد و کۆچەر، هەموومان کاتی خۆمانمان بەرکەوێ و هەمووشمان هەستبکەین شوێنی خۆمانمان هەیە، بە بێئەوەی ئەو کاتە وەستاو و ئەو شوێنە نەگۆڕ بێت، دەنا ناتوانین (هات) و (چۆ) بکەین و لە شوێن و کاتی نەگۆڕی خۆماندا دەوەستین. بەمجۆرەش، مرووڕەکان ڕێنماییمان دەکەن بۆ ئەوەی هەموو (هاتن)ەکانمان بە (چوون) کۆتاییان بێت و ئێمە بەردەوام بتوانین هاتوچۆ بکەین و نەوەستین.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕۆڵە گرنگەی ئەم ڕێنماییکەرە لە دنیای مۆدێرندا هەیەتی، با بیر لەوە بکەینەوە و پرسیار بکەین: ئەگەر لەسەر سێ ڕیانەکەی، کە ئۆدیب و باوکی پێکگەیشتن، تەنیا یەك مرووری لێدەبوو، ئاخۆ چۆن ئاراستەی بوون و دنیای مرۆیی دەگۆڕا و ئەو ڕێنماییکەرە دەبووە هۆی ئەوەی ئەو گوناه و تاوانە ڕوونەدات و هیچ شتێ تەسلیمی قەدەری خۆی نەبێ؟ تەنیا مرووڕێ بەس بوو، بۆ ئەوەی هەم لەشکری پادشا و هەم غرووری پاڵەوان لە لوتبەرزی خۆیان پەشیوانکاتەوە و سنووڕێکیان بۆ

دابنێ و بەپێی ڕێنماییەکانی (هاتوچۆ) ڕێگەیان بدات، کامیان سەرەتا بڕوات و کامیان دواتر. ڕەنگە هەر ئەمەش، واتە هەبوونی ڕێنماییکەران لەسەر ڕێگاکان، جیاوازیی هەرە گرنگی نێوان دنیای ئێمە و دنیای کلاسیکی سۆفۆکلیسی بێت، دەنا لەو بڕوایەدام لە ڕۆژگاری ئێمەشدا خەڵکانێکی زۆر هەن، نەك بۆ تەحقیقکردنی قەدەری خۆیان، بەڵکو بۆ سەپاندنی میزاجی شەخسی و غەریزەی خۆیان، ئامادەن ڕۆژانە لەسەر شەقام و ڕێگاکان بە عەقڵییەتی پاڵەوانانەی ئۆدیب و غرووری سووپای پادشاکانەوە، ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە و خۆیان و ئێمەش لەپێناوی خێرایی و ڕۆحی کێبڕکێی خۆیاندا، لە خوێندا بگەوزێنن.

**ئاماژەکانی ڕێنماییکەر:**

مروور، وەك ڕێنماییکەرێکی مۆدێرن، لە ڕێگەی دووجۆر ئاماژەوە ڕێنماییمان دەکات: ئاماژەکانی دەستی و ئەو ئاماژانەی درێژکراوەی دەستی ئەون، بۆ نمونە: تابلۆ و ئایکۆن و نیشانەکانی سەر جادە و ڕێگاوبان. دەستی مروور و جووڵەکانی مانا بەخشن، دەست لە پیشەی ڕێنماییکەردا زمانێکی تایبەتە، کە ئەگەر بەهەڵە بەکار هات، ئاژاوە دروستدەبێت و ئەگەریش بەهەڵە تێبگەیشتین، سەرپێچی و کارەسات چاوەڕوانیمان دەکات. دەتوانین ئاماژەکانی دەستی مروور ناوبنێین زمانی ڕاستەقینە و تابلۆ و نیشانەکانی سەر جادەش ناو بنێین زمانی مەجاز. ڕەنگە مرووڕەکان ئەو مرۆڤانەبن کە سوێندیان خواردووە هەرگیز دەستی خۆیان بەهەڵە بەکار نەهێنن، واتە هەرگیز بێمانایانە ئاماژە بەدەستیان نەکەن، چونکە ئەوکاتە ئێمەی ڕێبواران و شۆفێرەکان بەهەڵە تەئویلی ئاماژەکانیان دەکەین و بەهەڵەلێکحاڵیبوون ڕوودەدات. ئاماژەکانی دەستی مروور، هیچ نین لە نیشاندانی ئاراستەی گەیشتن بە شوێنی مەبەست و لە دڵنیاکردنەوەمان لەوەی کە دەتوانین بە سەلامەتی بگەین. ئامانجی ئێمە لە هاتوچۆ و سەفەر چییە، ئەگەر گەیشتن بە شوێنی مەبەست نەبێ؟ بەلام چۆنێتی گەیشتن بە شوێنی مەبەست بریتیە لە سەلامەتی. بەمجۆرەش یەکەم ئاماژەی مرووڕەکان

ئەوەیە کە پێمان بڵێن: بەم ئاراستەیەدا و لەم کاتەدا و بەو خێراییە بڕۆیت، سەلامەتی لە چاوەڕوانیتدایە. ئەو، وەکو سیمایەکی مۆدێرنیتە بیرماندەخاتەوە، ئەزموونکردنی ژیان لەناو ماشێن و ئۆتۆمبیلدا، خۆدانە دەست خێرایی و ڕیسك و مەترسیکردن و موغامەرەیە، وەلێ ئەم ئەزموونکردنەی ژیان بەدەریش نییە لە دڵنیاکردنەوە و متمانەکردن، ئەگەر ڕەچاوی ڕێنماییە عەقڵانییەکانمان کرد. مۆدێرنیتە ئەزموونکردنی ناچاریانەی ژیانە لەناو خێرایی و تیژڕەویدا کە دەتوانین بەهۆی ڕێنماییە عەقڵانییەکانەوە جڵەوی بکەین، نەك بەهۆی میزاجی شەخسییەوە. میزاجی شەخسی بیرکردنەوەیەکی هەرزەییانەیە، بۆیە کانت پێشمەرجی ڕۆشنگەری بەوە ناو دەبرد: پێویستە مرۆڤ خۆی لەو هەرزەییە ڕزگار بکات کە بەهۆی بەکار نەهێنانی عەقڵەوە دووچاری بووە. مروور ئەو زمان و نوێنەرەی مۆدێرنیتەیە کە بیرماندەخاتەوە، ئامانجێك و کۆتاییەك لەم سەفەرەدا هەیە، بەڵام تەنیا بەهۆی ڕەچاوکردنی ئاماژەکانەوە بەسەلامەتی دەگەیتە ئەو کۆتایی و ئامانجە.

**خێراییت کەمکەرەوە!**

(خێرایی) سرووشتی دنیای مۆدێرن و یەکێ لە کێشەکانی مۆدێرنیتەیە. هەروەکچۆن مرۆڤ ناتوانێ خۆی لە فەرمانی غەریزەکانی ڕزگار بکات، ئاواش مۆدێرنیتە ناتوانێ خۆی لە خێرایی جیابکاتەوە. عەقڵانییەت لە زۆر ڕووەوە سیما جوانەکەی مۆدێرنیتە و خێرایی سیما ترسناکەکەیەتی!. خێرایی پەیوەستە بە کۆنترۆڵنەکردن و سنووربەزاندن و متمانەکردنی تەواوی مرۆڤ بە مەکینە و ماشێنەکان. بەڵام ئەزموونی مۆدێرنیتە ئەوەش دەردەخا، لە هەر شوێنێ خێرایی زیادیکرد و کۆنترۆڵ نەکرا، توندوتیژی و زیانلێکەوتن و مەترسی زیاد دەکەن و حیکمەتی پرسوڕا، لەگەڵ ئەوانیتربوون، ڕاوێژکردن و هەستکردن بە جیهانی دەوروبەر، کەمدەبێتەوە و لە ئەنجامی ئەمەشەوە، دیاردەگەلی وەك تەنیایی، مالیخولیا و سەرگەردانی برەو دەستێنن.

ڕێنماییکەری مۆدێرن بەبیرماندەخاتەوە، کە خێرایی کوشندەیە، مەرگ دوائەنجامی خێراییە، بەڵام مەرگ ئامانجی ژیانی مرۆڤی مۆدێرن نییە. مرۆڤی مۆدێرن دەیەوێ لە ژیان بەردەوامبێ و زۆریش بیر لە مردن نەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤێکی خێرایە. بۆیە ڕێنماییکەر خێرایی ئێمە دەستنیشان و کۆنترۆڵ دەکات: بۆت نییە لەم شەقەمادا لەوەندە زیاتر بهاژووی، (خێراییت کەمکەرەوە، مەترسی لەڕێدایە.)! بەمجۆرەش ژیانی مۆدێرن چەندە غەریزە و حەزە تایبەتیەکان ئازاد دەکات و چەپاندنیان لەسەر ناهێڵێ، ئەوەندەش چەپاندن لەسەر ئەو بارودۆخە تایبەتیانە دروستدەکات کە لە پانتایی ژیانی هاوبەشدا بەئەنجام دەگەیەنرێن. مۆدێرنیتە ئازادمان دەکات لە ژوورە تایبەتییەکەی خۆماندا، چۆن ڕەفتار دەکەین و غەریزەکانمان بەتاڵدەکەینەوە، وەلێ ڕێگەمان پێنادات لە ژوورە گەڕۆکە تایبەتیەکەماندا (واتە لە ئۆتۆمبێلەکەماندا) بە ئارەزووی خۆمان ڕەفتار بنوێنین. لێرەدا عەقڵانییەت سنوور بۆ غەریزە دادەنێ و غەریزە لەلایەن عەقڵانییەتەوە بە ئاماژەدان بۆ ژیانی هاوبەش، کۆنترۆڵ دەکرێ. پێویستە مروور ڕێزی ئەوەمان لێبگرێ کە ئێمە لەناو ئۆتۆمبیلەکانی خۆماندا، لەناو سنووری ژیانی تایبەتی خۆماندایین، وەلێ پێویستە ئێمەش لەوە تێبگەین: با ئێمە لەناو ماڵی گەڕۆك و سنووری ژیانی تایبەتی خۆماندابین، بەڵام لە (شوێن)ی تایبەت بەخۆماندا نین. شەقامەکان وڵاتی سەفەری ئەو ڕێوارانەن کە بەپێی ڕێنماییەکان بەسەریاندا دەڕۆن و دەهاژوون، ئەوانەی گوێ بە ئاماژەکان نادەن ناتوانن بگەنە کۆتایی سەفەرەکەیان و بەسەلامەتیش ناگەن..

کەواتە دەتوانین بپرسین: چییە ئەو بەهایەی وادەکات مروورەکان لەسەر جادە و شەقامەکان، لەو قرچەی گەرما و سەرمای زستانانەدا، بەو دەوامە زۆر و مووچە کەمەیانەوە، بەو هەموو گووشارەی شۆفێری وەزیر و مەسئولەکان و بەدمەستەکان دەیخەنە سەریان، بەردەوام بە پێوە بن و بەدەست ئاماژەمان بۆ بکەن، تا کامڕان یەکەمجار بڕۆین و کێ لە دواییدا؟ ئایا مروورەکان نایانەوێ جارێکی دیکە شەڕی نێوان ئۆدیب و لەشکری پادشا ڕووبداتەوە؟

بەبڕوای من، mroor وەك ڕێنماییکەرێك لە ژیانی مۆدێرندا، بزانێت یان نا، بەپلەی یەکەم ئەرکی ئەوەیە (شوێن)مان بەسەرا دابەش بکات و پێمان بڵێ هیچ شوێنێ بەتەنیا و بۆ هەمیشە هی ئێمە نییە. مرووروەکان وەبیرخەرەوەی خاڵێکی جەوهەریانەی مۆدێرنیتەن: دابەشکردنی شوێن و ڕێژەییبوونی فەزای ژیان و هاژووشتن و سەفەر. ئەو کەسەی لەناو ئۆتۆمبێلەکەی خۆیدا وا بیر بکاتەوە، شەقامەکان تەنیا هی ئەون، مرۆڤێکە بە عەقڵییەتی سوپای پادشا و غرووری پاڵەوانانەوە، دەیەوێ تاوانێك بکات. ئاماژەکەر ئەو کەسەیە کە نابێ بهێڵێ تاوان ڕووبداتەوە، چونکە ئاماژەکانی ئەو ئاماژەن بە ئاراستەی گەیشتنە مەبەست و بەسەلامەتی گەیشتن.

**خواردنی تایبەت بە مرووروەکان:**

پیشەی وەستان لەسەر جادەکان و ڕێنماییکردن و کۆنترۆڵکردنی خێرایی، پیشەیەکی زۆر زەحمەتە. من هەموو جارێ لەم وەرزە گەرمەدا و لەناو ئۆتۆمبیلەکەمدا، کاتێ بەبەردەمی ڕێنماییکەرێکدا دەهاژووم، تەریقدەبمەوە. بیرمکردەوە: لە زنجیرەی فەنتازیای خواردندا دەتوانم پێشنیاری چ جۆرە خواردنێکی تایبەت بۆ ڕێنمایکەران و بەتایبەتی مرووروەکان بکەم؟ دوایی بیرم کەوتەوە: ئەوان بە زمانی ئاماژە و دەستەکانیان ڕێنمایمان دەکەن، هەر پێشنیارێ سەبارەت بەوەی دەستەکانیان بەشتێکی دیکەوە سەرقاڵ بکەین، جگە لە ئاماژەکردن بۆ شۆفێر و ڕێبوارەکان، بەمانای دروستکردنی ئاڵۆزی و پێکدادان دێت.. کەواتە باشترە ئەوان بە خواردنەوە سەرقاڵ نەکەین، وەلێ دوایی بڕیارمدا ناکرێ مرۆڤ لە زنجیرەیەکی ئاوادا، کە هەمووی باسکردن و ستاییشکردنی نیعمەتەکانی سرووشت و یەزدانە، دۆعکانی گیرا نەبێ. بۆیە لەجیاتی خواردن دروستکردن، دۆعام بۆ کردن و خەوم لێکەوت. لە خەونمدا بینیم:

یەکەم: حکومەتی هەرێمی کوردستان وەك یەکەم ئیدارەی سیاسی لە جیهاندا بڕیاری دابوو: دوو (میم) بۆ مرووروەکان دابینبکات: (میم)ی یەکەم پەیوەست بوو بە

(مووچەی زیاتر) بۆئەوەی مرووروەکان بتوانن وەك هەر بەندەخودایەکی دیکەی ئەم وڵاتە و لە کامە سەیرانگە و چێشتخانەدا بیانەوێ، ماڵ و منداڵی خۆیان بانگهێشت بکەن و چییان بوێ بیخۆن.. (میم)ی دووەمیش پەیوەندیی هەبوو بە بڕیاری کەمکردنەوەی (ماوەی وەستانی مرووروەکان) لەسەر شەقامەکان..

دووەم: بینیم مرووروەکان سەرووسەکوتیان ئەوەندە لەگەڵ شۆفێر و ڕێبوارەکان خۆش بوو، ئەوەندە بەڕێزەوە، کابرای سەرپێچیکەریان لە جۆری سەرپێچییەکەی تێدەگەیاند، شۆفێرەکان لە ڕیزدا وێستا بوون تاکو گوێ بۆ ڕێنماییەکانیان بگرن و بۆ یادگارییش بێت، مۆرێکی سەرپێچیکردن لە مۆڵەتەکانیان بدرێ!

سێیەم: لە خەونەکەمدا و لە ڤیستیڤاڵی ساڵانەی ڕێنماییکردنی هاووڵاتیاندا، گوێم لێبوو بەڕێوەبەری گشتی ڕێنماییکردن و هاتووچۆی کوردستان، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە، لە پشت مایکرۆفۆنەکەوە و لەبەردەم مەحشەرێ لە وەزیر و شۆفێر و ڕۆژنامەنووسدا هاواری دەکرد: (ئەمساڵ یەك تاقە سەرپێچیکردنیش لەم وڵاتەدا ڕووینەداوە، جگە لە سەرپێچیکردنی نووسەرێ، کە گوایە لەو کاتەدا لە چرای سووری داوە، کە سەرقاڵی فەنتازیا لێدان بووە بە خواردن دروستکردنەوە!). پاش ئەوەی کۆکەیەکی نەرمی لێپژا، بەپێکەنینەوە ئەوەشی زیادکردو گوتی: (کاتێ جامی سەیارەکەی پێدادەدەنەوە، ڕێنمایکەرەکەی ئێمە بە بۆنی ڕازیانە و مێخەك و تەماتەی خۆشەویستی، مەست دەبێ و مۆڵەتەکەی لێوەرناگرێ..).

هێشتا لەخەونەکەمدا بووم، کە گوێم لێبوو دانیشتوانی مەراسیمەکە دایانە هاڕەی تریقە و پێکەنین و قاقا لێدان. هەرئەوەندە فریاکەوتم، کە بیرمکردەوە با دۆعایەکی دیکەش بکەم: خودایە تاکو خەبەرم دەبێتەوە، یەکێ، تەنیا یەکێ لەو خەونانەم هاتبێتە دی و فەنتازیاکەم پیانەسووتابێ..

# خواردنیی منداڵانە

**(منداڵیی) و (منداڵانە)!**

هەندێ لە کۆمەڵگاکان و کەلتوورەکان باشتر و زووتر لە منداڵەکان تێدەگەن وەك لە هەندێکی تریان. ئێمە لە کۆمەڵگا و کەلتوورێکدایین کە منداڵیی خۆمان بەبەردەوامی بەکۆڵەوەیە بەبێئەوەی بتوانین منداڵانە بژین. باسی گۆڕانە جەستەییەکان ناکەم، کە بەهۆیانەوە دەنگمان گڕدەبێ و موو دەردەکەین و ئۆرگانەکانمان کەمێ گەشە دەکەن، بەڵکو باسی ئەو ڕۆحە منداڵانەیە دەکەم کە دەیەوێ گەشتی هەمەجۆر بە جیهاندا بکات و پرسیار بکات و سەما بکا و فێر ببێ.. ئەوەی ئێمە پیر و پەککەوتە دەکات، گڕبوونی دەنگ و کۆمانەوەی پشت و چاوی کزبوو نییە، بەڵکو نەبوونی ئەو ئازادی و سەربەستییەیە کە منداڵیی مرۆڤ لەڕێگەیەوە خۆی دەردەبڕێ.

زۆرجار کە مرۆڤێ دەبینی لەسەر شتێ کە ئەوە ناهێنێ زۆر خۆمانی بۆ نارەحەت بکەین، تووڕە دەبێ و ماندەگرێ، یەکسەر منداڵییەکانی ئەوت بیر دەکەونەوە کە پڕبوون لە دەستێوەردان و مانگرتن و توڕەیی. بۆیە منداڵی وەك غەریزەی ئیرۆس و خۆشەویستی بۆ ژیان وایە، ئەگەر بە ئاراستەی سرووشتیانەی خۆیدا نەڕۆیشت، هەڵدەگەڕێتەوە بۆ مەرگدۆستی و شەڕانگێزی. منداڵیی وەك نییەتی خودایەکی خێرخواز وەهایە بە جیهان، کە دەیەوێ لەڕێگەی پەیام و پەیامبەرەکانییەوە، چاکسازی لە هەلومەرجی گوزەرانی مرۆیەکاندا بکات، بەڵام مرۆیەکان خۆیان دەبنە ڕێگر لەبەردەم وەدیهاتنی ئەم نییەتەدا و لێرەشەوە و لە غیابی ئەو چاکەخوازییەدا،

جیهان پڕ دەبێ لە بەدبەختی. منداڵیی یاسایەکی نەگۆڕی هەیە: تەنیا لەوەدیهاتن و بەرجەستەبوونی تەواوی خۆیدا کامڵ دەبێ.. منداڵی واتە منداڵبوون و منداڵانە ژیان و منداڵانە مانەوە. هەر ڕێگر و دەستخستنەناوەوەی ئەم یاسایە بە تێکشکاندنی ڕۆحی منداڵانە تەواو دەبێ..

زۆرن ئەو مرۆڤانەی لەژیانیاندا بە زۆربەی خواست و ئاواتەکانیان گەیشتوون، بەڵام بەردەوام بەدوای شتێکی نادیاردا عەوداڵن.. ئەو شتە (منداڵیی) خۆیانە، چونکە ئەوان هەرگیز منداڵیی خۆیان بەتەواوەتی نەژیاون. ئەو مرۆڤەی منداڵیی خۆی نەژیابێ، دیارە (قۆناغی منداڵی) خۆی تێپەڕاندووە و لەدەستی دەرچووە، وەلێ هەرگیز شێوازی (منداڵانەژیان)ی لەکیس نەچووە و هەر ئەمەشە ئومێدێ دەخاتە دڵمانەوە بۆ ئەوەی لە ژیاندا بە تەواوی سەرگەردان نەبین. ژیان، وێڕای گشت کۆژانەکانی، هەمیشە دەرفەتێکی تێدایە بۆ منداڵبوونەوە، دەرفەتێك دەبێ بۆخۆمان بیڕەخسێنین.

دەمەوێ هەر لەسەرەتاوە ئەو ڕاستییەت بەبیر بهێنمەوە، کە دەڵێ: بە پێچەوانەی قۆناغەکانی (لاوێتی و هەرزەکاری و پیری)ییەوە، منداڵی قۆناغ نییە. مرۆڤ لە سووڕی ژیانی خۆیدا یەکجار بە (قۆناغی لاوێتی و هەرزەکاری و پیری)یدا تێپەڕ دەبێ، وەلێ بۆ هەمیشە دەتوانێ بەمنداڵیی بمێنێتەوە و بەمجۆرەش لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەندا، (منداڵیی گەنجانە) و (منداڵیی هەرزەکارانە) و (منداڵیی پیرانەمان) هەیە، بەڵام (منداڵیی منداڵانە) شتێکە بەبەردەوامی دەمێنێ و کۆتایی پێنایەت. بەمجۆرەش، ئەو کۆمەڵگایانەی منداڵیی وەك قۆناغێ لە تەمەندا لێکدەدەنەوە، کۆمەڵگای منداڵکوژ و مەترسیدارن، چونکە لەوێدا منداڵیی ماوەیەکی کورتی تەمەنی مرۆڤ دەگرێ و ئیدی بەسەر دەچێ و کۆتایی پێدەهێنرێ، لەکاتێکدا منداڵیی نەك هەر قۆناغێك نییە لە تەمەن، بەڵکو دۆخێکی بەردەوامی دەروونی و ڕۆحییە لای مرۆڤ.

مرۆڤ بەئاسانی دەست لە منداڵیی و ژیانی منداڵانەی خۆی هەڵناگرێ، لەگەڵ گۆڕانی قۆناغەکانی تەمەن و جێهێشتنی (قۆناغی منداڵی)، ئەو بەزۆر شێواز بەردەوامبووە بۆ ئەوەی لە ئاستە ڕۆحی و مەعنەویەکەیدا منداڵانە بژی.

لە دەوروبەری تەمەنی سێ ساڵانەوە، عەوداڵبوونی منداڵ بە دوای ناسینی جیهاندا بەشێوەیەکی جیدیتر دەست پێدەکات و لە دۆخی سەرسوورمان و تێبینیکردنەوە، دەکەوێتە دۆخی پرسیارکردن. پرسیار سەبارەت بە هەموو شتێ لە نێوان زەوی و ئاسماندا و لێرەشەوە بێماناترین شت شوێن بە مانادارترین و قووڵترین شت چۆڵدەکات!. سەرسوورمان و عەوداڵبوون هیچ سنووری ناناسێ و هیچ شتێ نیە خۆی لە دەسەڵاتی پرسیار رزگار بکات. هەر ئالێرەشدایە و لەم قۆناغەدا کە چالاکییە هونەرییەکانی وەکو گۆرانیگوتن، یاریکردن، سەما، وێنەکێشان، هەویرکاری و چالاکییە زەینییەکانی وەکو وریتە وریتکردن، لەبەرخۆوە قسەکردن و هەر جوڵەیەکی دیکەی جەستەیی و لاساییکردنەوە، بە چڕیی دەست پێدەکەن. ئەگەر منداڵ لەم قۆناغەدا نەچەپێنرێ و سەرکوت نەکرێ، بەڵکو رێنومایی بکرێ و پشتیوانی لێبکرێ و بواری خۆ دەربرینی بۆ برەخسێ و لە جیاتی سزادان و تەریقکردنەوە و رووشکاندن، پاداش بکرێ و هانبدرێ و گفتوگۆی لەگەڵ بکرێ، ئەوە هەرخوا دەزانێ منداڵ چەندین شێوازی خۆدەربڕین دەدۆزێتەوە. ئەو مرۆڤانەی هەمیشە بەدوای منداڵیی خۆیاندا دەگەڕێن، لە منداڵیدا رێگری گەورە و تێکشکێنەریان لەبەردەمدا بووە.. بۆیە چەندە سرووشتییە مرۆڤ منداڵیی خۆی لە قۆناغی تەمەنی منداڵانەدا ژیابێ، ئەوەندەش سرووشتییە لە قۆناغەکانی پاشتردا بۆی بگەڕێ و تامەزرۆی بێت و ئەزموونی بکات..

یەزدان کاتێ ئادەمی خەڵقکرد، منداڵیی خۆی لێسەندبۆوە. ئادەم وەك یەکەمین کەس هاتە دنیاوە کە نەیدەزانی منداڵیی چییە و یەکسەر بە گەورەیی و لە قۆناغی کامڵبوونی خۆیدا ئەفرێنرا. ئەو دەیتوانی ناو لە شتەکان و بوونەوەرەکان بنێ و (ئەوەی ئەو ناوی بۆ دەدۆزییەوە، بەو ناوەوە بانگ دەکرا..)ٍ بەمانایەکی دیکە، ئادەم منداڵیی وەك قۆناغێکی تەمەن ئەزموون نەکردووە، وەلێ وەك بارودۆخێکی دەروونی، منداڵیی شتێك بوو ئادەمیشی عەوداڵ و پەلکێشی خۆیکرد: ئادەمیش وەك هەر منداڵێ ئەو شتەی لەلا شیرین بوو کە دایكوباوك لە منداڵی قەدەغە دەکەن. ئەو بەدوای

میوەی قەدەغەکراودا گەڕا و خواردی و بەمەش سەلماندنی کە خاوەن ڕۆحێکی منداڵانەیە و توانای گەڕان و سەرپێچی و ئەزموونکردنی شتە یاساخەکانی هەیە.. بەڕاستی ئەوە ڕۆحی منداڵانەیە مرۆڤ والێدەکات بگەڕێ، عەودالْ بێ، فێربێ و ئەزموون کۆبکاتەوە و بەردەوام ڕیسك بکات..

ئێستاش ئاسان نییە مرۆڤ منداڵانە بژی.. لە کۆمەڵگای ئێمەدا جگە لەوەی قۆناغی منداڵیی زۆر کورتە و منداڵبوون هاوشانە بە یەك دنیا عەیبە و کەموکوڕی و چەوسانەوە، ئاواش منداڵانە ژیان، باج و سزای خۆی هەیە.. بەڵام لەوە دەچێ ترسی هیچ سزا و باجێك نەتوانێ ڕێگە لە ڕۆحی منداڵانە بگرێ و نەهێڵێ ژیانی خۆی بژی. لێرەشەوە دەتوانین بڵێین: منداڵی وەکو قۆناغێکی تەمەن پڕە لە ترس و سڵکردنەوە و چەپاندن، بەڵام منداڵی وەکو باروودۆخێکی دەروونی و ڕۆحی پڕە لە بوێری و دەقشکاندن و ڕەتکردنەوە. ئەوەی قۆناغێکی تەمەن لێمانی زەوتدەکات و تیاماندا دەیچەپێنێ، باروودۆخێکی ڕۆحی و دەروونی بەرگری لێدەکات و دەیەوێ بەدەستی بهێنێتەوە. ئێمە، یان ئەوەتا لە قۆناغی منداڵیی خۆماندا دەمرین و کۆتاییمان پێدێت، یاخود بۆ هەمیشە لە باروودۆخی منداڵانەی ژیاندا بوێرانە یاری و سەما دەکەین و خۆمان تەسلیمی فەنتازیا جۆربەجۆرەکان دەکەین: فەنتازیای هونەر، فەنتازیای ئەفسانە و حەکایەتەکان، فەنتازیای یاری و وەرزشەکان و دواجار فەنتازیای خواردن..

### منداڵانەخواردن:

منداڵ بوونەوەرێکی بخۆرە، ئەو جگە لەوەی کە خواردن بۆ تێری و لە برسێتییەوە دەخوات، ئاواش خواردن بۆ ئەو لەو قۆناغەدا چێژبەخشە. بۆیە هەموو شتێ بۆی هەیە لە ڕوانگەی منداڵەوە، ببێتە خواردن و وەك خواردن بنوارێتە هەموو شتێ کە دەتوانێت بە پەنجەی دەستەکانی، بیخاتە دەمییەوە! (دەم) لە قۆناغێکی تەمەنی منداڵدا، هیچ نییە جگە لە ڕێگایەك بۆ ناسینی دنیا و شتەکان. منداڵ برسیی بێ، یان تێربێ،

هەرشتێکی بەرچاو بکەوێت، دەیبات بۆ دەمی، چێژی دەکات و لەوێوە دەیناسێ و لەلای خۆی تۆماری دەکات..

بۆیە، بۆی هەیە هەموو شتێ کە منداڵ بتوانێ لەڕێگەی دەمییەوە بیناسێ، وەك خواردنی منداڵانە تەماشا بکرێ، وەلێ ئەوەی من لەم زنجیرەیەدا مەبەستمە ئەوەیە کە چۆن ئێمەی گەورەساڵ، لە مانای (خواردنی منداڵانە) تێبگەین. خواردنی منداڵانە دوو مانای سەرەکیی هەیە، یەکەم بەمانای خواردنێ دێت کە بۆ منداڵ شیاوە و دەتوانێت بە ئاسانی بیخوات و لە ڕووی تەندروستییەوە پێویستی پێیەتی. دووەمیش بە مانای (منداڵانەخواردن) دێت.. ئەوەی یەکەمیان پێویستە خەمی دایكوباوك و وەزارەتی تەندروستی و لایەنەکانی چاودێری منداڵ بێت، وەلێ منداڵانەخواردن پێویستە خەمی هەموو ئەوانە بێت، کە سەروکاریان لەگەڵ منداڵدا هەیە، هەر لە باوانەوە تاکو مامۆستای دایەنگەکان و پەروەردەکاری باخچەکانی ساوایان و هتد.

لە مانای چەمکی (منداڵانەخواردن)دا، مەبەستم بەرجەستەکردنی خواردنێکی تایبەت نییە، چونکە بۆی هەیە هیچ خواردنێ لەئارادا نەبێت. ئێمە زۆرجار منداڵان دەبینین، وای پیشاندەدەن ناندەخۆن، یەکتری بانگهێشت دەکەن و ئێمە داوەتدەکەن بۆئەوەی بەشدارییان بکەین، بەبێ ئەوەی هیچ خواردنێ لە ئارادا بێت. ئەوان (وەهای پیشاندەدەن) و دەیانەوێ نومایشی شتێکمان بۆ بکەن، کە تەنیا لە فەنتازیای خۆیاندا هەیە و پڕە لە دەلالەت سەبارەت بە حەز و ئارەزووی ئەوان بۆ ژیانێکی کۆمەڵایەتیانە و هەرەوەزیانە. زمانی ئەو (پیشاندان) و (یاریکردن) و (گاڵتەی نانخواردن)ـە، زمانێکی ئیستیعارییە، کە مەبەستەکەی زۆر زیاتر دەڕوات لەوەی نانیان لەگەڵ بخۆین. ئەوان بەو کارەیان دەیانەوێ لەگەڵیاندا بین، پێکەوەبین، لەلایان بین و بەجێیان نەهێڵین و وەکو خۆیان منداڵ ببینەوە و منداڵانە بژین.

ئەم زمانە، زمانی فەنتازیا و زمانی سەرەتایی ژیانی ڕەگەزی مرۆڤە، زمانی ئەو یەکەمین هۆزە مرۆییانەیە کە مێژوو و دیراساتی مرۆڤناسی، وەك یەکەمین هۆزە کۆمەڵایەتییەکانی دنیا پێیان ناساندووین و فەیلەسووفەکانی بەو ئەنجامە گەیاندووە،

که مرۆڤ وەك (بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی) پێناسە بکەن. لە ڕاستیدا دەبوو بیانگوتبا: (*مرۆڤ لە بارودۆخی منداڵانەی خۆیدا بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە*)، چونکە ئەو کاتەی مرۆڤ منداڵیی خۆی بیردەچێتەوە، هیچ نییە لە بوونەوەرێکی کۆمەڵگا تێکدەر زیاتر، تەنانەت مرۆڤ تاقە بوونەوەرێکە بە وزەیەکی ئەوتۆی خۆوێرانکردنەوە، کە ڕەنگە سرووشت لەبەرامبەر ئەم وزە خۆوێرانکەرەدا بارودۆخی (منداڵانە ژیان)ی وەك سووپەرێك بۆ مرۆڤ داهێنابێت. چونکە تەنیا منداڵانەژیانە کە ناهێڵێت ئێمە بە ئاسانی خۆمان وێران بکەین.. ئەم قسەیە بە دوو بەڵگە دەکەم. یەکەم: لەناو بوونەوەرەکاندا تەنیا مرۆڤ قۆناغی منداڵی و بارودۆخی منداڵانە دەژی. ئاژەڵ و زۆرینەی بوونەوەرەکانی دیکەی جیهان نە قۆناغی منداڵییان هەیە و نە ئەزموونی منداڵانەی ژیانیش. تووڵەمارێ کە لە هێلکە دەجووقێ دێتە ناو جیهانی دڕندایەتییەوە: یان دەخوورێ و یان دەبێ بخوا و پێوەبدات. کاتێ بەسەر زەویشدا پێچاوپێچ دەڕوات، ئەوە بەمانای ئەوە نییە لە بارودۆخی تووڵەماریانە و فەرخەیی خۆیدا دڵی خۆشە و سەما دەکات، بەڵکو یان دەترسێ یاخود بەدوای نێچیرێکدا دەخشێ. دووەم بەڵگە ئەوەیە: کە دڕندەترین دڕندە، تا ئەوکاتە دڕندەیە کە غەریزەکانی تێر دەبێ و لەوەدوا هەموو ئاسك و سنگە کەوی دنیای بۆ دابنێ، بەلایدا ناچێ.. بۆیە ئەوە تەنیا مرۆڤە کە وزەی خۆوێرانکردن و ئەوانیتر وێرانکردنی بێسنوورە.. لەبەرئەوە کاتێ باسی منداڵی و منداڵانە ژیان دەکەین، مەبەستمان تەنیا ژیانی مرۆڤە، چونکە تەنیا ئەو بوونەوەرە پێویستی بە ڕێگرێك هەیە تاکو سنوور بۆ وزە خۆوێرانکەرەکەی دابنێ.. تەنیا مرۆڤ پێویستیی بە منداڵبوونەوە هەیە.

بابێمەوە سەر باسە سەرەکییەکەم: منداڵان بەو داوەتکردن و خواست و گاڵتەی نانخواردنەیان، ویستی خۆیان بۆ ژیانێکی کۆمەڵایەتیانە دەردەبڕن، کە پێویستیی بە پاڵپشتیکردن و هاندان و گەشەپێدان هەیە. ئەگەر ئەوان دەیانەوێ بە زمانێکی میتافۆڕیانە و لەڕێگەی یاریی نانخواردنەوە، بانگمان بکەن بۆ پێکەوەبوون و هاوکاریی ناو سرووتێکی کۆمەڵایەتیانەی فەنتازیکراو، ئەوە ئێمە دەتوانین ئەو فەنتازیایەی ئەوان

لە واقیعدا بهێنینەدی: ماتەریالیییەت بە خواستەکەی ئەوان ببەخشین، کە زۆر گرنگترە لەوەی ژەمە خۆراکێکیان بدەینێ کە بۆی هەیە حەزی لێنەکەن!

من لە پەروەردەکارانی گەورەم بیستووە و خوێندۆتەوە، ئەگەر بێت و لەکاتی خواردن دروستکردندا بوار بە مندالان بدەین بەشێوەیەکی ڕەمزییانەش بێت هاوکاریمان بکەن، واتە بەشێوە مندالانەکەی خۆیان خواردنمان لەگەڵ دروستبکەن، لە ڕووی دەروونی و ڕۆحییەوە، بۆ ئەوان زۆر پێویستترە وەك لەوەی بەزۆر و بەهەر بەلگەیەك، خواردنێکیان دەرخوارد بدەین.. بوار ڕەخساندن بۆ مندالیی منداڵ، بەشداریپێکردنی و متمانەبەخشین و بەجیدیگرتنی کارەکانی، زۆر گرنگترن لە سنووربەندیکردنی دنیای منداڵ لەناو قەفەسی نازکێشان و هەموو شتێ بەحازری خستنە بەردەستی..

لەگەڵ دروستکردنی هەر ژەمەخۆراکێکدا، دەتوانین بوار بە مندالان بدەین خواردنێکی مندالانەمان بەهەمان ئەو خۆراکانەی کە خواردنەکەیان پێدروستدەکەین، بۆ دروست بکەن. بۆ نمونە ئەگەر بڕیارە خۆراکێك بشۆینەوە، بیجنین، پاکیبکەین و هتد، دەتوانین لەتێ لەو خۆراکە، بدەینە دەست مندالەکە و داوای لێبکەین لە شتنەوە و جنین و پاککردنیدا، هاوکاریمان بکات و ئەنجامی کارەکەی ئەویش ببێتە بەشێ لە خواردنەکەمان.. هیچکاتێ منداڵ باشتر فێری زەلاتەخواردن، پەتاتەخواردن و هەرخواردن و خواردنەوەیەکی دیکە نابێت، لەوکاتە زیاتر کە بۆخۆی لە ئامادەکردنیاندا بەشدار بێت. لێگەڕێ ئەو خەیار و تەماتەیەك بەوجۆرەی دەتوانێ و بەو چەقۆ پلاستیکییەی دەیدەیتێ، بجنێ.. قەیناکات تەنیا با هەر دوولەتیان بکات و هیچیتر، قەیدی چییە با بیانفلیقێنێتەوە، بەلام ئەوەی ئەو کردوویەتی بکەرە ناو زەلاتەکەتەوە، نرخی بۆ دابنێ و هانییدە، تاکو بە ئاسانی فێری زەلاتە و سەوزەخواردن بێ.. لێگەڕێ ئەو خواردنی مندالانەی خۆی دروستبکات و لێگەڕێ ئێمەش جاروبار مندالانە خواردن دروستبکەین و بیخۆین، چونکە تەنیا بەوە جیهان جوانتر و پانتایی ژیان بەرفراوانتر دەبێ..

ڕۆژگـارێ دێـت هەسـتدەکەین چ زوڵمێکمـان لــە منداڵــەکان کـردووە، تەنانـەت ئەوکاتانەش کە دەمانەوێ لــە برسـان نـەمرن و بـە شـێوازەکەی خۆمـان خواردنیـان بەدەمەوە دەکەین! ڕۆژگاری دێت، تێدەگەین: زۆرجار منداڵانـەخواردن و ئازادیـدان بە منداڵ لەکاتی نانخواردندا تاکو بەشێوە منداڵانەکەی خـۆی بخـوات، زۆر گـرنگترە لەوەی لە دڵسۆزی و خۆشەویستییەوە، بەزۆر و بە شـێوازێکی تایبـەت خـواردنێکی بەدەمەوە بکەین.. ڕۆژگارێ دێ تێدەگەین، ناچارکردنی منداڵ بەوەی وەکو ئێمە بـە (جوانی) و (ڕێك‌وپێکی) نان بخوات، ناچارکردنی بەوەی لەگەڵ ئێمەدا دەسـتپێبکات و لەگەڵ ئێمەدا دەستهەڵگرێ، ناچارکردنی بەوەی هیچ بەخۆیدا نەڕێـژێ، بەدەسـت نەخوات و دەم‌ولووت و سەروچاوی خۆی تێوەنەدات، ناچارکردنی بەوەی بێـدەنگ و بێسرەوت لەسەر کورسییەکەی و کەنار سفرە دابنیشێ و کەوچکەکەی دەستی بەر ددانی نەکەوێ و لرفەی لێوە نەیەت، هەموویان دژی سرووشتی منداڵانـەی منـداڵن! گەورەترین هەڵەی پەروەردەیی ئێمە لەگەڵ منـداڵان، لەوکاتانەدایـە کـە دەمانـەوێ بەوجۆرەی کە ئێمە دەمانەوێ ئەوان نانەکەیان بخۆن.. بەڵام بەلای ئەوانـەوە، ئـەوەی گرنگە چۆنێتی نانخواردنەکەیە نەك چی خواردنەکەیان.. وەرە تۆ سـادەترین خـواردنی بدەرێ و بەڵام ڕێگەی بدە ئەو بەشێوە منداڵانەکەی خۆی، بیخـوات، نـەك سـێ‌ژەمە باشترین خواردنەکانی بدەیتێ و ئازادیی چۆنێتی خواردنیانی لێزەوت بکەیت..

لەو کۆمەڵگا و کەلتوورانەدا کە منداڵیی قۆناغێکـە لەتەمـەن، زۆرینـەی مرۆڤـەکان لەسەر نانخواردن و چۆنێتی خواردنەکەیان زڵـلەی مـزر و تێهەڵـدانی بـاش دەخـۆن و لەوکاتەدا کـە پـاروو لـەدەمیاندایـە، بـە حـەددێك تەریقدەکرێنـەوە و دەشـکێنرێن و تەنانەت ئازار دەدەرێن، کە هەرچەند گەروویان بیـەوێ پارووەکـەی دەمیـان قـووت بدات، قولْپی گریان پێان دەهێنێتەوە دەر..

خۆزگە من لە کۆمەڵگایەکدا لـەدایك دەبـووم و دەژیـام کـە لــە منداڵیمـدا ئـازاد بوومایە چۆن منداڵانە بژیم و یاریی بکەم و نان بخۆم، بۆ ئەوەی ئێستا ئەوەنـدە دیمـەنی تەریقبوونەوەی خۆمم لەکاتی یاری و پێکەنین و خواردندا بیر نەکەوتباوە.. ڕۆژگـارێ

دێت ئێمە ئەم کەلتوورە منداڵکووژە تووڕهەڵدەین و کەلتوورێکی منداڵانــە ســتاییش بکەین، کە تیایدا هەموو فەنتازیایەك قابیلی ئەوەبێت بکرێتە واقیع..

لاچن، دەمەوێ بــۆ ســاتەوەختێ منداڵانــە بــژیم: ئــیتر مــن حــەزم لــە تەماشــاکردنی (خەپەگیانە)، ! دەمەوێ جارێکی دیکەش (ئەلیس لەسەر زەمینــی سەرســووڕمانەکان) بخوێنمەوە.. حەزدەکەم هەر ئێستا تەماشای (کراسی نوێی پادشا)ی هۆسی ئەندەرسن بکــەم، وەك (پیپــی گــۆرەوی درێــژ) ئەســپێك هەڵبــڕمــە ســەر ســەرم، دەمــەوێ وەك (کوڕەکەچەڵە) کچانی ئاوایی شوێن خۆم بخــەم و چاوســاخیان بم و نــەهێڵم دێوەکــە بیانخوات.. ئای چەندم حەز چووە سەر (مێووژی زۆراب)! بیری (چــاویلکەی نــەکم) دەکەم.. تازە ئەمشەو ناخەوم، لــەگــەڵ (شــازادە بچــکۆلــە)ی ئیگزۆپریــدا دەچــم بــۆ گەشتی ئەستێرەکان، لەوانەیە شوێن (ماسییە ڕەشەبچکۆلە)ی بیهرەنگی بکــەوم، کــە هاتمەوە، (ئەلبوومی کیژی جنۆکــان)ت پیشــاندەدەم.. ووس بــە.. ئــەوا قالۆنچــەیەك بێرەدا هات، دەمەوێ لەبەردەمیدا ڕابکشێم و لوتم بنێم بە لووتییــەوە. دەزانم ئــەویش وەکو من خەواڵووە، کەچی لێم دەپرسێ:

- چیتدەوێ بەم نیوەشەوە، دوو پێ؟

منیش بەهێواشی و بێئەوەی سڵم لێبکاتەوە، پێی دەڵێم:

- خۆشمدەوێی..

ئیتر تا بەیانی بەدەم تەماشاکردنی ئەستێرەکانەوە، لەسەر پشت لێی بخــەوی، جاروبــار قالۆنچەکە چەرچەفەکەت لێبدزێ، جاروباریش تۆ بەسەریدا بدەیتەوە.. بەیانییش کــە هەستایت، هەتاو گەیشتبێتە ســەرت.. بــەملاولادا ئاوڕدەیتــەوە و هــیچ دیــار نــەبێ.. وەکئەوەی لەمێژبێ، لەمێژ.. قالۆنچە ڕەشتاڵەکە ئەم ناوەی جێهێشتبێ..

# خواردنیی پیرانه

## (بەرەو زیندووکردنەوەی فرۆجاو..)

**ئەمرۆ** لە وڵاتی ئێمەدا هەموومان بەوەدا پیرەکان دەناسینەوە کە (پارێزیـان) هەیـە! پارێزیان هەیە لـە خواردن، لـە چوونە دەرەوە، لـە بەشداربوون لـە پانتـایی گشـتی، لـە هاتنە باخی شار، لـە چوونە سەیران، لـە کارکردن لـە ڕێکخراوە ناحکومییەکانـدا، لـە پێشبڕکێکانی وەرزشدا.. بەم پێیەش، ئەوان تەنیا دەتوانن (پیر) بن و خۆیـان خانەنشـین بکەن و لـە ماڵێکدا وەك ئاوارەیەك ژیان بەسـەر بـەرن و لـە دوکانـەکانی لاکۆڵانـدا لەسەر کورسی و تەنەکەیەك بەدیار سندووقی بیبسیی کۆلاوە، دابنیشن..

کۆمەڵگایەك کە پیریی پشتگوێ دەخات، دەبێتە دۆزەخێکی زەمینی بۆ پیرەکانی. بەڵام بۆچی کۆمەڵگایەك پیری پشتگوێ دەخات؟ بێگومان هۆکاری سـەرەکیی ئەوەیـە کـە لەو کۆمەڵگایەدا شوێنێك بۆ پیرەکان لەپێشچاو نەگیراوە و پـیری و مـردن وەك دوو ڕووی یـەك مەسـەلـە لێکدەدرێنـەوە. ئـەو کۆمەڵگایانـەی پـیری و مـەرگ وەك تەواوکەری یەکتر دەبینن و لـە پیریـی خۆیانـدا (هـەزار عـەیب دەدۆزنـەوە)، چەشـنە کۆمەڵگایەکن کە لەپێناوی هەڵکردن لـەگەڵ مۆدیلـەکانی ژیاندا دەست لـە ژیـانێکی نەوعی هەڵدەگرن. وەلێ مەرج نییە ئەو کۆمەڵگایانە بتوانن خۆشبەختی و ئاسوودەیی بۆ پیر و غەیرە پیرەکـان دابـین بکـەن، چـونکە دابینکردنـی ئاسـوودەیی بـۆ گرووپـە کۆمەڵایەتیەکان پەیوەست نییە بەوەی لـە قۆناغێکی تەمەنیاندا زۆرینەی خواسـتەکانیان بهێنیتە دی و زۆربەی تواناکانیان بخەیتە گەڕ، بەڵکو ئاسوودەیی و خۆشبەختی بۆ مرۆڤ

لەوەدایە کە لە میانەی قۆناغەکانی تەمەنیدا بەبەردەوامی هەستبکات سوودمەندە بۆ کۆمەڵگاکەی.. پیریی چەندە لە تەسلیمبوونی ئێمەدایە بە گۆڕانە جەستەییەکان، ئەوەندەش زیاتر لەوەدایە کە هەستبکەین کەڵك و سوودمان نەماوە بۆ ئەوانیتر. پیرەکان بە کۆمانەوەی پشت و چرچولۆچبوونی پێستی دەستیان و ناوچەوان و چاوە کزبووەکانیان خەم خەفەت ناخۆن، غەمی سەرەکیی ئەوان لەوێوە دەستپێدەکات کە چیدی نەتوانن ڕۆڵ و پێگەی خۆیان لە کۆمەڵگادا بناسنەوە.. نۆبێرت ئیلیاس دەنووسێ: (*بێڕەحمی و قەساوەتێك کە پیرە بێکەسوکارەکان لەپەلوپۆ دەخات و وەڕسییەك کە لەئاست پیاوە پیر و پیرێژنە پووکاوە و ڕووخسار وەریوەکاندا دەیبینی، ڕەنگە لە سەردەمەکانی پێشووتردا زۆر لە ئێستا بڵاوتر بووبێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم قەساوەت و دڵڕەقییە هێشتاکە بەتەواوی یەخەی کۆمەڵگای ئێمەی بەرنەداوە..*).

ئیلیاس هۆکاری ئەمەش دەگێڕێتەوە بۆ گۆڕان و بەرەوپێشچوونی پەیوەندیی تایبەتیی ئەو کەسانەی پیر دەبن و لەجێگەی مەرگدا دەکەون: هەرئەوەندەی کەسێ پیر دەبێ، لە پەیوەندیدا لەگەڵ گەنجەکان و ئەوانەی پیر نین، بێتواناتر دەبێ..

بۆی هەیە هۆکارە تایبەتیەکان، ئەوانەی پەیوەندییان بە لاوازبوونی جەستەیی و توانایی پیرەکانەوە هەیە، بنە هۆی زیادبوونی قەساوەت و بێڕەحمیی کۆمەڵگا لە ئاستیاندا، بەڵام بەبڕوای من جگە لەو هۆکارانەی کە پیربوونی پیر بەسەریاندا دەسەپێنێ، هۆکاری دەرەکیش هەن کە لەئاست پیرەکاندا بەرهەمهێنەری توندوتیژی و بێڕەحمین. کەواتە ئێمە بەمجۆرە پرسیارەکەمان دەکەین: چین ئەو هۆکارانەی وایانکرد، دەسەڵاتی پیری و پیرەکان لە کۆمەڵگای ئێمەدا، کە هەزاران ساڵ بوو حوکمیان لەدەست بوو، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا لە دەسەڵات بکەون و پێگەی خۆیان لەدەست بدەن، ئەگەرچی ئەمە بەشێوەیەکی ڕێژەییش بێت؟ چونکە هەموو ئەوانەی دەچنە ساڵەوە پیر نابن و هەموو پیربوونێکیش ئەنجامی تەمەنێکی زۆر نییە.. کەواتە با لەهەندێ هۆکار وردبببینەوە.

## تەکنەلۆژی و پیری:

لە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا، تەکنەلۆژی کاریگەرییەکی دوولایەنەی لەسەر پیری و پیربوون هەیە: بەلایەکدا ئەو گۆڕانە زۆرەی لە هەزری تەکنەلۆژیدا، بەتایبەتی تەکنەلۆژیای تەندروستیدا ڕوویداوە، یارمەتیدەرێکی باش بووە لە هاوکاریکردنی بەساڵاچووواندا بۆ دابینکردنی ئەو ئامێر و کەرەستانەی کە جێگرەوە و بەهێزکەری ئەندامە لەکارکەوتووەکانی جەستەی مرۆڤن. ئەمڕۆ لە هەر قۆناغێکی دیکەی مێژووی شارستانییەت زیاتر، پیرەکان لەسایەی بەرهەمە تەکنەلۆژی و زانستییەکاندا، بەدوورن لە (پەککەوتن) و (لەجێداکەوتن) و پێویستیی بەردەوامی ئەوان بە خەڵکانیتر، بەتایبەتی لە ئیشوکارە ئاساییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا. ئەم تەکنەلۆژیایە ئومێدی ئەوەی خستۆتە دڵی زۆربەی بەتەمەنەکانەوە کە پیرییەکەیان دواتر بخەن. بۆ ئەوان، پیریی هەلی گەڕانەوەیە بۆ ئەنجامدانی ئەو کار و خۆزگانەی کە هەرگیز ئەنجام نەدران و ئێستەکانێ دەتوانن ئەنجامیان بدەن..

وەلێ بەودیوی تردا و بۆ بەشێکی دیکەی پیرەکانی جیهان، بەتایبەتی جیهانی هەژارنشین، هەر خودی ئەم تەکنەلۆژیایە زۆر ڕۆڵ و ئەرکی لە پیرەکان سەندۆتەوە و بێبایەخی کردوون، کە لە کۆمەڵگا نەریتییەکاندا بە ئەرك و ڕۆڵی سەرەکیی ئەوان دادەنران.. لەمێژە تەلەفزیۆن وەك بەرهەمێکی تەکنەلۆژی کە سنووری بڵاوبوونەوەکەی ناوچە هەژارنشینەکانی دنیاشی گرتۆتەوە، وەك ڕەقیبێکی هەرە سەرەکیی پیرەکانی کۆمەڵگا دەرکەوتووە. لەو شوێنانەی جیهاندا، چیدی ئەوە پیرەکان نین بە گێڕانەوەی ئەزموونەکانی خۆیان و بەهۆی گواستنەوەی ئەزموونی باووباپیرانەوە، ئەندامانی کۆمەڵگاکەی خۆیان بە حەقیقەتی ژیان ئاشنا بکەن. لەو شوێنەی تەلەفزیۆن بەناوی دوایین ڕاستییەوە شتەکانمان بۆ نومایش دەکات، پیرەکان ناتوانن بەیانکەری حەقیقەتی ئەزموونکراو بن..

بەهەمان شێوە، پێشکەوتنی زانستی لە بواری پزیشکیدا، چیدی بواری بۆ پیرەکان نەهێشتۆتەوە تا حیکمەتی ئەزموونی خۆیان لە چاککردنەوەی نەخۆشدا بەکار بهێنن،

کە شتێ بوو لەنێوان گەڕانەوە بۆ یەزدان و بڕوابوون بە مرۆڤ کە دەتوانێ بۆخۆی بەسەر نەخۆشییەکەیدا زاڵ ببێ. ئەمڕۆ زانستی پزیشکی کار لەسەر (هۆکار و چارەسەر) دەکات و چیدی پێویستی بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەیەکی دیکە نییە: ئەگەر هۆکار بدۆزینەوە، چارەسەر ئاسانە.. زۆرجار ئەم لۆژیکە خودی پیری وەك هۆکارێك بۆ زۆرینەی ئەو کێشانە دەستنیشاندەکات کە بەساڵاچووەکان دووچاریان دەبن. بۆ نمونە نەخۆشییەکان. بەم پێیەش دەستنیشانکردنی پزیشکیانە بۆ کێشەی پیرەکان جیاوازە لە دەستنیشانکردنی کۆمەڵناسیانە بۆ هەمان ئەو کێشانە. حیکمەتی پزیشکی، شتێ کە پەیوەست بوو بە دانایی پیرەکانەوە، هەمیشە هۆکاری نەخۆشییەکان لە هێزێکی باڵاتردا دەبینێ: نەخۆشییەکان لە ڕوانگەی ئەم حیکمەتەوە، بەڵا و هێزی شەڕانی نین، بەڵکو ئاماژەکانی دەسەڵاتی یەزدانن کە دەیەوێ بەهۆیەوە سزای مرۆڤە کەمتەرخەمەکان بدات. بۆیە حیکمەتی پزیشکیی پیرانە، سەرەتا دەیویست مانای ئاماژەکە بزانێ، ئەمجا داوا لە یەزدان بکات توانای خۆڕزگارکردن بە نەخۆش بدات تاکو لەو سزایە ڕزگاری ببێ و ئەوەشی بۆ ببێ بە ئەزموونێك و عیبرەتێ.. بۆیە (دەرمان) لەم جیهانبینییە پزیشکییەدا ڕۆڵێکی زۆر پەراوێزی هەیە و (خواردن) جێگەی دەرمان دەگرێتەوە و بەهێزکردنەوەی مەعنەویات و ڕۆحییەتی نەخۆش لە کارە هەرە سەرەکییەکانێتی. ئەوەش ئەو ڕەهەندەیە کە تەکنەلۆژیای پزیشکی گرنگییەکی ئەوتۆی پێنادات و حەقیقەتی تاقیگە دەخاتە سەرووی حەقیقەتی ئەزموونەوە.

پیری و حیکمەتی پیرانە لە گەڕانەوە بۆ ئەزموون زیاتر، ڕێگایەکی دیکە ناناسێ.. چاکبوونەوەی نەخۆش لە حیکمەتی پزیشکیی پیرانەدا لەوەدا نییە کە حەپ و دەرمانەکان تەواو بکات، بەڵکو پەیوەستە بەوەی قوربانیی بۆ بدرێت. کەواتە ئامۆژگاری حەکیمەکان بەوەی: (کەڵەشێرێکی بۆ سەربڕن با ئاوەکەی بخواتەوە)، یان: (فڕوجاوێکی بۆ لێبنێن)، بەشێکە لەو چارەسەرە.

لە هەموو ئەمانە بترازێ، تەکنەلۆژی و خێراییەکەی لەگەڵ پیری و ڕیتمە مەند و لەسەرخۆکەی، وێکنایەنەوە. پیری چ وەکو کەڵەکەبوونی ساڵەکانی تەمەنی

تاکەکەس تەماشای بکەین و چ وەکو کەڵەکەبوونی ئەزموونی مرۆڤایەتی، لەگەڵ خێرایی و تەوژمی تەکنەلۆژیادا ناکۆك و نائارامە. نائارامی و ناکۆکی دوو دووژمنی سەرەکیی مرۆڤی بەساڵاچوون: ئەو دەیەوێ هەمووشتێ ئارام و لەسەرخۆ و بە (تەبیعەت)ی خۆی بێت، ئەمە جگەلەوەی بوار و حەوسەڵەی ژیانی لەگەڵ ناکۆکیدا نەماوەو و بەپێچەوانەی دیمەنی ناو حەکایەتە ترسناکەکانەوە لەسەر پیرەکان، سادەیی و شەففافییەت و ڕاشکاوی لەو خەسڵەتانەن کە مرۆڤی بەساڵاچوو لە ناکۆکی و دوو ڕوویی بەدوور دەگرن..

## جەنگ و پیری:

لە بنەمادا جەنگ، بەرلەوەی ڕووبدات، لەکاتی ڕوودانیدا و لەپاش وەستانیشی، گەورەترین بێحورمەتییە بە پیری و بە پیرەکان. لەپێش ڕوودانیدا جەنگ، حساب بۆ هێزی پیرەکان ناکات و تەنیا خەریکی ستایشکردنی بازووی گەنجەکانە. جەنگ، هێز لە جەستەدا دەبینێ نەك لە ئەزموون و بیرکردنەوەی حەکیمانەدا. لەکاتی ڕوودانیدا، جەنگ هیچ بایەخێك بە پیرەکان نادات و دەیانکاتە قوربانی، پیرەکان لە شاڵاوەکانی ئەنفالیشدا گرووپێکی گەورەی قوربانییەکان پێکدەهێنن، هەروەکچۆن نازییەکانیش بەچاوێکی ڕقاوییەوە دەیانڕوانیە بەتەمەنەکان. کاتێکیش جەنگ دەوەستێ، پیرەکان دەکەونەوە ئەو پەراوێزەی (سەرکەوتن)و (ژێرکەوتن)ی لایەنەکان دروستیدەکەن، کە بێگومان شوێنی پیرەکان لەو سەرکەوتن و ژێرکەوتنەدا پێناسە نەکراوە.

بەمجۆرەش جەنگ پیربوونی مرۆڤ و پیرەکان خێراتر دەکات و کەشوهەوایەك دەڕەخسێنێ کە تیایدا پیرەکان زۆر زەلیلتربن وەك لەوەی کە پیربوونەکەیان لە کۆمەڵگایەکی دوور لە جەنگدا ئەزموون کردبا..

## پیرکردنی پیر:

بە پێچەوانەی بارودۆخی جەنگەوە، کە تیایدا پیرەکان دەبنە بارمتە و سووتەمەنی و پیربوونەکەیان بێڕێزی پێدەکرێ، ئەوە دیاردەی پیرکردنی پیر، دیاردەیەکی بەتەواوی

مانا کۆمەڵایەتیانەیە و سەرەتاکەی لەو یەکەیەوە دەستپێدەکات، کە ناوی (خێزان)ـە. یاسا گشتییەکە ئەوەیە کـە دەڵـێ: مـەرج نییـە ئەوانـەی بەسـاڵا دەچـن و لـەئاسـتی جەستەییدا لاواز دەبن، هەمیشە لەڕووی مەعنەوی و ڕۆحییشـەوە دووچـاری هـەمان لاوازی بن، وەلێ ئەگەر پیرێکی بەجەستە پیر و بە ڕۆح تێکشـکاوت بینـی، بـەمانای ئەوەیە ئەوە پیرێکی پیرکـراوە، نـەك پـیر بـوو. لـەو کۆمەڵگایانـەدا کـە بـارودۆخی خێزانەکان ناجێگیرە و کێشە کۆمەڵایەتیەکان گەیشتونەتە سەر پێخەف و نـاو ژووری نووستن، پیرەکان هەر تەنیا بەهۆی سەرکەوتن و هەڵچـوون لــە تەمەنـدا، پـیر نـابن، بەڵکو پیرییەکی دیکە لە ئاستی ڕۆحی و دەروونیـدا یەخەیانـدەگرێت کـە مـن نـاوی دەنێم: پیرکردنی پیر. پیرکردنی پیرەکان، وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایـەتی، بەرەئـەنجامی شێواوی و ئاڵۆزبوونی کۆی ئەو پەیوەندیانەیە کە لەخێزانەوە سەرچـاوەدەگرن و لــە ئەنجامی دووبارەبوونەوەی کارلێك و ڕووبەڕووبوونەوە ڕۆژانەییەکانەوە دروسـتدەبن. پیرەکان لەناو ئەو جۆرە خێزانانەدا، جگەلـەوەی لــە ڕووی جەسـتەییەوە نیشـانەکانی پـیری و بەساڵاچـوون تیایانـدا سـەرهەڵدەدات، ئـاواش لــە ئاسـتە دەروونییەکەیـدا پووکانەوە و بێهێزییەکی ڕۆحی، گووشاریان بۆ دەهێنێ. (پیربـوونی جەسـتەیی مـرۆڤ) سەرەتا نیشانەکانی لە جەستە و توانایی فیزیکی ئەو مرۆڤەدا بـەدیار دەکـەون، وەلـێ (پیرکردنی پیر) یەکەمین نیشانەکانی خۆی لەسەر دڵ و ڕۆحی پیرەکان هەڵـدەکۆڵێ. لێرەدا مەبەستیشم لەو نیشانانە ئەوانەیان نین، کـە بەرئـەنجامی خـەمخواردنی دایکـانی ئێمە و باوکانی ئێمەن لــە کـوڕە ئەنفالکراوەکـەیان و کچـە تەلاقدراوەکـەیان و بـرا شەهیدکراوەکەیان و پیربوونیان بەو ئـازار و دەردانـەوە.. ئـەوان لــە میانـەی ژیـانی خۆیاندا بەرگەی زۆر کارەساتی وەك ماڵ لێتێکچوون، ئاوارەیی، هـەژاری، کۆسـت و جەرگسووتانیان گرتووە و هێشتاکەش پیربوونەکەیان تەنیا نیشانەیەك بووە بە سـیما و جەستەیانەوە. وەلێ لەوکاتەوە کە ئەوان هەستبکەن، ئیدی زیایەن، کـەس گـوێ بـە قسەکانیان، حەزەکانیان، خواستەکانیان نادات، کـەس لـە ژیـانی ڕۆژانـەی خێزانـدا بەشدارییان پێناکات، بەردەوام شتەکانیان لێدەشاردرێنەوە، قسەیان لەگـەڵ ناکـەن و

بێڕێزییان پێدەکرێ و هتد.. ئەوە لەو دەمەوە پیریی ئەوان دەبێتە نیشانەیەك بەسەر ڕۆحیانەوە.. پیرکردنی پیرەکان پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بە مامەڵەو تێڕوانینی ئێمەوە بۆ ئەوان.. کاتێ بەناو باخچە و پارکەکانی وڵاتی خۆماندا پیاسان دەکەم زۆر دڵم خۆشدەبێ بەو شەپۆلی گەنجانەی ئەوێیان کردۆتە شوێنی کاتبەسەربردنیان، بەڵام یەکسەر ئەو پرسیارەم بە زەییندا دێ: ئاخۆ پیرەکان لەکوێن؟ ئایا لە وڵاتی ئێمەدا پیرەکان (پارێز)یان لە چوونە پارکیش هەیە، یان ئەوە ئێمەین ئەوانمان پشتگوێ خستووە؟!

هیچ گومان لەوەدا نییە، کە کۆمەڵگا و بەتایبەتی پێکهاتەی خێزانیی ئێمە لەئاست پیرەکاندا دوو ڕووە: لەلایەکەوە بەوجۆرە قسە لەسەر خۆمان دەکەین کە ئێمە زۆر ڕێز لە پیرەکانمان دەگرین و بەردەوام بە باسکردنی ڕێزی خۆمان بۆ پیرەکان، ئەو بۆشاییە پڕدەکەینەوە کە پرسیار لە ئامادەیی پیر دەکات لە وڵاتی ئێمەدا. لەلایەکیتریشەوە، شوێنە گشتییەکانی وڵاتی ئێمە، وەك پارکەکان، سۆپەرمارکێتەکان، سەیرانگاکان و هتد. چۆڵن لە پیرەکان! لەنێوان ئەم پڕکردنەوەی بۆشایی و چۆڵییەدایە کە پیرەکان پیردەکرێن و لەخۆ تێگەیشتنی ئێمە وەك بڵقی سەرئاوی لێدێت.. لە ڕاستیدا: چۆڵیی باخچە و شوێنە گشتییەکان لە پیرەکان، هیچ ناگەیەنێ لەوەزیاتر کە ئێمە دەمانەوێ لەماڵیشەوە دەریانکەین..

## چۆن پیریی خۆمان دەهێنینە پێشچاومان؟!

مرۆڤ لە تافی لاوێتیدا ئەوەندەی بیر لە پتەوبوونی ماسوولکەکانی دەکاتەوە و سەرقاڵە بە ساتەوەختی هەنووکەوە، ئەوەندە ناتوانێ وێنای پیریی بکات و لە داهاتوو ڕابمێنێ. خۆ ئەگەر مرۆڤ لە گەنجێتیدا کەمێ خەیاڵی لە پیربوونی خۆی دەکردەوە و لە پیریشدا کەمێ زیاتر لە خۆپەرستیی گەنجەکان تێدەگەیشت، پەیوەندیی ئەوان بەیەکترەوە جۆرێکی دیکە دەبوو و لەو نێوانەشدا نە گەنجەکان هەستیاندەکرد،

پیرەكان زیایە و ڕێگرن لەبەردەمیاندا و نە پیرەكانیش ئەوەندە ساڵانی كۆتـایی تەمـەنی خۆیان لـە بیابانی تەنیاییدا بەسەر دەبرد..

بۆیە دەمەوێ پیریی خۆم، بۆ ساتەوەختێكیش بێت بهێنمە پێشچاوم، تاكو ئەو نەوەیەی لـە سەردەمی پیریی مندا گەنجە، باشتر بمناسێ:

دەزانم من پیرێكی كورتەباڵای پاكوخاوێنم لێدەردەچێ.. پاكوخاوێن تا ئەو سـنوورەی كە هەرچی نەخۆشـییەك تووشـی بـبم هۆكارەكـەی دەگەڕێتـەوە، نـەك بـۆ پیربـوونم لەئاستی جەستەییدا، بەڵكو بۆ ئەو ژینگـە پیسـبووە كۆمەڵایەتیـەی تیایـدا ڕۆژەكـانی كۆتاییم تێپەڕ دەكەم.. ڕەنگە لـە پیریمدا كـەمتر قسـان بكـەم و لەسـەر هـەموو شـتێ هەڵنەیەم، وەلێ قسەكانم ئەوەندە شیرین دەبن، ئەگەر خانمێك لەهەمان ئـەو فـارگۆنی قیتارەدا كە لــە دواڕۆژدا لــە كوردسـتان دروسـتدەكرێ، لەگـەڵم سـوار بووبـێ و پێویستی بـەوە بێـت لــە شارۆچـكەكەی خـۆی دابـەزێ بـۆ ئـەوەی زوو بەدیـداری خۆشەویستەكەی شادبێتەوە، كاتێ بەخۆی دەزانـێ حـەوت وێسـتگە تێپـەڕیوەو ئـەو هێشتا نەیزانیوە چۆن لەگەڵ پیرەمێردێكی كورتەبنەدا لـە قسانەوە گلاوە، كـە ئـەوەی دەیلێ نایلێتەوە.. دەزانم پیریی من لـەگەڵ ئەوەدا كە زۆربڵێییەتیم لێدەسـتێنێتەوە، پـڕ پڕم دەكات لـە گوێگرتن و گوێڕادێران. هـەر ئێسـتاكەش تـەواو هەسـتبەوە دەكـەم، بەتایبەتی كاتێ كە دنیا كپ دەبێ و هەموو دەخەون و كەسێ نامێنـێ قسـانی لـەگـەڵ بكەم، سەراپا دەبمە گـوێگرتن: گـوێگرتن لــە هەناسـەی كۆترەباریكـە، لــە نـووزەی پشیلەكان و ڕۆیشتنی گەڵایەكی پاییزی بەدەم شنەی باوە. پەیمان نادەم لــە داهـاتوودا هەر كاتێ گوێدەگرم، بەمانای ئەوەیە لـە هەموو شتەكان تێگەیشتووم و وەنەوز نادەم. چونكە من پیر دەبم و مەرجیش نییە لـە پیریدا مرۆڤ لــە هـەموو شـتێ تێبگـات، بـەڵام گوێدەگرێ.. پیریی مـن زۆر خۆشـتر نابـێ لــە ڕۆژگـاری ئێسـتا و گـەنجێتیم، وەلـێ ئەوكاتەش بڕوام بەوە قاییمە كە مرۆڤ دەبێ بۆخۆی ڕۆژەكانی خۆی خۆش بكات. بەم مانایەش من پیرێكی خەمۆك دەرناچـم، ئەگەرچـی سـیما و ڕووخسـارم خەمۆكانـەش بنوێنێ. جا ئەگەر ئەوكاتە منت بینییەوە، بەسە یەكدوو قسـەم لەگـەڵ بكـەیت و لــە

هۆكاری خەمۆكییەكەم بپرسیت، دوایئەوە دەبمەوە بەخۆم و دەتهێنمەوە ناو جیهانی پڕ لە پێكەنین و قسەی خۆش.. هەڵبەت من نازانم لەو ڕۆژگارەدا قسەی خۆشكردن باوی دەمێنێ یان نەء ، وەلێ كەی من گوێدەدەمە باوی ڕۆژگار؟ شتێكم لێئاشكرایە: لە پیریمدا كەمێ دەكۆمێمەوە و چاوەكانیشم بە حەدێ كز دەبن، كە لە كافتریایەكی سەر چیای (گارا)، لەبەرامبەر ڕەواندووز، دانیشتبم و گۆرەوی دوو ڕەنگم لەپێدا بێت و زنجیری پانتۆڵەكەشم كراوەبێت و بەخۆمم نەزانیبێ!! ساڵەهایە دایكم پێمدەڵێ: (*كوڕم ئەوەندە سەرت بەسەر ئەو كتێبە شڕانەدا شۆڕمەكەوە، با پشتت نەكۆمێتەوە*). بەڵام بڕوای تەواوم بەوە هەیە تا دەمرم لەسەر گازی پشت دەخەوم! خۆشە مرۆڤ كاتێ دەمرێ باوەشی پڕبێ لە شینایی ئاسمان و وردەئەستێرە و لەشی گەرمی ژن.. پەیمانت پێدەدەم تا ڕۆحدەرچوونیشم، چاوەكانم بریسكەیان تێدا نەكوژێتەوە و ددانەكانیشم هەر بە سپێتی دەمێننەوە، ئەگەرچی نازانم تا ئەوكاتە ژمارەیان چەند دەبێ.. لوتم گۆڕانێكی سەیری بەسەردا دێ.. من ساڵەهابوو لەگەڵ لوتی خۆمدا لە ململانێدا بووم و چەندین ڕۆژم لە ناو ئاودەستی مزگەوت و قووژبنی ژوورەكاندا لەگەڵ لەتە ئاوێنەیەك بەسەر بردووە تاكو لوتی خۆم چاك بكەم و كورتی بكەمەوە.. كەچی لە ناوەڕاستی بیستەكانی تەمەنمدا، جارێك خانمێك لەكاتی باوەش پێداكردنمدا، بەسەری پەنجەی دۆشاومژەی كە نینۆكێكی درێژی پێوە بوو، چاكەیەكی زۆر گەورەی لەگەڵ كردم: نینۆكەكەی لەناوەڕاستی نێوان هەردوو برۆكانمەوە بە هێواشی بەسەر لوتمدا هێنایە خوار و كە گەیشتە تیژایی لوتم، گوتی: (*من زۆر ئەم لوتە باریكەتم خۆشدەوێ، چونكە لە لوتی پادشایەكی پیر دەچێ..*)! ئەمە جوانترین ڕستە بوو دەمویست گوێم لێی بێت و لەسەر لوتی خۆم بیستبێتم و ئیتر بڕای بڕ لەوەدوا لەگەڵ لوتمدا كێشەم نەما، ئەگەرچی لەدواییدا تێنەگەیشتم لەوەی بۆچی دەبێت مرۆڤ لوتی لە لوتی (پادشایەكی پیر) بچێت بۆئەوەی خۆشەویست بێت!؟.. بەڵام لەوە تێگەیشتم كە خۆشەویستی ئەو خانمە سەرەتا خۆشەویستی بوو بۆ

پادشایەکی پیر، نەك بۆ من.. لەگەڵ ئەوەشدا هەستدەکەم لە پیریمدا قسەی ئەو خانمە دێتە دی و لوتم ئەوەندە باریك دەبێتەوە، ڕەنگی پەنجەی ئەو دەگرێ..

## پیری و خواردن:

لە پیریماندا گۆڕانێکی تەواو بەسەر ژەمەکانی خواردنماندا دێت.. ئەمە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو ئەوانەیە کە ئێستا گەنجن و هەموو ئەوانەی لە ئێستا و دوا ڕۆژدا پیرن و پیر دەبن. سەبارەت بەخۆم، دڵنیام خواردنم کەمدەبێتەوە و هەندی خواردن هەیە بەتەواوی لێیان دوور دەکەومەوە. وەلێ خواردنێك هەیە هەرگیز تەرکی ناکەم، هەروەکوچۆن هیچ پیرێك ناتوانێ بڵێ نایخۆم.. ئەمە ئەو خواردنەیە کە هەموو مرۆڤێك لە کۆتاییدا دەباتەوە سەر تەریقەتی پیری و ئەمەش هەمان خواردنە کە منداڵی و پیری پێکەوە دەبەستێتەوە. دڵنیام تۆش لەدوای خوێندنەوەی ئەم زنجیرەیە بڕیاری دروستکردنی دەدەیت، ئەگەرچی مەرج نییە پیریش بوویبیت..

## پلاو و فڕوجاو، یان پلاو و گۆشت کەڵەشێر:

هەرچی دەڵێم، ئاوا بکە و هیچی لێمەگۆڕە. یەکەمجار دەبێ دوو قابلەمەت هەبێ. یەکەمیان بۆ ئەوەی فڕووجەکە، یان کەڵەشێرەکەی تیادا بکوڵێنی و دوومیشیان بۆ پلاوەکە. کولاندنی فڕووج یان کەڵەشێرێکی کەڵەگەت، شتێکی ئەوتۆی ناوێ. سەرە باڵەکانی و قاچ و کەمێ لە پێستەکەی لێکەوە و جوان بیشۆرەوە. بە ملەقۆرتە و جەرگ و دڵ و پشتەقوونەوە، بیخەرە قابلەمەکەوە و ئاگرێکی کزی بۆ بکەوە. نە ئاوی تێبکە و نە خوێ و داوودەرمان. هەر بەوجۆرەی کە خودا دروستیکردووە، لێیگەڕێ با وردەوردە بکوڵێ. پاشان کە زانیت ئاوەکەی خۆی وشکی کردووە، پیازێکی گەورە پاك بکە و چوارقاشی بکە بەبێ ئەوەی لێکیان بکەیتەوە و بیخەرە ناوییەوە و خوێی تێبکە و نیوەی بکە لە ئاوی کوڵهاتوو. جگە لە خوێ، هیچ شتێکی دیکەی تێناکەیت..

لەملاوە قابلەمەکەی تر نیوە بکە لە ئاوی سارد، ئاگری بخەرە ژێر و کەوچکێ ڕۆنی تێکەڵ بکە و مشتێ خوێی بەسەردا بکە و تێکەڵی هەڵدە تا گەرمدەبێ. پێشئەوەی قوولْپ بدا، بەپێی پێویست ئەو برنجەی تێبکە کە دەتەوێ، بەڵام ئاگادار بە، بەگشتی برنجە درێژەکان بۆ پلاو باشتر دەست دەدەن، بەتایبەتی برنجی هیندی و بەسمەتی و مەڕ و هەڵۆ.. برنجەکە ناشۆیتەوە، بەڵام پێویستە بژاردبێت. لەگەڵ تێکردنی برنجەکەدا، دەستبکە بە تێکەڵهەڵدانی بەبەردەوامی و لەگەڵیشیدا گۆرانی بڵێ.. برنج لەکاتی کوڵاندا ئەگەر گۆرانی بۆ نەڵێیت، دوولەت دەبێ.. ئێستا سەری قابلەمەی فڕوجاوەکە هەڵدەوە، بەکەوچکێ تامی بکە و ئەگەر خوێی کەم بوو، کەمێکی تێکە و ئەگەر زیادیش بوو نەختێ ئاوی کوڵهاتووی تری تێبکە. وەرەوە سەر قابلەمەی برنجەکە و بەردەوامبە لە تێکەڵهەڵدانی. ئەگەر زانیت دەنکە برنجەکان تەواو ئاوەکەیان چەشتووە و کەمێ نەرم بوون، کاتی ئەوەیە لەسەر ئاگرەکە لایبەیت و برنجەکە برێژیتە ناو پلاوپالێوێك، یان سووزگییەکەوە. باشترین ڕێگا ئەوەیە لەناو پلاوپالێوەکەدا بە ئەندازەی نیومەتر قوماشی (توول)، یان تارای بووکت ڕاخستبێ.. دوایی ئەمەت بۆ ڕووندەکەمەوە. پاشان ئەو قابلەمەیەی برنجەکەت تێدا کوڵاندووە، بە دەستەسڕی کاغەزین بسڕەوە و ئاگرەکەی بۆ هەڵکەوە. یەکدوو کەوچك ڕۆنی تێبکە و لێگەڕێ ڕۆنەکە گەرم بێ. هاوکات نانێکی تیری، یان هەورامی کە پێشتر ئامادەت کردووە، لەناو مەنجەڵەکەدا ڕابخە و یەکسەر برنجەکەی تێبکەوە.

تێکردنی برنجەکە بەمشێوەیە دەبێت: سەرەتا گۆشەی ڕاستی تاراکە بهێنەرەوە سەر گۆشەی چەپ و پاشان لۆکانی دیکەی کۆبکەرەوە و لەسەر سوزگی، یان پلاوپالێوەکە هەڵیبگرە و بیکەرە ناو قابلەمەکەوە. لەم کاتەدا پێویستە دووعایەك هەیە بیکەیت: (*خودایە هەرکەس بۆنی ئەم پلاوەی کرد، هێندەی کشانی دەنکەکانی و کونی تارای بووك، مرازی حاسڵکەیت.*).. دوایئەوەش چەند کلۆیەك ڕۆنەکەرە، یان چەند کەوچکێ ڕۆنی ئاسایی بەسەردا برێژەو لێیگەڕێ پێیدا بتوێتەوە.  نە تێکەڵی هەڵدە و نە ڕۆنی بۆ بقرچێنە، چونکە تێکەڵهەڵدانەکە برنجەکە وورد دەکات و ڕۆنە

قرچاوەکەش دەیترسێنێ.. بەڵام دوائەوەی بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێ لەسەر ئاگرپژێنەکە دەمێنێتەوە، (ئاگرپژێن، ئەو پارچە فافۆنە کون وەردەیە کە لەژێر قابلەمەدا دادەنرێ بۆ کەمکردنەوەی تینی ئاگرەکە)، ئەمجا بەهێواشی، یان ئەوەتا قابلەمەکە کەمێ هەڵبڕە و ڕایوەشێنە، یاخود تێکەڵێکی هەڵبدە و سەرەکەی بنێرەوە تاکو پێنج خولەکی دیکە، بۆئەوەی دەمبکێشێ..

دەبێ ئێستا فڕوجاوەکە پێگەیشتبێ و بۆجاری دووەم تامێکی بکەرەوە و ئەگەر پێویستبوو، یەك تۆز بەهاراتی تێبکە و لەگەڵ دەمکێشانی پلاوەکەدا، ئەویش دابگرە، بەڵام سەرەکەی لەسەر هەڵمەگرە با بۆنەکەی نەڕوات.. چونکە ئەگەر بهێڵێن بۆنەکەی بڕوات، تام و حیکمەتی فڕووجەکەش لەگەڵ خۆی دەبات و دەفڕێ..

من پێمخۆشە دانانی خواردنەکە بەمجۆرە بێ: سەرەتا کەمێ ئاوی سارد بکەرە ژێر قابلەمەی پلاوەکە، بۆئەوەی ئەگەر نانەکە پیاسووتابێ، بەریدات. دوایی بەلەمێکی گەورەی خڕ بەسەر زاری قابلەمەکەدا نخوون بکەرەوە و بە دەستگرەیەك لێواری قابلەمەکە بگرە و بەسەرخۆیدا قلْپی بکەرەوە. بەمجۆرە هەموو پلاوەکە بەبێ هیچ جۆرە گووشارێك، دەچێتە ناو بەلەمەکەوە.. دەبینی نانەکە ئاڵ بووە و بووە بە بنکڕ.. ئەمجا بنکڕەکە لەسەر دەورییەکی تایبەت دابنێ و لە پلاوەکەی جیابکەرەوە. پاشان گۆشتی (فڕوج)، یان (کەڵەشێر)ەکە، دەربهێنە و بیخەرە قاپێکی قووڵەوە.. لە کۆندا هەموو ئاوەکەشیان دەکردە ناو هەمان قاپەوە. بەڵام لەو کاتەوە کە (لرفەلرفکردن) و (هەڵقوڕاندن) بووە بەشێ لە بەزمی سەر سفرەی چینەکانی خواروو، بۆرجوازییەت بۆ بەعەیبەپیشاندنی لرفەلرف و هەڵقوڕاندن و لە پێناوی پیشاندانی ئەوەی گوایە ئەو چینێکی (پاكوخاوێنە) و لەسەر نانخواردن (بێدەنگە) و هەمووان کەوچکەکانیان ناخەنەوە ناو هەمان قاپ، قاپی تایبەتی داهێنا. بەمجۆرەش ئەو فڕوجاوەی جاران لە یەك قاپدا دەخورا، لەسەر دەستی ئەو چینە (خاوێنە)، بۆ هەر کەس کرایە قاپی تایبەتەوە. لێرەشەوە بۆ یەکەمجار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، لەسەر دەستی چینی بۆرژوای شارنشینی ئەتەکیەت پەرست، (فڕووج) لە (ئاو) جیاکرایەوە و

بەمەش (فرووجاو) حیکمەتی خۆی لەدەستدا و چیدی وەکو دەرمان و چارەسەری نەخۆشان نەمایەوە. بۆیە ئەمرۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە لەهەرلا فرووج دەبینی و بەجۆرەها شێوە دەخرێتە بەردەمت، کەچی ژمارەی نەخۆشییەکان و نەخۆشەکان هەر لە زیادبوونایە، چونکە تازە بۆنەکەی ڕۆیشتووە و لەگەڵیشیدا تاماو و حیکمەتەکەی فڕیوە..

من هەوڵدەدەم لە زنجیرەی داهاتوودا بەدوایدا بچم و بیهێنمەوە، بەڵام نازانم بۆخۆم چییم بەسەردێ.. وەلێ ئەگەر ونبووم و درەنگ هاتمەوە، تۆ نانی خۆت بخۆ، ئەگەرچی دەزانم هەر چاوەڕێم دەکەیت و دەتەوێ پێکەوە نانەکەمان بخۆین..

# پێکەوەنانخواردن

***بەرەی یەکگرتووی باڵندانی هەرێم:***

لە وتاری پێشوودا، پەیمانم دابوێتێ بچم و بەدوای حیکمەتی فڕوجاودا بگەڕێم و گوتبووشم: (*ئەتۆ لەسەر من ڕامەوەستە و نانی خۆت بخۆ*)، ئەوەشم هەر لە دڵدا بوو کە تۆ بەبێ من نانت پێناخورێ و دەتەوێ چاوەڕێمکەیت تاکو پێکەوە نانەکەمان بخۆین.. بەڵام هەر زوو بۆم دەرکەوت لەمەدا بەهەڵەدا چووم، چونکە بیستم (شوان ئەحمەد) و (ستران عەبدوڵا)ی سەرنووسەری هەفتەنامەی (ئاسۆ)، ئەو دوو کەسەی داوایان لێکردم زنجیرەکانی (فەنتازیای خواردن)یان بە( ستوون) و بە دووسەدهەزاردینار بۆ بنووسم، هەر خێرا چووبوون سەرو کەڵەشێر بکڕن و بیکەنە فڕوجاو و بەتەنیا بیخۆن.. بەڵام هەواڵەکانی دوایی ئەوەیان ساخکردەوە کە کاکی سەرنووسەر پێشتر بە تەلەفۆنێ بەنیاز و بەهانەی دەعوەتکردنی من و ستافەکەی، هەموو کەڵەشێرەکانی (حیجز) کردوون و کاتێ شوان ئەحمەد دەگاتە مەیدانی مریشکفرۆشان، ناچار دەبێ فڕوجێ بکڕێ و بە عادەتی خۆی بیباتەوە ماڵ تاکو دایکی بۆی لێنێ و بۆخۆشی خەریکی تەرجەمەکردن بێت، چونکە ئەو تاقەتی قەڵەباڵغی نییە! ئەو فڕوج و بارە کەڵەشێرانەی ئەمەیان بۆ گێڕامەوە، لە خۆشییاندا شەوێ تا بەیانی نەخەوتبوون و کاتێ من گەیشتمە لایان، تاجێکی گوڵینەیان لەملکردم و کەڵەشێرێکی پۆپنەدرێژ بەناوی هەموانەوە دواو دانی بەوەدا نا، کە: (*لەدوای شاڵاوی قەلاچۆکردنی مریشک و فڕندەکانی وڵات، ئەوە یەکەمجار بووە مەیدانی*

*باڵندان ئەوەندە جمەی بێت و ئەوانیش ئەمە دەگێڕنەوە بۆ کاریگەریی زنجیرەی ڕابردوو کە تیایدا داوام لە مەردم کردبوو، بگەڕێنەوە سەر خواردنی فڕوجاو..).*

کاتێ کەڵەباب لە قسەکانیدا، گەیشتە ئێرە، هەموو ئەو حەشاماتی مریشک و قەل و ڕەشیشە و کۆتر و چۆلەکەیە، دایانە قرمە و قاسپە و جیکە و گارە و قرتەقرت و باڵەتەپە و لە شوێنی خۆیانەوە پەڕ و هێلکە و لەتە دەنووکیان بۆدەهاویشتم و ماچیان بۆ بەڕێدەکردم.. کەڵەشێرەکە ئەوەشی گوت: کە سەرکردایەتی مەخلوقاتی باڵندانی وڵات، ڕایگەیاندووە، ئەوان: (*بەهای خۆیان لەوەدا دەبینن ببنە هۆی کۆکردنەوەی مەردم لەسەر سفرە و سینی و سەرمێزان برازێننەوە، نەك وەکو ئێستا لە چێشتخانەکاندا، هەر کەسە و لە گۆشەیەکدا و بەتەنیا مریشکێکی بۆ دابنرێ. چونکە مریشك و فڕندەکان بڕوایان وایە کاتێ بەتەنیا دەخورێن، بێڕێزییەکی زۆریان پێکراوە و ئەوان بۆیە ئامادەن خۆیان بەدەستەوە بدەن، تاکو دوو پێیەکان بتوانن پێکەوە بیانخۆن..*). لەولاوە مریشکێکی هێلکەکەری بە ئەزموون هەڵیدایە و بەگارەگار ڕووی لە حەشاماتەکە کردو گوتی: (*بۆ ئەوانەی وادەزانن ئێمەی مریشك لە حەزی خۆمانەوەیە بۆ ئازاری قوونێمان، ئەوەندە هێلکان دەکەین، زۆر بەهەڵە تێگەیشتوون. هۆکاری ئەوەی ئەمن ڕۆژی هێلکەیەك و دووان دەکەم و لەسەریان کڕ دەکەوم و دەیانکەمە جوجك و تا کەچەڵەش دەبن، بەدیاریانەوەم، ئەوەیە کە ئەو دوو پێیانە تۆزقاڵێ بەخۆیاندا بچنەوە و هیچ نەبێ لەسەر نانخواردنەکەیان پێکەوە بن و لە تەفرەقە و خۆپەرستی بەدوور بن..*). کەڵەشێرەکە خێرا قسەکانی مریشکی پەسەند کردن و دەنێو حەشاماتی باڵندانەوە بۆوە هەڵڵا.. لەم کاتەشدا، بارەکەوێك لە دوورەوە قاسپاندی: (*ئێمە قەبووڵمانە خۆمان بکەینە قوربانیی و ژەمی ئەو دووپێ ڕاوچییانە برازێنینەوە، دەبا ئەوانیش دەست لە لووتبەرزی هەڵبگرن و هیچ نەبێ لەبەر خاتری ڕۆحی فڕیوی باڵندان پێکەوە نانەکەیان بخۆن..*). بووە چەپڵەڕێزان و دەنووك بەیەکدادان و باڵهێنانەوە یەك.. لەولاترەوە، عەلیشیشێك بە فیزێکەوە و بە زاراوەی سلێمانی، ڕوویکردە من و گوتی: (بەڕێزگیان: نازانم تۆ ئەزانی یان نا، بەڵام

*ڕۆژگارێ بوو ئێمەومانان سفرەی پاشا و میواندۆستانمان دەڕازانەوە و بەختەوەر بووین، چونکە ئەوانەی دەیانخواردین، تا دوا پاروو پێکەوەبوون و وەك ئێستا نەبوو هەر کەسەی سەر بە تەکەتوولێ ڕوو لە دیوارێ بکا و خەریکی خواردنی گۆشتەکەمان بێ..)*. وادیاربوو قسەکانی عەلیشیش کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لەسەر فڕندەکان، هەر بۆیەش پەڕەسێلکەیەك بە نازی دەنگە ناسکەکەیەوە، ڕوخسەتی لە ئامادەبووان خواست و مایکرۆفۆنەکەی لە کەڵەشێرەکە وەرگرت و گوتی: (ببوورن هاوڕێیان: ئێمە ئامادەین لەبەر گوێسوانەی ماڵاندا ڕەقببینەوە و نەبینە ژەمی کەسێ کە دەیەوێ بە تەنیا بمانخوات..). (سوێند بە خودای فڕین، منداربوونەوە خۆشترە وەك لەوەی لەسەر بەلەمێك بە سوورکراوەیی بۆ تاقە نەفەرێ داندرابی..).

ئەمەیان دەنگی قازێ بوو کە بەپەلە لە چۆمێ هاتبووە دەر و هێشتا ئاوی لێدەچۆڕا..

هەموو گوتیان: (ئەدی ڕاستەکا) و مراوییەکان کە دیتیان هەموو فڕندەکانیتر پەسەندی قسەی قازیان دا، مووچڕکەیەك بەسەراپای لەشیاندا هات، لەخۆشیان خۆیان ڕاپسکاند و پڕژنگی باڵەکانیان سەرووچاومیان تەڕکرد.. هەڵلا بەردەوام بوو..

بە کورتی و کرمانجی، لەو سەفەرەمدا بۆم دەرکەوت ئەو مریشك و قەل و مراوی و قاز و کەڵەشێرانەی لە شالاوی قەلاچۆکردنی باڵندان ڕزگاریان بووە، بۆخۆیان بەرەیەکیان پێکهێناوە بەناوی (***بەرەی یەکگرتووی باڵندانی هەرێم***) و نیازیان هەیە بەهۆی ڕێکخستنەکانی ناوشارەوە، کە لە زۆرینەی فروج و مریشك و کەڵەشێر و کۆترباز و قەلخۆرانی وڵات، بەتایبەتی ئەوانەیان هیچ پۆستێکی سیادییان نییە، پێکهاتوون، دەست بە چالاکییەکانیان بکەنەوە.. درووشمی هەرە سەرەکی ئەو بەرەیە بریتیە لە (*قوربانیدان لەپێناوی پێکەوەنانخواردن*)دا و دەیانەوێ مرۆڤە گۆشتخۆرەکان بگەڕێنەوە بۆسەر سینی و نانەشانە و خواردنی پێکەوەیی و، نانخواردن بریتییێ لە کەشێك بۆ کۆکردنەوەی کەسەکان لەسەر یەك سفرەو نانێن..

ئێواره داهات و له گه‌ڕانه‌وه‌مدا قه‌له‌باچکه‌یه‌ك هاته سه‌ر ڕێگاکه‌م و دوای که‌مێ قاووقیژ و باڵه‌فڕێ، له‌سه‌ر لقی پیره‌دارێك نیشته‌وه و قیڕاندی: (*به عه‌قڵی ئه‌و باڵندانه بیر مه‌که‌ره‌وه و هیچ ئومێدت به‌وه نه‌بێ مرۆیه‌کان تازه پێکه‌وه نانه‌که‌یان بخۆن.. من له سه‌رده‌می هابیل و قابیله‌وه ده‌یانناسم.. لێیانگه‌ڕێ هه‌رئاوا دووره‌په‌رێز و ته‌نیابن و سه‌د فرۆجاویشیان بۆلێبنێی تازه کاریان لێناکات.. ئه‌وان بیریان چۆته‌وه یه‌که‌مین نانخواردن، پێکه‌وه‌خواردن بووه..*). قه‌له‌باچکه‌که‌م به‌جۆرێ پشتگوێ خست وه‌کئه‌وه‌ی هیچ گوێم لێنه‌گرتووه، وه‌لێ قسه‌کانی زۆریان ترساندم.. هه‌رچه‌نده له‌ملاتر، ڕیزێ خاوه‌ن ده‌واجنم بینی و دڵیان زۆر به به‌ره‌ی یه‌کگرتووی باڵندان خۆش ببوو، به‌ڵام نه‌متوانی چاو له‌و ڕاستییه تاڵه بپۆشم که له قیڕه‌ی قه‌له‌ڕه‌شه‌که‌دا گوێبیستی بووم..

### یه‌که‌مین نانخواردن: پێکه‌وه‌خواردنه..

قه‌له‌باچکه ڕاستده‌کات: هه‌تا خه‌یاڵ بڕکات و به‌ڵگه مێژووییه‌کان یارمه‌تیمان بده‌ن، ده‌توانین به دڵنیاییه‌وه بڵێین کۆنترین دیارده‌ی خواردن، (پێکه‌وه‌خواردنه). ته‌نانه‌ت ئاده‌م و حه‌واش به‌رله‌وه‌ی له به‌هه‌شت ده‌ربکرێن، پێکه‌وه له میوه قه‌ده‌غه کراوه‌یه‌که‌یان خوارد.. هه‌ڵبه‌ت من ناڵێم کامیان له پێشه‌وه و کامیان دووه‌مجار ئه‌و کاره‌یان کرد، وه‌لێ هه‌رکه‌سێ بڕوای به‌و ڕیوایه‌ته هه‌بێ ناتوانێ خۆی له‌و ڕاستییه بدزێته‌وه، که ئه‌وان پێکه‌وه میوه‌ی قه‌ده‌کراویان خوارد، یه‌که‌م سزا بۆ مرۆڤ له‌سه‌ر ئه‌و پێکه‌وه خواردنه بوو، بۆیه پێکه‌وه خواردن یه‌که‌مین دیارده و فۆڕمی خواردنه.. به‌مجۆره‌ش ئه‌گه‌ر نانخواردن تامێکی هه‌بێ، هی ئه‌وه‌یه که له‌گه‌ڵ که‌سانی دیکه بیخۆیت و به‌ته‌نیا خواردن تام و چێژی نییه و ئه‌وانه‌ی ناچارن به‌ته‌نیا نانبخۆن، گله‌یی له‌وه ده‌که‌ن که هیچیان پێناخورێ و ئیشتیهایان نایبات.. که‌واته ده‌توانین خواردنیش بکه‌ینه به‌ڵگه‌یه‌کی دیکه‌ی قسه‌ی ئه‌و فه‌یله‌سووفه‌ی که گوتبووی: مرۆڤ بوونه‌وه‌رێکی کۆمه‌ڵایه‌تییه. مرۆڤ بوونه‌وه‌رێکی به سرووشت کۆمه‌ڵایه‌تییه، چونکه

تەنانەت ناتوانێ بەتەنیاش نان بخوات و نانخواردن بەرلەوەی هەر شتێکی دیکە بێت، کەشێکی کۆمەڵایەتییە کە تیایدا مرۆیەکان کۆدەبنەوە، ڕێکدەکەون و چێژ لەوە دەبینن کە پێکەوە نانبخۆن..

ئەو ڕاوچییە سەرەتاییەی کە چەندین هەزار ساڵ بەر لەئێستا بەخۆی و چەکە سەرەتاییەکانییەوە ڕووبەڕووی دڕندان دەبۆوە و نێچیرەکانی ڕاودەکردن، هەر لەبەر ئەوە نەبوو کە خۆی تێر بکات و لە پێناوی تێرکردنی زگی خۆیدا ڕووبەڕووی ئەو هەموو مەترسیانە ببێتەوە، بەڵکو ئەوە (غەریزەی کۆمەڵایەتی) بوو پاڵی پێوە دەنا ئەوکارە بکات و لە هەوڵی تێرکردنی زگی کۆمەڵگەکەیدا بوو.. بەم پێیەش چێژی یەکەمی خواردن و ڕاوکردن بۆ ئەو لەوەدا نەبووە کە دوای گرتنی نێچیرەکەی ئاگرێ بکاتەوە و بکەوێتە گۆشتبرژاندن، بەڵکو چێژی بنەمایی لەوەدا بووە کە بەهۆی هێنانەوەی نێچیرەکەیەوە بۆ ناو هۆزەکەی، کەشێکی کۆمەڵایەتی دروستبکات. من قسە لەوە ناکەم کە خودی ئەم کەشە کۆمەڵایەتییە هەوڵدانێکی باوکسالارانە بووە بۆ مەحکەمکردنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەوانیتردا و خۆپیشاندانی وەك ڕاوچییەکی کارامە، کە ئەوانیتر پێویستییان پێیەتی، بەڵام خۆ کۆمەڵناسی و عەقڵ و بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتیش هیچ وەختێ نەیانتوانیوە لە بیرکردنەوە لە کۆمەڵگای نێرسالاری و باوکسەنتەری تێپەڕێنن، لەساڵانی کۆتایی سەدەی بیستەمدا نەبێ..

بەهەرحاڵ، پێکەوەنانخواردن دیاردەیەکی زۆر سەرەتاییانەی نانخواردنە لە نێوان مرۆیەکاندا و مێژووی مرۆڤ لە پێش ئەم دیاردەیەدا ئەوەندە ڕوون نیە. مرۆڤ لەسەر تەختەبەرد و لەگەن و نانەشانە و تەشت و سینی و سفرە و مێزی نانخواردن لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەدایکبووە و پێکەوەنانخواردن ئاشکراکەری غەریزەیەکی بنەمایی کۆمەڵایەتیانەیە لەلای مرۆڤ.. هەرچەندە وا باوە پادشا کاتێ زویر دەبێ، بەتەنیا نانبخوات، وەلێ (بەتەنیا لەگەڵ سەگەکەی)، نەك لەگەڵ مرۆڤەکانیتر..

**پێکەوەنانخواردن، بەمانای *پێکەوەبوون*:**

لە خەیاڵگەی کۆمەڵگای پیاوسالاریدا (پێکەوەنانخواردن) دەستکەوت و ئیمتیازێکە و گێڕانەوەی ئەوەی لەگەڵ (کێ) نانتخواردووە، شانازییە و دەبێتەهۆی زۆربوونی دەسەڵاتی گێڕەرەوە لەناو گوێگرەکانیدا. هیچ گێڕانەوەیەکیش بەبێ زیادوکەمکردن مەیسەر نابێ.. بەڵام گێڕانەوەی ئەوەی لەگەڵ کێ و لە تەنیشت کێوە لە فڵان بۆنەدا نانتخوارد، هەمیشە گێڕانەوەیەکی بۆزیادکراوە. لە کۆندا دەگوترا: (پادشا بەدەستی خۆی پلێ گۆشتی بۆ دانام)، (هەتا ئێمە دەستمان بە نانخواردن نەکرد، خان دەستی بۆ هیچ نەبرد.)، (فلانیی، فەرمووی لەبەر خاتری من ئەم پارووەش بخۆ..)، ئەوانەی لەگەڵ مام جەلالدا نانیانخواردووە، لە گێڕانەوەکانیاندا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە *مام* بەدەستی خۆی پارچەیەك گۆشتی بۆ لێکردوونەتەوە و لەسەر دەورییەکەی دایناوە.. هەرئەوەندەش نا، بەڵکو ئەوەش کە ئەو کوتەگۆشتەی لەبەردەمی گێڕەرەوەدا داندراوە، چ بەشێکە لە لاشەی ئاژەڵ و فڕندەکان، گرنگیی تایبەت بەخۆی هەیە: هەموومان ئەوە دەزانین بەپێی ئەو پلەبەندییە کۆمەڵایەتیەی کە لە کۆمەڵگا تەقلیدیەکاندا باوە، ئێسقانەکان بەشی سەگ و پشیلانن، بەرماوەخۆرەکان کەمێ لە سەرووی ئەمانەوەن، قوونەجۆڵە و ملەقۆرتە بۆ ئەوانەی لە خواری خوارەوە دادەنیشن، باڵەکان، ڕانەکان و سنگ بۆ میوانە ڕاستەقینەکانن.. بۆیە گێڕەرەوە هەر بەوەوە ناوەستێ کە لەگەڵ کێ و لە تەنیشت کامە کەسایەتییەوە دانیشتووە، بەڵکو ئەوەی کە چی دەرخوارد دراوە، بەشێکی گرنگە لەو پرستیژە (هەیبەتەی) کە پێکەوەخواردن دەیبەخشێ.. لەگەڵ کێدا نانخواردن، نەك هەر بەمانای پێکەوەخواردن دێ، بەڵکو بەواتای لەئاستی کۆمەڵایەتی و کەسایەتیدا، (چوونە ڕیز)ی ئەوکەسەوە، بوون (بە هاوشان) و (هاودەسەڵات)ی ئەو کەسەش.. بگرە زۆرجار، پێکەوەنانخواردن یەکسان دەبێتەوە بەوەی کە میواندار و خانەخوێ، دەست لە دەسەڵاتی خۆی هەڵبگرێ و بیدات بە میوانەکەی، ئەمەش بەهۆی ئەوەی (بیخاتە

پشتخۆیەوە)، (بەشی خۆی بداتێ)، (خواردنەکانی لەدەورە کۆبکاتەوە)، (فەرمووی گەرموگوور)ی لێبکات، داوای (سنگ و ڕان)ی بۆ بکات و هتد..).

ئێستا با کەمێ لە بۆنەکان بچینە دەرەوە و لە ئاستێکی کۆمەڵایەتی سادەی کوردەواریانەدا کەمێ بچینە دواوە و باسی نانخواردنێك بکەین. سینییەك بهێنەرە پێشچاوی خۆت کە خواردنی دوو کەسی لەسەر داندراوە. گریمان خواردنەکە، خواردنی ژەمێکی ئاسایی بێت، یان بانگهێشتنێکی کوردەواریانە، یاخود خواردنی زەماوەند و تەعزیە و مەولوویی، یان سوڵحی عەشایەری: (گۆشتی سوور، مریشك لەگەڵ برنج و شلەی فاسۆلیا، لۆبیا یانژی بامیە). سەرەتا سینیە جوان و بێگرێ و گۆڵەکان دەبرێنە لای سەرەوە، بۆ ئەوانەی بەپێی پێناسەیەکی کۆمەڵایەتی پلەوپایەی خۆیانیان هەیە. پاشان سینییە قووپاوەکان و لەدوای ئەوانیش نانەشانە و هتد لەبەردەم میوانەکاندا ڕیز دەکرێن و دواجار هەندێ کەس دەمێننەوەو جارێ نان ناخۆن. میوانەکان پێگەی خۆیان لە شوێنی نانخواردنەکەدا هەیە. گرنگە بەپێی ئەو پێگەیەی پێدراوە، شوێنی خۆت بپارێزی ئەوەی شوێنگۆڕکێ بکات، ڕیسکێکی گەورە دەکات، چونکە بۆی هەیە دەنگ بدرێ و دیسانەوە شوێنەکەی پێبگۆڕن، بۆی هەیە بچێتە لای کەسێکەوە پێگە کۆمەڵایەتیەکەی ڕێگەی پێنەدات: بۆی هەیە ئەوەی بە کاسەلێسی و خۆبردنەپێشەوە بۆ حساب بکرێ، بۆی هەیە بەرامبەرەکەی نەیەوێ نانی لەگەڵ بخوات و بۆی هەیە بەوکارەی لە پلە و مەقامی کەسایەتی خۆی بهێنێتە خوارەوە و هتد.. هەروەك چۆن چوونە لای کەسێکی ترەوە بۆ نانخواردن، لە ئاستی پێگەی کۆمەڵایەتیدا ڕیسکێکە، ئاواش لە ئاستی پراکتیکیدا ڕیسکێکی گەورەیە: بۆی هەیە ئێمە شەرمن و ئەوەی دەچینە لایەوە پڕ ڕوو بێت، بۆی هەیە ئێمە کەمهەڵپە و ئەویتر بە هەڵپەبێت. بۆی هەیە ئێمە سەبرخۆر و ئەویدی پەلەخۆر بێت، بۆی هەیە ئێمە دەستکورت و ئەویدی دەستدرێژ بێت، بۆی هەیە ئێمە درەنگ دەستهەڵگرین و ئەویدی زوو..

خەیاڵگـەی مرۆڤـی تەقلیـدی پـڕە لـەو یادوەریانـەی کـە لەسـەر سـینی و فـەزای پێکەوەنانخواردنەوە هاتوون. لەو خەیاڵگەیەدا چەندین مرۆڤ، (بـەمانای نێرینـە) هـەن، نایانەوێ چیدی لە تەنیشت یەکترەوە دابنیشن و پێکەوە نـان بخـۆن. ئـەوەی یـەکجار لەسەر سفرە غەدرمان لێـدەکات و خێـرا گۆشـتەکە دەخـوات و حسـاب بـۆ ئێمـە ناکات، جارێکی دیکە ناچینە لایەوە.. بـەم پێیـەش پێکـەوەنانخواردن لـە کۆمـەڵگای تەقلیدیدا، سیمایەکی دیکەی تەقلیدیەتی کۆمەڵگایە و بکەرە کۆمەڵایەتیەکان گشـت ململانێ و کارلێکە کۆمەڵایەتیەکان لەگەڵ خۆیاندا دەبەنە سەر سـینی و نانەشـانە و سەر سفرە.. بەڵام لە هـەمان کاتـدا، پێکـەوەنانخواردن پێویسـتییەکی کۆمەڵایەتییـە و تیایدا مرۆڤەکان هەلی ***پێکـەوەبوونیان*** بـۆ دەرەخسـێ و لێرەشـەوە سـتراتیژی ژیـانی کۆمەڵایەتیانەی خۆیـان، پەیوەندیـەکانیان، ڕادەی گـەرموگوڕییان لـەگـەڵ یـەکتر و پێناسەی هاوبەشیان بـۆ (دووژمـن)ــە هاوبەشـەکانیان چـێدەکەن. پێکـەوەنانخواردن بەشێکیشە لە پتەوکەری چنینە کۆمەڵایەتیەکان و بەهێزکەری متمانەی بخۆرانیشـە بـە یەکتر.. ئـەمجۆرەی نـانخواردن بەشێکیشـە لـەو (خۆشـگوزەرانیە)ی کـە کۆمـەڵگای تەقلیـدی دوای کـارکردن، بـۆ ئەندامـە هەمیشـەیی و کاتییـەکانی: (میوانـەکان، ڕێبوارەکان، مەئموورەکان و هتد)، خۆی دابینی دەکات.. لە هەموو ئەمانەوە دەگەینە ئەوەی کە پێکەوەنانخواردن لە کۆمەڵگا پێش مۆدێرنەکاندا، بەمانای (تەبایی) نایـەت، هێندەی ئەوەی بەمانای (هەڵکردن) دێت. پێکەوەنانخواردن واتە ئـەو کەشـوهەوایەی کە تیایدا ئەکتەرە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر سینی و سفرە کۆدەبنەوە بـەبێ ئـەوەی بـۆ هەمیشە ململانێ و کێشەکانی نێوانیان کۆتایی پێهاتبێـت و بـەبێ ئـەوەی ئـەوەی لـە ئاستی یەکتردا لە (دڵیان)دایە، بەیەکتری بڵـێن.. پێکـەوەنانخواردن نمونەیـەکی ژیـانی پێکەوەیی کۆمەڵایەتیانەی ناو کۆمەڵگا تەقلیدیەکانە، کە تیایدا بکەرەکان لە پێگـەی کۆمەڵایەتی خۆیانەوە ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە و تیایـدا هـەموو دەنـگ و ڕەنگـێ، هەموو جووڵـەو بزاوتێکی لەش، مانای تایبەتی خۆیان هەیە..

**پێکەوەنانخواردن وەك نۆستالیژیا:**

ئێمەی کورد، وەك زۆرینەی ئەو مرۆیانـەی لـە کۆمـەڵگا هاوشـێوەکانی وەکئـەوەی ئێمەدا دەژین، نەریتی پێکەوەنانخواردنمان لەسەر زەوی و سینی و نانەشـانە و تەنانـەت سفرەش بەجێهێشتووە، بەڵام خودی خۆمان هـەمان مرۆڤـە تەقلیدیەکـەی جـارانین.. ئەمەش دەریدەخات دەستهەڵگرتن لـە نەریتەکان کـارێکی ئاسـان نییـە.. تەقلیدیـەتی ڕازاندنەوەی سادەی سـینی و سـفرەمان بەجێهێشـتووە، کەچـی هـەر وەك بکـەرێکی بخۆری تەقلیدی ماوینەتەوە. ئەمڕۆ لـە زۆرینەی بۆنەکانی وڵاتـی ئێمـەدا، ئـەوەی لـە دەوری کۆدەبینەوە سینی و سفرە نییە بەمانا کۆنەکەی، بەڵکو دانیشتنە لـەکەنار مێزی نانخواردن.. مێزی نانخواردن ئەو شوێنەیە کە ئێمە لـەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە، بـەڵام لەدەوری یەکترمان کۆناکاتەوە، بەڵکو لـەبەرامبەر و لـە کەنار یەکترەوە دامانـدەنێ و ئەگەر نـەمانتوانی لـەگـەڵ ئـەوەی کـەنار و بەرامبـەرمان هەڵبکـەین، زۆر بەئاسـانی شوێنەکەمان دەگوێزینـەوە.. وەکئـەوەی پێکـەوەنانخواردن چـیدی ناتوانـێ ڕایەڵـەی پەیوەندییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیمان پتەو بکات..

سەفەری ئێمە لـەو شوێنەوە کە تیایدا پێکەوە نانمان دەخوارد بۆ ئەو شوێنەی لـەکـەنار یەکتردا هەرکەسەمان نانی خـۆی دەخـوات، لــە خـواردنی سـەر سـینی و تەشـت و تاشەبەرد و نانەشانەوە بە چوارمەشـقی و هەڵتڕووشـکانەوە، بۆسـەر مێـز و دانیشـتن لـەسەر کورسی و بەپێوە ڕووکردنە دیوارێکی ڕەقوتەق،.. هەزاران ساڵی ویسـتووە. لـەوسەفەرەدا چۆنێتی نانخواردنی ئێمە گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتووە: قسـەکردن و لـەگەڵیدا پەڕینی دەنکە برنج و خواردن بۆ دەموچاوی یەکتر، کەمبۆتەوە. لـە بینگیران و خنکان و هەناسەبڕکێی بەپەلـە و ئێسقان لـە گـەروو گـیران، زۆر دەگمـەن بـوون. ئێمە ئێستا بێدەنگتر ناندەخۆین و زیاتر پاروەکانمان دەجـووین.. چـیدی بـە سـفرە و سینیی سادەی ڕازاوە قاییل نابین و لـەگەڵ دانیشتن لـەکەنار مێزەکـەدا، حـەوت جـۆر (پێشخوارن) و (موقەبیلات)مان بۆ دادەنرێ! ئێمە چـیدی وەکـو مـرۆی کۆمـەڵگای تەقلیدی لـەسەر سینی و سفرەی خواردن دانانیشین تاکو تێر بنین و پاشان بـە گـوتنی

(خوا زیایی کا)یەك، دەستهەڵبگرین، بەڵکو ئێمە زۆرجار بەتێری دەچینە کەنار مێـز و لەوێش هەر تەنیا داوای ئەو ڕێژەی خواردنە ناکەین کە حـەزمان لێیـەتی و پێـی تێـر دەخۆین، بەڵکو دەبێ لەژێر گوشاری (یاسا)ی مەتعەمـەکان و چـاوی چـاودێریکەری مشتەرییەکانی دیکە، داوای (نەفەرێکی تەواو) بکەین و کەمـداواکردن بـە نیشـانەی (ڕەزیل)ی لێکدەدرێتەوە..

ئادابی کەنار مێزی خواردن لە ئادابی سەر سینی و سفرە جیاوازترە: خواردنی جـارانی سەر سینی و سفرە پڕبوو لە زینـدوویی و ژیـان. کەسـەکان سـەریان دەنـا بەسـەری یـەکترەوە و لـەگـەڵ گلانـدنی هـەر پارووەیەکـدا تـەواو خۆیـان بەسـەر سـینییەکەدا شۆڕدەکردەوە و لـە کێبڕکێی ئەوەدا بوون کەسیان مەغدوور نەبێ.. چـاویان دەبڕییـە سینییەکەی کەناریان و پلانیان دادەڕشت بۆ خافڵاندنیان و دزینی گۆشتەکەیان، وریتە وریت و وردە تانە و بەتەقەخستن، بەشێکی گرنگی ئادابی سەر سینی و سـفرە بـوون. لستنەوەی ئێسك، ددان گیرکردن لـە گۆشت، مـژینی کرکڕاگـە و قرتانـدنی بـاڵ و لێکردنەوەی لاتەڕاف بە دەست، هەڵمژینی سەروپێ، شەقکردنی کەڵلـەپاچە و پەڕینی پڕژنگ و دواجاریش قرقێنەدانەوە، لە شتە هەرە سرووشتییەکان بوون. پـەلاماردان و دەوری گۆڕینەوە، لوتە کەوچك وەشاندن و دانانی ئێسقان لـەسەر دەوریـی بـەردەمی کەسانی دیکە و بردنی گۆشتەکەیان، شتێکی ئاسایی بوو.. سـەرقاڵکردنی بەرامبـەر و فرسەتهێنان لـەبەشەکەی، مەهارەتێکی بخۆرە نەوسنەکان بوو. پارووگلاندن لـە هـەموو کەس نەدەهات، بەڵام ئەوەی پارووی دەگلانـد، کـەم کـەس دەیـوێرا نـانی لـەگـەڵ بخوات.. (نەوسنی و هەڵپە و لرفەکردن و ملچـەملچ و ئـاخ‌وئۆف هەڵکێشـان) بـۆ بەشە خۆراکی ئەوانیتر، بەشێکی جیانەکراوەی قۆشمەخۆران بوو.. قسەکردن زۆربوو، ئاوخواردنەوە و ماستاو و دۆخواردنەوەش دەکەوتنە کۆتایی. زەڵاتەی خەیار و تەماتـە لەم دواییانەدا پەیدابوون، دۆغرەمە و تەپوولە تایبەتبوون بە عـارەقخۆران و ئـەوانیش نەدەهاتنە سەر سفرە و کەسیش ئامادە نەبوو لـەسەر سینییەك و لـەگەڵ عارەقخۆرێـك نـان بخـوات! پیـاز (بـە تـەڕی و بـە سـەلك) هـەرگیز سـینی و سـفرەی تەقلیـدیی

جێنەهێشتووە، بەڵام زەیتوون و بیبەر و سەوزەوات دیمەنی تازەی سەرسفرە بوون. ترشیات لە شارەکاندا زۆر دروستکراوە، توور و کەوەر مێژوویان کۆنە، وەلێ سووپ هەرگیز شتێ نەبووە لەسەر سینی و سفرەی تەقلیدی دابنرێ و ئەمانە دیاردەی نوێی تایبەتن بە شارەکان.. لەسەر سینی و سفرەی تەقلیدی، نانخۆر تەنیا خواردنە سەرەکییەکەی دەخوارد: گۆشت، برنج و شلە بە نانەوە..، بەڵام لەسەر مێزی خواردنی ئەمڕۆکە، ئامادەیی بەهێزی پێشخوارنەکان، زەڵاتە، ترشیات و زەیتوون، جۆرەکانی خواردنەوەی گازدار، جۆرەکانی سووپ، نانی ڕشکە و شمڵی و کونجی پیاکراو، هەموویان دەبنە هۆکاری ئەوەی بخۆر پێش خواردنی سەرەکی تێر بخوات. بۆیە ئەگەر دیققەت بدەیت، لە چێشتخانەکانی ئێمەدا بەرماوە و زبڵ زیاتر لە خواردنە سەرەکییەکان دروستدەبن، نەك لە پێشخوارنەکان و موقەبیلاتەکان.. دەنگەدەنگ و قرمە و هەرا لە چێشتخانەکانی ئێمەدا هەر ماوە، بەڵام تانەی دۆستانە، چنگ بردن بۆ خواردنی ئەوانیتر، بەتەقەخستن و قرقێنە و هەڵلووشینی ئێسقان و لستنەوەی، بەتەواوی کاڵبوونەتەوە و وەك ڕەفتاری پیسوچەپەڵ و ناشیانە تەماشایان دەکرێ.. بوونی ئێمە لەکەنار یەکتردا و لەبەرامبەر یەکتردا، تا سنووری ئیمکان دەبێ بەجۆرێ بێت یەکتری نەبینین و چاومان نەچێتە سەر یەکتر. ئەوەی بەرامبەرت ناندەخوات، نە دەیەوێ فەرمووت بکات، نەدەیەوێ تەماشایکەیت، نەدەیەوێ خۆییت تێبگەیەنێت.. ئەو دەیەوێ لەگەڵ خۆی بێت، بە تەنیا بێت و بەدوور لەهەر پابەندبوونێکی کۆمەڵایەتیانە. نانخواردنەکانی ئێمە چیدی پێکەوەخواردن نین و چیدی لەگەڵ یەکخواردنیش نین، بەڵکو خواردنن لە شوێنێکدا کە ناچارین بۆ تێربوون ڕوویان تێبکەین.. لە ئاستی خێزانیشدا، بارودۆخی سەر سفرە و کەنار مێز لە بارودۆخی چێشتخانەکان باشتر نییە: لە خێزاندا کەسانێك هەن هەرگیز لە کاتی خۆیدا نایەنە سەر سفرە و لەکەنار مێزەکەیان دانانیشن و ئەگەر زۆریشیان لێبکەین، دەتۆرێن و نانەکەیان ناخۆن! هەیانە یەکدوو پارو دەخوات و دەڕواتەوە ژووری خۆی، هەیە تاکو نانەکە سارد نەبێتەوە، نایەت. لەزۆرینەی ماڵەکاندا هەتاکو ئێستاش

بەوێنەی سەدەکانی ڕابردوو، تەقسی نانخواردن تەقسێکە لەڕووی ڕەگەزییەوە جیاکراوەتەوە: ئافرەت و پیا و پێکەوە نان *ناخۆن* و هەمیشەش پیاوەکان لەپێشدا نانیان بۆ دادەنرێ. کۆمەڵگای پیاوسالاری بە ئاسانی دەست لە پێگەکانی دەسەڵاتی خۆی هەڵناگرێ، سەر سفرەش پێگەیەکی دەسەڵاتمەندانەیە و مینبەرێکە بۆ نومایشدانی هێزوبازوو. بەم پێیەش عەقڵییەتی نێرسالار هەمیشە پێویستیی بەوە هەیە لەسەرسفرەش خۆی لە (بەرماوەخۆر)ەکان جیا بکاتەوە.. کەواتە خراپم نەگوت کە لەپێشدا نووسیم: ئێمە نەرێتی پێکەوەنانخواردنمان لەسەر زەوی و سینی و نانەشانە و تەنانەت سفرەش بەجێهێشتووە، بەڵام هەر مرۆڤە تەقلیدیەکەی جارانین.. هاتووینەتە کەنار مێز و ناو چێشتخانەی هووتێلە ئەستێرەدارەکان، چیدی قرقێنە نادەینەوە و دەست ناکەین بە دەمماندا بۆ ئەوەی ڕیشاڵە گۆشتەکەی نێوان ددانەکانمان دەربهێنین، زۆر بە ئەتەکیەتەوە نانەکەمان دەخۆین، قریوە و قسەکردن و پێکەنین و هەرا لەکاتی نانخواردندا، چیدی ڕەواجیان نەماوە، بە کەوچك و چەقۆ خواردنەکەمان دەبڕین و بە چەتاڵ دەیبەین بۆ دەممان، جاری وا هەیە لەنیوەی ڕێگا لێمان دەکەوێتە خوار و جاری وایش هەیە چەتاڵەکە دەکەین بە لووتماندا.. گرنگ ئەوەیە هەموو خۆراکێ بچێتە دەمەوە و لەوێدا بجوودرێ و لێوەکانمان توووند بهێنینەوە یەك، گووپ دەرپەڕاندن، پارووی زل، تەقەی کەوچك و چەتاڵ، لرفە و مڵچە و هەڵلووشین، هەموویان عەیبەن. ئاوڕدانەوە، فەرمووکردن و گوتنی ڕستەکانی وەك: (عافێت بێ و نۆشیی گیان و بیکەیتە گۆشت)، هەموویان یاساخن و یەکسەر دەمانکەنە لادێیی و لاولاو و شارنەدیو.. بەمجۆرەش بەبەراوورد بە سینی و سفرەی تەقلیدی، سەرمێزەکانی ئێمە پڕپڕن لە خۆراك و هەمەڕەنگن لە خواردندا، بەڵام ئەوەندەی لەسەر سینی و سفرەی تەقلیدی ئازادبووین، لەکەنار مێزی چێشتخانە مۆدێرنەکاندا ئازاد نین و خۆمان سانسۆر دەکەین.. چیدی پێکەوەنانخواردن سرووتێکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو ئەتەکیەتێکی بۆرژوایانەی شارنشینە، کە لە پێناوی ئەوەی ژەمێ نانت بداتێ، سەد قەیدوبەندو مەرجت بۆ دادەنێ، کە چۆن بیخۆیت جوانە، چۆن بیجوویت، چۆن،

دابنیشیت، چۆن خۆت کۆنترۆڵ بکەیت، لـە کـوێ و لـەسـەر کـام مێـز دابنیشـی و لەگەڵ کێ و هتد..

چەندخۆشە جارێکی دیکە پێکەوە نانبخۆین؟ چەندخۆشە لەسەر سینی و سفرە پێکەوە دابنیشینەوە و پێشئەوەی یەکێکمان دەستبەرێ بۆ ڕانەکە، ئەوەی دیکەمان لە مێشکی خۆیدا سەد پلان دابنێ بۆ پەشیمانکردنەوەی؟ بیری ئەو دەستە چەورە دەکەم کـە لـە پڕ بەپەنای گوێچکەتدا دێت و باڵـە مریشکێکت دەداتێ و تۆ هێشتا وەرتنەگرتووە، کە چووختییەکی نەوسن فڕاندوێتی بۆئـەوەی لەگـەڵت بیکـات بـە دوولـەتـەوە..؟ ئـەو کەوچکە چۆن بوەستێنم کە خۆی دەکـات بـە بنـی بەلـەمەکـەدا و هەرچـی گۆشـتی شاراوەیە دەیهێنێتە دەرێ؟ چۆن ئەو شەرمە بشکێنم و لە دوا پارووودا دەستبەرم بۆ ئەو پارچە جەرگەی لە ڕۆناوی بەلەمەکەدا بەتەنیا ماوەتەوە؟ بۆ عەیبـە بڵـێم: حـەزم لـە چەرمە؟ پشتەقوون چی کەمترە لە سنگ و لاتـەڕاف؟ هانـێ ئـەوە ڕانەکـە بـۆ تـۆ و ملەقۆرتەکەم بدەرێ.. پارووێ بەو پیازەوە کە لە ئێسقانە گۆشتێ ئالاوە، خۆشترە لە هەزار پارچە سنگ.. دەزانم ئاخرین پاروو دەمێنێ و کەس لەبەر ئەویتر نایخوات، بەڵام جورئەتی ئەوە لەکوێ بێنم، ئەو ئاخرین شفتەیەش بە قاشێ بیبەرەوە لوول دەم؟ چـەند خۆشە یەکی پێتبڵێ: وەرە با ئەو کەوچکە برنجە بکەینە دوو لـەت و بـەم تەماتەیـەوە بیخۆین؟ من کە دەمەوێ ماڵئاوایی بکەم، چۆن چێژی دوایـین پـاروو لـە بنـی ددانمـا گلدەمەوە؟!

# خواردنی ماڵئاوایی

**ماڵئاواییکردن:**

لە زۆرینەی کەلتوورەکاندا، ماڵئاواییکردن جۆرێکە لە هەستکردنێکی قووڵ بە جیابوونەوە و لێکدابڕان. لە کەلتووری کوردیدا، (هەرلەبەر ئەمەشە من ئەم میللەتەم ئەوەندە لەلا بەڕێزە)، ئەم بارودۆخە هەمیشە یەکسانە بە دڵگەرمبوون و گریان و شیوەنێکی بێوێنە بۆ فیراق.. کوردەکان هیچ کاتێ ئەوەندەی لە فیراق و ماڵئاواییدا خۆیان دەردەخەن، ڕاستگۆ و میهرەبان نین. ئەوان ناتوانن خەمی ئەو جیابوونەوەیە لە سیما و چاوەکانیاندا بشارنەوە، کە ساتەوەختی ماڵئاوایی بەسەر ئەوانیدا دەسەپێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا دەبوو ئەوان زۆر بەئاسانی بەسەر ئەو بارەدا زاڵ بوونایە و برینی جیابوونەوە و دوورکەوتنەوە ئەوەندە لەلایان قووڵ نەبایە، چونکە ئەوان ئەو میللەتەن کە هەر لەسەدەی نۆزدەهەمەوە خودا و مێژوو هەڵیانبژاردوون تاکو ئەزموونی جیابوونەوە و ماڵئاوایی و دوورکەوتنەوە تەی بکەن.. کەم ژنی کورد هەیە ڕۆژگارێ بۆ مێردەکەی، کەم دایکی کورد هەیە ڕۆژگارێ بۆ کوڕ و ڕۆژگارێکی دیکە بۆ کچەکەی، کەم خوشك هەیە ڕۆژگارێ بۆ کۆچی برا و بەشوودانی خوشکەکەی فرمێسکی جودایی و ماڵئاواییکردنیان نەڕشتبێ.. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان میللەتێکن جودابوونەوە و ماڵئاواییان خۆشناوێ و لەگەڵیدا ڕانایەن، مەخابن ئەمەش لە خۆنەویستی ئەوانەوەیە. خۆنەویستی کە پێچەوانەی خۆپەرستییە

لەلای کوردەکان ئەوەندە بەهێزە، کە ڕۆژگـارێ ئـەوانی وا لێکردبـوو تەنانـەت بـە مردنی مەڕ و بزنە لاتەکانیشیان غەم بخۆن و فرمێسك بۆماڵئاواییکردنیان بڕێژن.

ماڵئاواییکردن لـە زۆرینەی کەلتوورەکاندا ئاستێکی ڕەمزیانەی بەخۆیەوە گرتووە، بـۆ نمونە لـەلای ڕۆمییە کۆنەکان هەرکەسێ دەمـرد، یـان کۆچـیدەکرد، ماسـکێکیان لـە ڕووخساری هەڵدەگرتەوە. ئەوان جەژنێکیان هەبووە کە تیایـدا زینـدووەکان بـەهۆی بەدەسـتەوە گرتنـی ماسـکی ڕووخسـاری مردووەکانیـان، ئـازاری ئـەو فیراقـەیان کەمدەکردەوە، کە کۆچکردووەکان لە دڵیاندا دروستیان دەکرد. ئـەوان بـەمکارەیان هـەم سـەبووریيان بـە دڵـی خۆیـان دەدا و هـەم مـردوو و کۆچکردووەکانیشـایان بەشێوەیەکی ڕەمزییانە لـەناو خۆیاندا ئامادە دەکردنەوە. لە نەریتی ئەڤینی ڕۆمانسیانە و تەنانەت عەشقی عاریفانەدا، هەڵگرتنی (یادگار) و (نیشانە)ی ئەو کەسـەی ماڵئـاوایی لێکردووین، شتێکی زۆر باوە و ئـەو نیشـانە و یادگارانـە زۆرجـار وەك شـتی پـیرۆز تەماشایاندەکرێ. جارێك لـە شاعیرێکم بیست کە پازدەساڵ بنێشتی زاری ئەو کچەی لە گیرفانی سەردڵیدا هەڵگرتووە، کە ناچـار بـووە بـۆ دواجـار ماڵئـاوایی لێبکـات، ئەگەرچی کاتێ کە ئەو ئەم قسەیەی بۆ مـن کـرد، شەسـت سـاڵ زیـاتر بەسـەر ئـەو ماڵئاواییکردنەدا تێپەڕ ببوو.. بەمجۆرەش ڕەمزەکانی ماڵئاواییکردن لە بنەمادا نیشـانەی خۆنەویستی مرۆڤ دەردەخەن، ئەمەش بەوەی کە هەمیشە ئامادەیی تێدایە نیشـانەیەك و یادگارێ لـە (ئـەویتر) لـەدنیای خۆیـدا گـل بداتـەوە، تەنانـەت ئەوکاتانـەی سـوور دەشزانێت ئەویتر چیدی لە دنیادا نەماوە.. لە نەریتی میوانداریی کۆنی کوردیدا وا باو بووە، دیاریی چوون و یادگاریی ماڵئاوایی لە خانەخوێ، لـەیەکدی جوودا بن: دیاریی چوون زۆرجار گشتی و غەیرە شەخسییە و بـۆی هەیـە زەخـیرە و شـتێ بووبـێ کـە هەمووان سوودی لێوەربگرن، کەچی یادگاریی ماڵئاوایی بـەزۆری شـتێکی ڕەمـزی و شەخسییە، بۆ نمونە سابوونی ڕەقی، شانە، تەوقە، تەزبیح و خەنجەر و هتد..

ماڵئاوایی بەشـێوەیەکی گشـتی سـەخت و دژوار و درەنـگ قـەبووڵکراوە. زەحمەتـە بەئاسانی بتوانین ماڵئاوایی لەو شت و کەسانە بکەین، کە ماوەیەك لـەگەڵمانـدا بـوون

و ئولفەتمان بەیەکترەوە گرتبوون. ڕەنگە هۆکاری هەرە سەرەکی ئەم بارودۆخەش پەیوەست بێت بە تێگەیشتنی مرۆڤ لە مردن و نەمانەوە. چونکە لە دواجاردا هەموو ماڵئاواییکردنێ، سەرەتایە بۆ نەدیتنەوەی هەمیشەیی یەکتر و نەمانی کەسەکان لە ژیانی یەکتردا، کە ئەمەش هیچ ناگەیەنێ لە نزیکبوونەوەی دەسەڵاتی مەرگ زیاتر، کە دوایین ماڵئاواییە سەختەکانە.

**باینجانی ماڵئاوایی:**

مەرج نییە خواردنی ماڵئاوایی، ئەو خواردنەی بەبۆنەی ماڵئاواییەوە دەخورێ، وەك بارودۆخی ماڵئاواییکردنەکە بێت. ئەگەر ماڵئاواییکردن بارودۆخێکی دەروونیی بڕێ سەخت و گووشارهێنەر بێت، مەرج نییە تامی خواردنی ماڵئاوایی سوێریی ئەو فرمێسکانە بێت کە لەو بارودۆخەدا بۆ یەکتریان دەڕێژین.. ئەگەر ماڵئاواییکردن ساتەوەختێکی ڕەش و تاریك بێت لە وێستگەکانی ژیانی هەندێکماندا، مەرج نییە ئەو خواردنەی بەبۆنەی ماڵئاواییکردنەوە ئامادەی دەکەین، ڕەشپۆش و تاڵ بێت.. بەڵام بۆچی نا؟ من بیرمکردەوە: ئێمەی کورد ساڵەهایە بەدەست باینجانەوە گیرمانخواردووە و جارێ گلەیی ئەوەی لێدەکەین تاڵە و جارێکی دیکە سەرزەنشتی دەکەین کە ڕۆنێکی زۆر هەڵدەمژێ و جارەکانی دیکە لە ڕۆنی تەبسیدا نغرۆی دەکەین و زۆربەشمان نایخۆین..

جا ئێستا دەمەوێ بەرلەوەی هەندێ قسەی دیکەت بۆ بکەم و بەتەواوی ماڵئاواییت لێبکەم، حەزدەکەم بیرۆکەیەکت لەسەر باینجان بدەمێ، کە لەخۆییم وەرگرتووە! لەڕاستیدا ڕۆژێك باینجان هاتە لام و زۆر بە دڵگەرمییەوە هەندێ سکاڵای لەلا کردم. ئەو دەیگوت:

- ئەوەتەی هەین ئەم کوردانە لە تەپسی و دۆڵمە زیاتر ئێمەی باینجان بۆ هیچیتر بەکار ناهێنن و هەمیشەشە گلەیی و گازندانمان لێدەکەن کە بۆچی ئەوەندە ڕۆن هەڵدەمژین؟

- گوتم، یەکجار بەوجۆرەش نییە، ئێستا لەفەی باینجانیش هەیە.. بەڵام ئەویش زۆر چەورە.
- پێم ڕادەبوێری؟!

خێرا کەتمە خۆم و دڵنەواییمکرد: تۆ ڕاستدەکەیت، بەڵام تۆ ئەوەندەش دڵگران مەبە، مەسەلەکە ئەوەیە کە کوردەکان زۆر حەزیان لە دۆڵمە و یاپراخە.. پاشان بۆ ئەوەی خەفەتەکانی بیر بەرمەوە لێم پرسی:

– باینجان گیان، ئەگەر تۆ بتەوێ بە خۆشترین شێواز لێبنرێ و ئەوەندەش ڕۆن هەڵنەمژی، کامەیانە..

هەر کە ئەمەی بیست یەکسەر گەشایەوە، لەسەر تەختەداری وردکردنەکە ڕاکشا و داوای لێکردم کڵاوە سەوزەکەی سەری لێبکەمەوە، پاشان خۆی تەختکرد و گوتی: (دە ئەمجا لەدرێژی بمکە بە دوو لەتەوە و ناوەکەم هەڵقرۆنجە بەجۆرێ کە هەر لەتەم لەبەلەمێ بچێ.. بەڵام وریابە کونم نەکەیت).. دوای ئەوەی دوولەتمکرد و ناوەکەیم هەڵقرۆنجا، لەتێکیان گوتی: (لەولاوە دامان بنێ و بە فڵچەیەکی ڕۆناوی لەڕووی ناوەوە چەورمان بکە).. ناوەکەشی هەڵیدایە: (مادام ناوی ڕۆن هات، تکایە منیش ورد ورد بکە و لەگەڵ کەمێ نەعنا، شوویتی جنراو، پاشماوەی برنج و زەردێنە هێلکەیەك تۆزێ لەناو تاوەکەدا بەهەڵمی خۆمان بمانپیشێنە و خوێ و داوودەرمانی پێویستمان بکە بەسەردا). لەتەکەی دیکەش گوتی: (بە هەمان شێوە ئێمەش لەناو قابلەمەیەکدا کەمێ بپیشێنە و بمانهێنەرەوە دەرێ و لەسەر تەختەدارەکە دامان بنێرەوە).

گوتم: باشە دوایئەوە چیتان لێبکەم؟ ناوی باینجانەکە، کە ئیدی لەگەڵ زەردێنەهێلکە و شویت و نەعناکە تێکەڵ ببوو، هاواری کرد: (ئێمە بکەرە بەلەمێکیانەوە و بەلەمەکەی دیکەش پڕکە لە پەنیر..).. لەتە باینجانەکەی بڕیاربوو پەنیری تێبکەم، هەڵیدایە: (تکایە با پەنیرە چوارگۆشەییە زەردەکان بێت.)..

وەکئەوەی گوتیان، بەلەمێکیانم پڕ کرد لە تێکەڵە کەمێ سوور کراوەکە و بەلەمە باینجانییەکەی دیکەیشم پڕ کرد لە پەنیری زەردی چوارگۆشەیی.. پاشان هەردووکیان لە یەك کاتدا گوتیان: (دەئێستا بمانخەرەوە سەر یەك و دەزوویەکمان تێوەئاڵێنە با هەڵنەوەشێین). گوتم ئەمەیان بۆچی؟ ئەمجارەیان کە لەتە باینجانەکان یەکیان گرتبۆوە، بەدەنگێکی گڕتر گوتیان: (ئەمە پەیوەندیی هەیە بە چیرۆکێکی چینییەوە..)

گوتم پێشئەوەی بتانخۆم، ئەو چیرۆکەم بۆ بگێڕنەوە و ئەوانیش گوتیان: کەواتە سەرەتا چیرۆکەکەت بۆ دەگێڕینەوە و پاشان دوات لێدەکەین چیمان لێبکەیت پێشئەوەی بمانخۆیت. گوتم باشە.. ئیتر دەستیان بە گێڕانەوە کرد:

{چەندین ساڵ بەر لە ئێستا، گەڕیدەیەکی ڕێبوار ڕێی دەکەوێتە وڵاتێکی زۆر دوور و لەوێ دەبێتە میوانی پادشای وڵات تا ئەو زمانەی فێرکات، کە زمانی گەڕیدەکەیە.. وەلێ ڕێبواری گەڕیدە مەرجێکی دەبێ:

– (هەر کات فێری زمانی من بویت، من لێرە دەڕۆم و ماڵئاواییت لێدەکەم، چونکو بە مانەوەم هەردووکمان زمانی خۆمانمان بیر دەچێتەوە و دیسانەوە من و تۆ لێکدی حاڵی نابینەوە!).

پادشا داوای ڕوونکردنەوەی لێکرد. گەڕیدەی ڕێبوار گوتی:

(گەورە و پایەدارم، ئەو دەمەی من زمانی خۆم فێری تۆ دەکەم، زمانی تۆ فێر دەبم و هی خۆمم بیر دەچێتەوە، تۆش بەهەمان شێوە: لەگەڵ ئەوەی فێری زمانی من دەبیت، زمانی خۆتت بیر دەچێتەوە).

پادشا گوتی: (ئێ..، پاشان؟). ڕێبوارەکە وەرامی دایەوە:

(ئەوکاتە هەریەکەمان زمانێکی نوێ فێربووین، کە ئەویترمان نایزانێ..!).

پادشا، کە ئەو دەم لە ناوەندی تەمەنیدا بوو، دەیزانی بەئاسانی فێری زمانی میوانەکەی نابێت و ئەمەش ڕێبوارەکە ناچار دەکات ماوەیەکی زۆر لە کۆشکی شادا بمێنێتەوە، بە ڕاددەیەك کە هەموو خزمەتکار و مەیتەرەوان و سەردەستەی پاسەوانانیش هۆگری

دەبن و تەنانەت پادشا هیچ شەوێ خەوی لێناکەوێ ئەگەر کابرای ڕێبوار چیرۆکێکی لەسەر وڵاتی خۆی بۆ نەگێڕێتەوە.. حەکایەتخوان لەمکاتەدا بەگوێیدا چرپاندم: (مانەوەی زۆری کابرای گەڕیدە، ساتی ماڵئاوایی قووڕستر دەکا). بەمجۆرەش کاتێ پادشا بەتەواوی فێری زمانی ڕێبوارەکە دەبێ، لەپڕ هەستدەکات لە ساتی ماڵئاواییکردن لە میوانەکەی نزیکدەبێتەوە.. بۆیە پادشا لەپڕ کە دەزانێ کار لەکار ترازاوە، پەست و غەمبار دەبێ و دەنێرێ شاعیر و داستانبێژان خڕکەنەوە تاکو ئەو ساتەوەختە تراژیدیەی پادشا تێیکەوتووە، بیکەنە شیعر و غەزەل و نەغمە.. میوانی گەڕیدە کە پادشای بەم حاڵەوە دەبینێ، زۆری لەبەر گران دەبێ هەر ئاوا ماڵئاوایی بکات. سێ شەوان دەچێتە خەڵوەتی تێفکرینەوە، لە سپیدەی شەوی سێهەمدا باینجان دێتە خەوی:

- ئەگەر دەوهەوێ خۆت و شات، هیچ زمانانتان بیرنەچنەوە، شەقم کە و هەرتکیان باوێرە ناوم و شەتەکم دە و بمخۆن..
- ئەوجا ماڵئاواییش بکەم چ نابێ؟!
- غەمت نەبێ..

میوانە بۆ ئەوەی زمانی خۆی و زمانی پادشای بیر نەچێتەوە، داوا دەکات لە سەرتەباخی تاکو باینجانەڕەشی بۆ بکاتە خواردن.. دوو زمانانی دەنێو دەنێ و دەگەڵ شای دەیانخۆن و ئەوجا ماڵئاوایی لەیەکتر دەکەن، بەبێ ئەوەی چتاقیان زمانی خۆی و ئەویدی بدۆڕێنێ..} ..

**دەزانی چی؟!:**

من دەمەوێ ماڵئاوایی لەتۆ بکەم، لە تۆ کە دەزانم بەردەوام گوێت لە حەکایەتەکانی فەنتازیای خواردن گرت. ئێستا ساتی ماڵئاواییەو دەمەوێ دان بەوەدا بنێم، کاتێکی زۆر خۆشم لە ماڵی دڵەکەی تۆدا بەسەر برد.. زۆرینەی ئەو شتانەی لەسەر خواردن دەمزانین و دەمکردنە بەهانە بۆ گێڕانەوەی حەکایەتی دیکە، بەتۆم گوتوون و چیدی

بۆخۆم لەبیرم نەماون.. من خەریکە ئەوەی دەمزانی لەبیرم دەچێتەوە و تۆش چیدی ناتوانی وەکو جاران خواردن و خۆراکەکان بە شتێکی ئاسایی وەربگری.. تازە خواردنەکانت بارگاوی بوون بە فەنتازیا و فەنتازیاش ئەو هێزەیە کە شتەکان دەگۆڕێ. کەواتە تۆش ئەوەی جاران بە سرووشتی و ئاسایی وەرتدەگرت، ئێستا بەجۆرێکی دیکە تەماشای دەکەیت.. بۆئەوەی هیچمان شتی خۆمان بیرنەچێتەوە، پێویستە پێکەوە باینجانیماڵئاوایی بخۆین. دوایئەوەی پێکەوە شەتەکماندان، بیانخەینە تاوە سەرقاپدارەکەوە و لەناو پیاز و تەماتەیەکی وردجنراودا، ئاگرێکی کزیان بۆ هەڵکەین.. هەتا دەبینی پەنیرەکە دەتوێتەوە و دەچۆڕێتە ناو تەماتەو پیازەکەوە، ئاگرەکە مەکوژێنەوە. پێویستە کە دەرتهێنان بە هەڵمی خۆیان پیشابن و واچاکە باش ساردیان بکەیتەوە ئەمجا مەیلیان بکەیت. بزانە کە دەتوانیت بە پارچەیەك سەموونەوە، بیخۆیت. دەشتوانیت لەگەڵ هەر خواردنێکی دیکەدا دایانبنێیت و نۆشی گیانیان بکەیت..

** ** **

دەزانم ماڵئاوایی سەختە، دەزانم لە ماڵئاواییدا پتر لەهەر کاتێ گومان دەکەین لەوەی: ئایا ماڵی ڕاستەقینەی ئێمە لە کوێیە؟ ئایا مرۆڤ کاتێ لە شوێنێکەوە دەچێ بۆ شوێنێکی دیکە، بۆ ئەوەندە بەلایەوە سەختە ماڵی یەکەم جێبهێڵێ و لە ماڵی دووەمدا بە درەنگ ئۆقرە دەگرێ؟.. من کە هاتم بۆ ماڵەکەی تۆ، وامدەزانی ماوەیەکی کەم لەلات دەبم و زۆر بەئاسایی بەجێتدەهێڵم... کەچی هیچ وا دەرنەچوو. فەنتازیای دروستکردنی ماڵێك لەگەڵ تۆ درێژەی کێشا..، ویستم پێت بڵێم: بەهۆی فەنتازیاوە دەتوانین ئاساییترین شتەکان و پەیوەندییەکان بگۆڕین و تازەیان بکەینەوە.. تۆش ئەمەت بەلاوە سەیر بوو، بەڵام سەفەرت پێخۆشتر بوو لە خەوتن و چەقبەستن. نەتهێشت منیش تەمبەڵیی بکەم.. بەتایبەتی لەو ڕۆژەوە کە لە سۆپێر مارکێتەکە، بە سکی پڕەوە یەخەت گرتم و گوتت: (تووخوا، بەردەوامبە لە گێڕانەوەی فەنتازیای خواردن تاکو منداڵەکەم دەبێ..). بەردەوام بووم و کەچی جارێ بەشەرمەوە لە

تەقتەقەوە و جارێکی دیکە لە ڕانییەوە جارەکانی دیکە لە سۆران و چەند جارێکیش لە کەنەدا و سوید و هۆلاندەوە، تەلەفۆنت بۆکردم و دەتپرسی: (ئایا حەکایەتی مێخەکت لە کوێوە هێناوە؟)، (پەتاتەم لە جاران خۆشتر دەویٚ..)، (ئایا تەماتەی عەشق، خوێی تێدەکریٚ؟).. لە یازدەی شەودا مەسیجێکت بۆ نووسیم و گوتت: (نەمدەزانی ئەسکەندەری مەکدۆنی ئەوەندە بە دایکی سەرسام بووە،)، (کاتیٚ گەیشتمە کۆتایی خواردنی دایکانە، گریام..). جارێك لە پارکی شار بەشەرمەوە هاتیت و گوتت: (لەگەڵ خوشکەکەم بەردەوام خواردنەکانی تۆ لێدەنێین، من بۆیدەخوێنمەوە و ئەو دروستیان دەکات).. (هەلۆ.. برادەرێکم هەر ئێستەکانیٚ تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی: کە پێتبڵێم لەم جەهەندەمەدا، لەگەڵ ژن شەرابم خواردۆتەوە..).. دەنگیٚ لە مەهابادەوە دەیگوت: (کۆتایی پێمەهێنە، من بەرگەی ماڵئاوایی ناگرم..)..

بەمدیوی تردا، لەسەر شەقامان یەخەت پێگرتم و گوتت: بە خواردنەکانی تۆ نەخۆشکەوتم.. ئەوە سیٚ ڕۆژە زگم دێشیٚ.. گوتم: دیارە باشت نەکولاندوون، گوتت: نەء، ڕەفزم وەرگرت.. گوتم لەوانەیە لەکاتی پیاز جنینەکەدا گریابیت.. جارێکی دیکە بینیم دەم و زمانی خۆت سووتاندووە، پێمگوتی: تۆ عاشقێکی ڕاستەقینەیت. گوتت: نەء، تۆ نووسەرێکی فاشیلیت.. قۆخ و سەوزە و تەماتەت لە خەڵك گران کرد.. وەرزشکارێك پێیگوتم: من و هاوڕێکانم بە (خواردنی هاوڕێکان)ی جەنابت نێوانمان تێکچوو.. مرووریٚ گرتمی و بەهەڕەشەوە، کاتیٚ نیوەی ملی خۆی لە جامی سەیارەکەمەوە هێنابووە ژوورەوە، گوتی: بچیتە ئاسمانیش ئەو ئیجازەیەت هەر لێدەسەنم.. جارێکیتر دۆعامان بۆ نەکەیت با ئەوەندەی تریش بە قووڕماندا نەبەنە خوارەوە! ڕۆژیٚ زۆرم برسیی بوو، خۆمکرد بە چێشتخانەیەکدا و هەر لە دەرگاکەوە گوتیان خواردنمان نەماوە! ڕۆژێکی دیکە لە کەبابخانەیەك بە تانەوە گوتیان: مامۆستا، کەباب چ جۆرە خواردنێکە؟ قەسسابیٚ لەولاوە هەڵیدایە: ئەوەی قسە بە سەرووپیٚ بڵیٚ، بەم چەقۆیە لەتوپەتی دەکەم.. لە ولاتی چین شکاتیان لێکردووم لەبەر ئەوەی

من لە زنجیرەی (خواردنی پەنابەران)دا نوسیومە: سپایگێتی و ماکەرۆنی خواردنی ئیتالین، لەکاتێکدا چینییەکان دەڵێن، کاتێ ئێمە سپایگێتیمان خواردووە لە ئیتالیا هێشتا مریشك نەبوو تا هێلکان بکا..

بەڕاستی نەمدەویست ماڵئاوایی بکەم، بەڵام چارم نییە.. تازە هیچ مەتعەمێك نانم ناداتێ، نابیناکان گوتبوویان لەهەر شوێنێ بیبینین بە گۆچان هەلاهەلای دەکەین.. عاشقەکان گوتبوویان ئەوەندەمان (تەماتەی خۆشەویستی) لێنا، هەموومان لەخوێنی خۆماندا گەوزاین و یار نەهات،. چەندین نامەم لەلایەن دایکان و باوکانەوە بۆ هاتووە لەسەر ئەوەی بۆچی نووسیومە: لێگەڕێن منداڵ بەوجۆرەی کە دەیەوێ نانەکەی بخوات.. ئەو ڕۆژە لە پاسێکدا، دایکێ پێشدابەزین، لەناو دەرگاکەدا ئاوڕێکی لێدامەوە و گوتی: ئەگەر منداڵەکانم وەك تۆ دەفەرمووی: بەوجۆرەی بیانەوێ نان بخۆن، دەبێ ڕۆژی سێجار بیانگۆڕم، جەنابت جلەکانیان بۆ دەشۆی؟ بەڕاستی ئەو ژنە چاوی ئاگری لێدەباری.. خاوەن سۆپەرمارکێتێ پێیگوتم دەمدات بە دادگا لەسەر ئەوەی نووسیومە: مایۆنیز ژەهری زەڵاتەیە، ئەو لەکاتێکدا تووڕە ببوو، ئاماژەی بۆ هەزاران شووشە مایۆنیز دەکرد کە لە سووپەرمارکێتەکەیدا مابوونەوە.. ویستم بەجێی بهێڵم و ماڵئاوایی لێبکەم، کەچی پەلاماری شووشە مایۆنیزەکانی دان و کەوتە شوێنم.. هەڵاتم و لەدەرەوە حەشاماتێ لە جگەرەکێش بەری ڕێیان پێگرتم و گوتیان: ئەمە داوای کردووە چیدی لە چێشتخانەکاندا جگەرە نەکێشرێ.. لەداخان هەر یەکە و جگەرەیەکیان داگیرساند و دووکەڵەکەیان بەگژدا کردم.. گێژ بووم،.. پێشمەرگەیەکی کۆن بەزەیی پێمدا هاتەوە، هەڵیگرتمەوە و بردمییە ناو تەکسییەکەیەوە، لە دەستەسڕێکدا لەتێ نانی ڕەقی دەرهێناو گوتی: ئاخر توو دین و ئیمانت ئەمە ئەوە دەهێنێ ئەو هەموو سەڵاواتەی لەدیار بدەیت؟! ئیتر پێکەوە کەوتینە خرماندنی و کە ماڵئاواییم لێکرد، گوتی: من نانەڕەق دەخۆم، کەواتە هەم..!!

بەلای سەوزە و میوە فرۆشەکاندا ڕۆیشتم.. تەماتەی سەر عەرەبانەکان گشتیان ڕزی بوون، نەعنا لەداخی خۆی ڕەشهەڵگەڕابوو، پوونگە کۆچی کردبوو بۆ هەندەران..

مێخەك دەپاڕایەوە.. ڕەیحانەم دی لەباوەشی کچێکدا دەگریا.. ژنێ، کە لەولاوە گەلاّمێوی دەکڕی، پێیگوتم: ئەرێ تەریق نابیتەوە؟؟.. کابرای قۆخفرۆش بەخۆی و عەرەبانە و قۆخەکانییەوە دۆشدامابوو، کەس قۆخی نەدەکڕی.. بەتیلەی چاو تەماشای کردم و لەبەر خۆیەوە گوتی: (برادەر، تۆش بێتامت کرد..)

گەڕامەوە ماڵی هاوڕێکەم، نامەیەکم لە ئەستەمبووڵەوە بۆ هاتبوو، بازرگانە ئیتالییەکە بۆی نووسیبووم: (کچەی تورکئەسمەر لێم جیابۆوە و شوویکرد بە پاشا.. بەم ناوەدا بێیت دەتکوژم!).. هەر ژن بوون لە مێردەکانیان جیا دەبوونەوە لەسەر ئەوەی نازانن خواردنێ لێبنێن.. هەر مێردبوون ناوی خۆیان لە کۆرسی چێشتلێناندا دەنووسیی.. سوێندیان دەخوارد ئەوەی من لەتوپەتکات، جیهادە.. ئەوان لە دژی فەنتازیا لەشکرێکیان بۆ جیهاد پێکەوە نابوو.. تیایاندا هەبوون، لەداخی ئەوەی نووسیومە: (لە خواردندا چەوری کەمبکرێتەوە)، بتڵێ ڕۆنی دەنا بەسەرییەوە و یەکبین، دەیخواردەوە! هەیان بوو گیرفانەکانی پڕپڕکردبوون لە گۆشت و بەکاڵی دەیخوارد. زۆربەیان سەلکێ کاهوو و کەلەمیان گرتبوو بەدەستیانەوە و کە منیان دەبینی، بەهەموو هێزیان دەیانکێشان بە زەویدا.. تیایاندابوو میزی دەکردە ناو قاپی زەلاّتەوە.. زۆرینەی ژنانی ولاّت بەسوار تیمساحێکەوە و مارێك لەسەر شان بەدوامدا دەگەڕان.. من ئیتر تێگەیشتم لەم ولاّتەدا شوێنێکم بۆ نەمایەوە. لەمشارەوە بۆ ئەو شار، لەم ماڵ و گەڕەکەوە بۆ ئەویتر و ئەوانیتر.. لەسەر هەر سووچێ قەلێکم دەدی و دەیگاراند: خۆت ونکە وا هاتن بۆت.. لەهەر کۆلاّنێکدا کۆترێکم بەسەر دارتێلێکەوە دەدی و دەیگماند: بڕۆ واهاتن بۆت.. کەڵەشێرەکان هەرکاتێ دەیانزانی مەترسیم لەسەرە، دەیانقووقاند.. مەڕەکان بۆ زستانەکانی ئاوارەییم خورییان نارد.. بزنەکان لە سمی خۆیان پێلاّویان بۆ بەکردن دام.. گایەك شاخەکانی خۆی بۆ ناردم، مانگایەك شیر.. مراوییەك چەوریی ژێر باڵەکانی خۆی بۆ ناردم تا لە ئاودا تەڕ نەبم.. قازەکان پەڕی قاچی خۆیان بۆ پێچابوومەوە تاکو لەپەڕینەوەدا غەرق نەبم.. قەلەباچکە هاتەوە سەر ڕێم و قیڕاندی: بڕۆ.. با براکان و هاو زمانەکانت نەتکوژن.. من هەر دەمزانی تازە بە

پەنابەری دەمێنمەوە و تاراوگە شوێنمە.. هاورێیان مرۆڤ لەدەست وڵاتی خۆی پەنا بۆکوێ بەرێ؟ مرۆڤ لەشاری خۆیدا جێگەی نەبێتەوە، بۆ کامە شار سەرهەڵگرێ؟ بۆیە هاورێ، ناچارم دەبێ ماڵئاواییت لێبکەم، ناچارم ئێرە بەجێبهێڵم.. نیشتیمان شتێکە نییە، وڵات ئەوە نییە تیایدا دەژین، ئەوەیە لە خەیاڵی خۆماندا دروستیدەکەین.. من دەچمەوە بۆ نیشتیمانی خۆم، لەوێ خۆشترین خواردنەکان لێدەنێم، جوانترین حەکایەتەکان دەگێڕمەوە، لەمەودوا هیچ ناونیشانێکی نەگۆڕم نییە.. لە جیهانی فەنتازیادا هیچ شتێ بۆ هەمیشە لەشوێنی خۆی نامێنێ، فەنتازیا ڕاستەقینەترین ماڵی ئێمەیە..

# دەرگای هاتنەدەرەوە

**ساڵەها** لەمەوپێش، کابرایەك لەسەفەرێکی دوورودرێژ گەڕایەوە و لە شارێکی زۆرزۆر بەتەمەندا مەنزڵی گرت. تاق و تەنیا و بێکار.. بیریکردەوە لەم وڵاتەدا چیی بکات لە هەموو شتێ باشترە؟.. دواجار بڕیاریدا چێشتخانەیەك بکاتەوە.. ئەو لەو بڕوایەدا بوو تەنیا شتێ لە چاودێریی پاسەوانەکانی میری شار ڕزگاریبووە، ئەو پاروانەن کە خەڵکی لە دەمیانەوە قووتیان دەدەن و لە کۆمیانەوە دەریدەهاوێژنەوە دەرێ.. بەڵام وا دەرنەچوو، میر بەمەی زانی و هەناردی چێشتخانەکەی پێداخەن، مەتبەخەکەی بسووتێنن، قاپ و قاچاغەکانی وردوخاش کەن و ئاووکارەبای ماڵ و ناندێنەکەی ببڕن.. بەمجۆرەش کابرا، بێدەسەڵات و بێناندێن و بێ تەندوور و تەباخ مایەوە.. تەنیا کەسێ لەو شارەدا مۆڵەتی هەبوو، قەسسابێك بوو، بۆ هەر ژەمێ سەری کچێك و کوڕێکی دەبڕی، تیکە تیکەی دەکردن و وەك خێر بە ماڵاندا دەیبەشینەوە..

کابرای گەڕاوە دیسانەوە بیریی کردەوە: دەبێ شتێ بکات، دەبێ لەم ڕۆژگاری گۆشت و تکەیەدا، خواردنێ دروستکات بەبێ ئەوەی کەس ژیانی بکەوێتە مەترسییەوە.. چووە شارێکی دی، لەو شارەدا هەمووشتێ بریقە و باقی بوو، پڕ بوو لە باخچە و گوڵ، بەڵام نە گوڵەکانی بۆنیان دەهات و نە خواردنە چەورەکانی تام و چێژیان تێدا مابوو.. ئیتر ڕۆژێك چووە مەزادخانەی شار،

لەویّ تاوەیەکی سەرقاپدار و چەقۆیەکی بە چەند کتێبێکی نایابی لاسووتاو، گۆڕییەوە و هاتەوە لەو ماڵەی تێیدا دەژیا، دەستی بە نووسینی کتێبیّ کرد، بەناوی (فەنتازیای خواردن).. دەتوانیت بۆ ئاگاداریی زیاتر لە بەسەرهاتی ئەو پیاوە، ئەوەی چی بەسەر هات و چی دروستکرد، ئەم کتێبە بخوێنییتەوە.

من ئەم کتێبەم لەو مەزادخانەیە دۆزییەوە کە کابرا وەختی خۆی تاوە و چەقۆکەی لێکڕییوو. مەزادچییەکان دەیانگوت: دواجار کابرا ئیفلاسیی کردبوو، کەس خواردنەکانی لێنەدەکڕی و لەوشارەش جێگەی نەبۆوە.. بەلاّم پێشئەوەی بڕواتەوە بۆ شارە زۆرزۆر پیرەکە، کتێبەکانی بیر دەکەوێتەوە و دەچێت لە مەزادخانەکە داوایان دەکاتەوە.. کابرای تاوەفرۆش پێیدەڵێ: تازە تاوەکەت بۆنی خواردنی عاشقانەی گرتووە و نامەوێتەوە، بەلاّم ئەو دەستنووسەم بدەریّ و کتێبەکانت بەرەوە..

ئیتر بەو جۆرە دەستنووسەکە ئەمبەراوبەری زۆر دەکات، تاکو لەم دواییانەدا، کاتێ تیمەکانی قەلاّچۆکردنی باڵندان بە کوچەکانی شاردا دەگەڕێن، دەگەنە کوچەی مەزادخانەکە و لەوێدا بەردێ دەبینن لە دیوارێکدا لەقبووە، وادەزانن ئەوە مریشکێکی لەودیوەوەیە، کاتێ بەردەکە لا دەبەن، دەبینن سیپارەیەك لەویادا داندراوە و منیش کە ئەو ڕۆژە لەویّ بووم، بینیم سیپارەکەیان فڕێدایە سەر شۆستەکە، خێرا پەلامارمدا و هێنامەوە ماڵ.. ئەوەی لەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە هەمان ئەو شتانەن لە دەستنووسەکەدا نووسرا بوون، بەلاّم منیش کەمێ فەنتازیای خۆمم لە هەندێ شوێندا بۆ زیادکردووە..

## له بەرهەمەکانی دیکەی نووسەر:

### ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی هزری:

- **دیاردەگەرایی تاراوگە**، چاپی یەکەم: دەزگای باران، سوید 1995. چاپی دووەم: دەزگای ئاراس، هەولێر 2002
- **سۆفیستەکان**، چ1 ستۆکهۆڵم 1998، چ2 دەزگای سەردەم، سلێمانی 1999
- **دنیای شتەبچووکەکان**، دەزگای سەردەم، سلێمانی 1999، چاپی دووەم، ڕەنج 2005
- **کتێبی نالی**، دەزگای موکریانی، هەولێر 2001
- **نەتەوە و حەکایەت**، بەرگی یەکەم، دەزگای سپیرێز، دهۆک 2002
- **قەفەسی ئاسنین**، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی 2003
- **مێژووی هزری کۆمەڵایەتی**، زنجیرەی هزر و کۆمەڵ 2، هەولێر 2003
- **هاوکاتی و هاوشوناسی**، دەزگای سپیرێز، دهۆک 2004
- **لە پەیوەندییەوە بۆ خۆشەویستی**، دەزگای سپیرێز، دهۆک 2004، چاپی دووەم، کتێبخانەی سۆران، هەولێر 2004
- **نووسین و بەرپرسیاری** (لێکۆڵینەوە)، چاپی دووەم بە دەستکارییەوە، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی 2006

### بەرهەمی ئەدەبی:

- **گۆرانییەك بۆ گوندە سووتاوەکان** (شیعر)، کۆپنهاگن 1989
- **کۆپنهاگن!** (شیعر)، کانونفرهنگ ایران، دانمارك 1994
- **زمانی عەشق، زەمەنی ئەنفال** (شیعری) چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی 2000
- **من و مارەکان** (چیرۆك) مەڵبەندی لاوانی میدیا، سلێمانی 1999

### گفتوگۆ:

- **مرۆڤ وەك بەخشندە**، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی 2006

**وەرگێڕان:**

- **ئەفسانەی خۆشەویستی** (سەمەد بیهرەنگی) ئەفسانەچیرۆك، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی 1983

- **دەنگی پێی ئاو** (سهراب سپهری) چ1، 1989، چ2 کۆپنهاگن 1990

- **در امدی بر شعر معاصر کُردی**، (شیعری هاوچەرخی کوردی بە فارسی)، کۆپنهاگن، 1990

– **پیدرۆپارامۆ** (ڕۆمان)، خوان ڕۆلفۆ (بەهاوکاری ئازاد بەرزنجی) دەزگای سەردەم، سلێمانی 1999

- **دەروازەکانی کۆمەڵناسی** (منوچهر محسنی)، بەهاوکاری کۆمەڵێ وەرگێڕ، دەزگای موکریانی، هەولێر 2002

– **ئەلبوومی کیژی جنۆکان** (چیرۆکی منداڵان لە دانمارکییەوە)، دەزگای سەردەم، سلێمانی .2002

– **خۆبەکۆیلەکردن** (ئەتین دۆلابۆتی) بە هاوکاری لەگەڵ مراد حەکیم. دەزگای موکریانی، هەولێر2005.

- **ژیان کورتە** (ڕۆمان)، یۆستین گۆردەر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر 2005